محەمەد کەریم نانەوا



# کیژ گەلی ئەشکەوتی دێوان

نۆڤلێت

هەولێر - ٢٠١١

# کیژگەلی ئەشکەوتی دێوان

## نۆڤلێت

نووسینی

محەمەد کەریم نانەوا

چاپی یەکەم

هەولێر - ٢٠١١



**وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان**
**بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی وچاپ وبڵاوکردنەوە**
**بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر**

ناوی کتێب: گیژگەلی ئەشکەوتی دێوان
بابەت: نۆڤلێت
نووسەر: محەمەد کەریم نانەوا
تایپ و نەخشەسازی: شیوەن محەمەد کەریم نانەوا
وێنەی بەرگ: دیارییە لەلایەن بەڕێز: مامۆستا (دارا محەمەد عەلی)
چاپی یەکەم - چاپخانەی رۆشنبیری - هەولێر/ ۲۰۱۱

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (۱۱۰۰) ساڵی(۲۰۱۱)ی پێدراوە

# (١)

ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان. بەرێرەو ڕێت بەم وڵاتە دا کەوت، لەبیرنەکەی.! ئەوە نیشتمانی (ئاری) یانە، ئای کە وڵاتێکی ڕەنگین و بەپیت و بەرەکەت و جوان و دڵگیرە لەبەر دڵان، سەیری ئەو پێدەشت و ئافاری کاکی بەکاکی، تەماشای دۆڵ و چەم و قەڵبەزو، بنوارە ڕەومەزە شاخی هەزار بەهەزارو دامێن و دۆندی چیا، هەتا چاو هەتەرە دەکات، دارستان و کێڵگەی دانەوێڵە و ڕەزو باغ، ڕووی زەوی داپۆشیوە، بەهەشتێکە قەت دڵت بەروەست نادات لێی جیا نابێتەوە. لە سوچێکی ئەم بەهەشتەدا، کەمێك بەدوور لەچیا. ڕێت بە گوندێك دەکەوێ .شەست، حەفتا، خانووی جزیری لە خشت دروستکراو دەبینی. ئەوە گوندی (زەردەشت ئاوا)ی پێدەڵێن. لە پەرگەی ئاوایی، بەلای خۆرئاوادا حەوشەو حەسارێکی گەورە و دیوار بڵند بەرچاو دەکەوێ. لەناوەوە چەند خانووەك بۆ ماڵە ڕەنجبەران و تەویلەی وڵاخان و سەکۆیەکی پان و بەرین بۆ شەوانی هاوین دروستکراوە. بۆ چوونەوە ژوورەوە، قەنتەرەیەکی گەورەو دەرگایەکی زلی بزمار ڕێژ ڕووەو ئاوایی دامەزراوە. ئەوە حەوشەوحەساری (زینەڵ ئاغا)یە، کەمێك بەولاتر خانووەکی دوونهۆمی لە شێوەی شارستانی بەسەر ئاواییدا دەڕوانێ. دەرەوەی بەگڵە سوور ماڵنج کراوە دیوی ژوورەوەی بەگەچ سپی کراوە .ئەوە ماڵی خانەوادەی زینەڵ ئاغایە. شان بەشانی ئەم خانووە، دیوەخانێکی درێژو بەرین و دوو دەرییە. دەرگایەکیان ڕوو لە جێ جۆخینانە و ڕێی کانی ژنانە، دەرگایەکی دیکەیان تایبەت بوو بۆ ناو ماڵی زینەڵ ئاغا. بەڕۆژ لەگوندی زەردەشت ئاوا، تەنها پیرەمێردو پیرەژنەکانی بەساڵاچوو، بۆهەندێ هوردە ئیشی ناو ماڵ و چاودێری

پەلەوەرو، میوانداری لە ماڵ دەمینێنەوە، ئەگینا ژن و پیاو پێکەوە، بەهەرەوەزی لە کێڵگەو شیناوەرزیدا کاردەکەن، بە پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگ و ئاڵاو واڵای جوانی ئافرەتان. تا بڵێی: قەشەنگ و دڵفرین و سەرنج ڕاکێش، چاو لە دیتنیان تێرنابێ لەگەڵ تاوکەوتنەوە، تاکو بەرەبەری خۆر ئاوابوون دەگەڵ سەدای ئاوازی بەجۆش و خرۆشی گۆرانی فۆلکلۆری خەریکی ئاودێری و چۆماڵن، ئەگەر لەکاتی پشووی نیوەڕۆیان، لە شوێنەکی بەرز سەیری دەم کانی و جۆگەی ئاوبکەی.! ئای کە دیمەنێکی جوان و دڵفڕین دەبینی. لەچەند شوێنان چڕە دووکەڵ بەئاسماندا هەڵدەچێ، بەحەسرەتەوە ئیشتهات دەچێتە نان و هێلکەی برژاو و تەڕە پیازو پەنیرو ژاژی و چای شیرین، خۆزیا دەتدیت.! کە هێواران دەست هەڵدەگرن، قەتارە دەبەستن، بەرەو مەنزڵ دەگەڕێنەوە، سروشت بەم هەموو جوانییەی خۆی، هێشتانەکێ بەخیلییان پێ دەبات. بەلام ئەوەی لەبەر دڵان گران و مایەی نیگەرانییە سەبارەت بەخەڵکی زەردەشت ئاوا. بەری ڕەنج و ماندووبوونی خۆیان، لە چوار بەش، بەشێکی دەچێتە گیرفانی زینەڵ ئاغا. ئەوە بێجگە لە سوغرەکاری وکارەگەری ناو ماڵی ئاغا و دیوەخانانە و سوورانەو، جوندان و هەڕەشەو گوڕەشەی دەرکردن. چمە، باوکێك لەتوانایدا هەبوو. بەبێ ئاگاداری و ڕەزامەندی ئاغا، کچی خۆی بداتە شوو، دەبووایە داخوازیکەر لە پێشدان دەم و لەوسی ئاغا چەور بکات، دواتر پرسەخەسووانە بەباوکی کچە بکات. لە هەمووی ناخۆشتر. بێجگە لە (چەکەخالانە و قاوەچییانە) سوورانەی ئاغا بوو، لەم گوندە هەموو شتێك، بە

پێی فەرمانی ئاغا بوو، لەلایەکی دیکەوە ژنان لەگەڵ ئەم هەموو ماندووبوون و ڕەنجکێشان و هیلاکیەیاندا، فەرامۆشکرابوون تەنها نان و زگ و هیچی تر، تەنها لە پێناو ڕازیکردنی پیاوان دابوون، بەم حاڵەشەوە بەهۆی شتێکی زۆر بچووك،

ئەگەر بەدڵیان نەبا، یان دڵیان گەرد بگرێ، ئەوە بە حوكمی نێرینەیی و پیاوسالاری سێ و دووی لێناكەن. سێ بەردەیان لە مستی دەنێن و تەواو، دەردی دڵیان بەوان هەڵدەڕێژن. هەروەكو بڵێی: خودای پەروەدگار كاتێ كە مێینەی خوڵقاند. تەنها بۆئەوەی خوڵقاند خزمەتی نێرینە بكات وحەزو ئارەزووی خۆی پێ دابمركێنێتەوە، بۆیە بە ئارەزووی خۆی دەیرەتێنێ.هەر سێ چوارێكیان دە قەبەڵ پیرە مێردێكی كەنەفت دەكەن. بێگومان ئەگەر بمگێنن.؟! یان خۆ بابدەن. نارەزایی دەربڕن.؟! بۆ ئەمەیان بە نووكی خەنجەر چارەی دەكەن، یان زۆر بێ بەختانە ناوو ناتۆرەیان بۆ هەڵدەبەستن، تاكو ئەو ڕۆژەی بە خاكیان دەسپێرن، ڕەزیل و سەفیل پێوەی دەتلێنەوە. بۆیە دەمێك بوو ژنان لە پەناپەسێوو بن دیواران، فسكە فسك و ترمەو بۆڵەیان بوو، دوودوو، سێ، سێ ، لە ڕێی كانی و ڕووبار یەكدی گردەبوون، گلەیی و گازاندە و نارەزاییان بە گوێی یەكدیدا دەچرپاند، دەنگی نارەزایی ژنان، ڕۆژ. لە دوای ڕۆژ. بەرامبەر بە كاروكردەوەی پیاوسالاری لە هرووژان دابوو، پیاوان دركیان بە نارەزایی ژنان كردبوو، بەلام نەفس بەرزی و حرسی پیاوەتی پیاوان، ڕێگای پێ نەدەدان ڕوو بەڕوویان بوەستن، گوێ لە داخوازیەكانیان ڕابگرن، بەپێچەوانەوە سەری زمان و بنی زمانیان. تەنها جوندان و تێهەڵدان و داپەڵۆسین بوو، ڕۆژ نەبوو سەری چەندانیان نەشكێنن، ماركوژیان نەكەن، لەگەڵ هەڕەشەی تەلاق دان و بێ بەری كردنیان لە ماڵ و منداڵیان.

## (٢)

حەمە بۆر، كابرایەكی چلكنی بەساڵاچوو بوو، پیاوی سێ (٣) ژنان بوو، كۆمەڵێك منداڵی سەركەوبنكەو، دوو بووك وچەند كورە زاو، (٤) كچی شووداری هەبووخاوەنی مێگەلی مەڕمزاوئەستەوێر بوو، پارەدارو پیسكە بوو، لە پیسكەییان ناوی (بۆرە)ی بەسەردا بڕابوو. بەڵام بەهۆی هەبوونی و دەست ڕۆیی و دۆستایەتی لەگەڵ زەینەڵ ئاغا، خەڵكی زەردەشت ئاواو گوندەكانی دەوروبەر، حیسابی پیاو ماقوڵیان بۆی دەكرد. زەلامی بۆرە دەمێك بوو، مجێزی لە (غوربەت)ی عەلی ئاو خۆرەوە خۆشكردبوو. غوربەت. چ غوربەت.؟! لەهەرەتی عازەبایەتی دابوو، لە جوانی و شۆخ و شەنگی ورەندی داهاوتای نەبوو. سەردەستەی كچانی زەردەشت ئاوا و كیژانی گوندەكانی ناوچەكە بوو. حەمەبۆر، دەمی ئاغای چەوركردبوو، سەریان لەبن سەری باوكی غوربەت نابوو، بەهەر شێوەیەكی هەبووعەلی ئاوخۆرەومیان قایل كرد بوو غوربەتیان بە دەزگیرانی بۆرەكردبوو، قەول و قەرار وابوو جۆخین لە گۆڕێ هەڵگیرێ ئاهەنگی زەماوەندی بۆبگێڕن. غوربەت لە خەمان ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، بە دۆژەندا چوو بوو، لە حەیبەتان دەبنێسا، دەستەخوشكانی غوربەت، لە پەرۆشیاندا سەری دنیاوبنی دنیایان لێ وێكهاتبۆوە. شۆخە ژنەكان ترسی ئەومیان بوو. دەیانزانی پاشەڕۆژیان لە دواڕۆژی ژنەكانی حەمەبۆر چاتر نابێت، هەرچی پیرەژنەكانیش بوون، سەركۆنەی دایكی غوربەتیان دەكردو تفوو نەفرەتیان لە زینەڵ ئاغاو عەلی ئاوخۆرەوە دەكرد، هەزار قسەی سووك و چرووك و ناشرینیان حەواڵەی حەمەبۆر دەكرد. ژنان بەگەماڵەبۆر، یان پیسكەی تەڕپیر ناویان دەبرد. غوربەت

هەموو ڕۆژێ لەگەڵ دەستەخوشکانی دەچوونە سەرکانی و دەم ڕووبار، خدووی بەوەگرتبوو لەسەر تاشەبەردێك ڕووەوهەوراز دادەنیشت، دەیڕوانییە دۆڵ و ڕەوەزو شاخی هەزاربە هەزارو بستۆی چیا، بەئەندێشەی خەیاڵدا ڕوو دەچوو، بیری لە ئاینده وپاشەڕۆژی خۆی دەکردەوە. لەناخەوە لەبەرەخۆی دەدوا.! (تەمەنی پیرە گەماڵێکی وەبەرماوە، خاوەنی سێ (٣) ژن و کۆمەڵێك جرو جامشت و .....). لە قاران ئاگر لەچاوانی دەباری، سیمای گرژدەبوو، لە توڕەیی یان لە قاقای پێکەنینی دەدا. بەدەنگێکی بڵند دەیگوت:- (خودا موبارەکی نەکات) دەستەخوشکەکانی بەم پێکەنینەی غوربەت سەراسیمە دەبوون، دیسان سێرەی نیگای دەبڕییەوە هەڵەمووت و کێوی سەخت و بەرز، هەرچەندی دەستە خوشکانی بە نەزیرۆکان بەبەری دا دەکەوتن، لێی دەپاڕانەوە دڵی بدەنەوە، نەخێر لەگەڵ کێتە، بەم نەزیرۆکانە سێبووری نەدەهات، تاکو ڕۆژێکیان ڕووی لە دەستە خوشکانی کردو پێی گوتن:

خوشکان، ئێمەی ئافرەت لەبەر شەرم وحەیای دنیا دەستمان بەڕووی خۆمان گرتووە، چاوی خۆمان بەرداوەتەوە، هەروەك بڵێی: چاو بەرە ژێری پیاوان بین، هەرئەوەشە پیاوان بەئارەزووی خۆیان دەمانڕەتێنن، سووکایەتیمان پێدەکەن،ئەگەر چاو بەردانەوە نەبێ.؟! من و ئەو گەمبۆرەیان نەگوتووە، تەمەنی پیرە مەرەێکی(کەترە)ی وەبەر نەماوە. عەیشان لێی چووە پێش، دەستی هاوێتە سەر شانی پێی گوت:

غوربەتگیان ئەوە هوڕێنەی چیدەکەی.؟! بەقوربان واز لەم هوڕێنانە بێنە، باگیانت ئاسوودە بێ، مرۆ چی لە چارەی دا نووسرابێ هەرئەوەیە.

نا عەیشان، هوڕێنان ناکەم، بیر لە حاڵی خۆم دەکەمەوە، بیر لە دواڕۆژی ئێوە دەکەمەوە. ئاخۆ چارەنوسمان بەدەستی پیاوسالاری بەچی دەگات.؟! عەیشان خۆ

چارەنووس شتێك نییە، تاکودەستکاری نەکرێت، هەنووکەنێمە دەشێ بەبڕیارێك ئەم چارەنووسە هەڵوشێنینەوە، چارەنووسی خۆمان بەدەست خۆمانەوە بێت.

— چۆن؟! تێت ناگەم.

– ئەگەر ئەنگۆ، هاوکارو پشتیوانم بن‌شەرت بێ کارێکی وابکەم لەهەموو دنیادا دەنگ بداتەوە.

— باشە غوربەت، گرێمان ئەوە هاوکاری و پشتگیریمان لێ کردی. ئاخر ئێمەی زەعیفە چیمان لەدەست دێ، تاکو بەرپەرچی پیاوانی پێ بدەینەوە.؟!

- ئەگەر بەڵێن و پەیمانم پێ بدەن.؟! بەیەکگرتوویی و قوربانی دان بەرپەرچیان دەدەینەوە.چونکی لەژیاندا شتێك لە ئارادانییە بەناوی مەحاڵ.

- غوربەت، تێناگەم. دەتەوێ چیبکەین.؟!

- عەیشان، سەیری ئەو شاخی هەزاربەهەزارو ئەو کێوە سەختانە بکە. دەیانکەینە پشت و پەنای خۆمان. لە گەماڵە بۆرەوە دەست پێدەکەین. ئەو گەماڵە بۆرەی شەوان وەکو کسۆك لە هەوێز بەدیار ڕانەوە وەردەکەوێ.

پاشان ددانی بەجیڕەوە برد گوتی:

(ئەگەر نەمردم.؟! بۆتۆنامرم پیرە کەمتیار. شەوم لێدادێ)

# (٣)

شەو درەنگ بوو، عەلی ئاوخۆرەی باوکی غوربەت، دەمێك بوو لەنۆبەتە نۆبەرداری ماڵی ئاغا هاتبۆوە، کرخەوی لێکەوتبو.پوورە(ئەستی)دایکی غوربەت، لەبەرئەوەی لە چێشتەنگاوەوە هەتاکو دوای عەسرانێکی درەنگ خەریکی (گێژکە)ی بن کووزربووسەر لە هێوارێوە لە جوولە کەتبوو. غوربەت،بە ئەسپایی جاجمەکەی لە سەرە خۆی وەلانا، هەستاوەشەرواڵی لە پێ کرد، هندامی خۆی رێکخستەوە،کارك و گۆریەو بەلەك پێچی لەژێر هەرزارە دەرێنا، کەوچکێك دۆنی لە( هێزە) دەرکرد، پوختەوجوان(کارك) کەکەی پێ چەور کرد، گۆرەوی لە پێ هەڵکێشا، بەلەك پێچی لەسەر بەستاو کارکی لە پێکرد، پاشان خەنجەری لە بەر پژدێنی ڕاکرد، دواتر ڕەختی فیشەکدانی ڕاست و چەپ لە شانی کرد، ئەوجا بەشێنەیی تفەنگی بن تەنکێشی باوکی ڕاکێشا، بەدەستیەوە گرت، ماوەیەکی کورت بە دیار سەری دایکییەوە ڕاوەستا، بەچاوی سۆزو میهرەبانیەوە تێی ڕاما، دایکی لە شیرنی خەودا بوو، پاشان هەناسەیەکی قووڵی بۆ هەڵکێشا.. ((ئای..چەند کلۆڵ و میهرەبانی). دواجار ئاورێکی لە باوکی داوە، منگەیەکی لێوەهات. پاشان زۆر بە ئەسپایی ولە سەرەخۆ دەرگاکەی کردەوە، کە پێیەکی لە کۆسپەی دەرگا ئاودیوکرد، ئاوڕی داوە. لە شیرنی خەودابوون، خەریکبوو سۆزی دایکایەتی وبێ دەسەڵاتی باوکایەتی بەسەریدا زاڵ بێت، بەڵام پشتی لە پاشکردو ڕۆیی.شەو درەنگەسێ بەتری شەو ڕاشکاوەدنیایەکی تاریك و کشومات، لەتاریکی شەوەزەنگدا، هەرچواریان یەکدی گر بوون، تەگبیروابوو.! غوربەت، پارێزلە حەمە بۆر بگرێ، حەمەبۆر، لە سەر کەپەنگ و لەسەرگازەرای پشتێ لێپاڵ

کەوتبوو.پرخە پرخی بوو. غوربەت پێکەنینی هات،بەلاّم پێنەکەنی، لە دڵەوە بەتەوسەوە سەردولکەی بۆ دەگوت. (ئەی ماڵی وێرانم،چاوی دایکت کوێر بێ،لاوی سێ (٣) ژنان و دەزگیرانەك، دەڵێی تەرمی مردووە ڕاکشاوە، لەوانەیە خەون بە زەماوەندی غوربەت وەببینی). دواتر زۆر بەغەزمەبەوە دەستی هاوێتە مشتووی خەنجەرو لە کالان هەڵیکێشا و چۆکی دادا سەر سینگی بۆرەو دادڕ دادڕو ساردی کردەوە. پاشان تفەنگی ژێرکەلەکەی دەرێناو خەریتەی فیشەکدانی بە دەستیەوە گرت، بە چوستی گەڕاوە بۆلای هاوڕێکانی گوتی:

(بەدۆزەخم سپارد). هەرسێکیان دەستخۆشیان لێکرد،هێشتانەکێ شەو وەبەریەوە مابوو، چوارکیژی قەیرەوخەنجەردارسێ تفەنگ و هەندێك پیتاك و توێشوی سەفەر، پشتیان دایە ئاوەدانی و بەرەو چارەنووسی نادیار، بەڕچەڕێدا ڕوویان کردە بستۆی چیاو دڕیان بەتاریکی دا، لە ئاوایی زەردەشت ئاوا بەدەرکەوتن.سەگ و گورگ لێکدی ناشکرا ببوون. لەدۆندی چیا گیرسانەوە، دوای پشودان، هەریەکەو لەتەنانێکیان کردە بابۆلەو بەرخورێنی و قاوەڵتی بەیانی. خۆر، لەپەناکێوی بەرزولوتکەی چیا. بەنازەوە گەردەنی زراڤی بۆیان هەڵدەکێشاوناوەناوە لە بن هەوران. سەرە دیقانێ و چاو برکێی لەگەڵیاندا دەکرد. غوربەت ، ڕابووە سەرپێیان و چاوی بەملاو و ئەولادا دەگێڕا، پاشان چەند هەنگاوێك بەرەو هەوراز هەڵکشا، لە بنار ڕەوەزە شاخێکی هەزار بە هەزار. ڕووەو نسار، ئەشکەوتێك زارکی لێك کردبۆوە. بانگی (نازێ)ی کرد. نازێ کورتە بالأیەکی تێکسمڕاوی چوار شانەی تووندوتۆڵ بووخەریتەو فیشەکدانی لەسەرکەمەری بەستابوو، خەنجەرێکی دەسك قەزوانی لەبەر ڕاکردبوو، تفەنگی بەدەستەوە بوو. دەتگوت! سەت ساڵە چەتەی چیاو چۆڵانە.هەستاوسەرپێ و ..

- ها غوربەت گیان،شتێك لەئارادایە.؟!

- ناهیچ نییە. وەرە باسەیرێکی ئەو (ئەشکەوت)ێهێ بکەین.

- باشە وا هاتم.

ئەشکەوتێکی گەورەو فراوان، شوێنەکەی سەخت و قایم بوو. بەدڵیان بوو خۆیان تیادا داڵدەبدەن. پاشان سەرکەوتنە سەر لووتکە. سەیریان کرد.! دوولای هەڵدێربوو، لای پێشەوەش ئەو ڕێیەبوو کە پێداهاتبوون. لایەکەی دیکەگەلییەکی دوورو درێژ و قووڵ بوو، بەدارستانێکی چڕوپڕ

داپۆشرابوو، ڕووبارێکی بە تەوژم دارستانەکەی کردبووە دووبڕ، لە دوورەوە توڵە ڕێیەکی باریك دەهاتەوە سەر ڕووبارەکە. غوربەت گوتی:

- نازێ، بێگومان ئەو توڵە ڕێیە، ڕێگەی کاروانچی و قاچاخچی و پیاو خراپ و دزوجەردەو ڕێگرانە. بەهەر حاڵ ئەگەر بێ ئاوی نەبێ ، ئاوەکەی دوورە دەستە، ئەگینا شوێنەکی چاکە، لاڕێیە، دڵنیام لێرە خۆمان قایم بکەین، زەفەرمان پێ نابەن. بەدەم گفتوگۆوە هاتنە پێش زارکی ئەشکەوت، بەملاوئەولادا، ئەو عەردو بانە گەڕان، بست بەبست دەرزی ئاژنیان کرد، لەبن گەوەرە شاخێك، قانە گیایەکی گەش و جوانیان بەدیکرد، خاکەکەی مەیلی تەڕایەتی پێوە دیار بوو، نازێ گوتی:-

- غوربەت، پێموابی ئەگەر شوێنی ئەم تەڕایەتییە هەڵکۆڵین، ئاومان چنگ دەکەوێ. بانگی پەیمان و عەیشانیان کرد.! پریاسکەکان لەگەڵ خۆتان بێنن. وەرن بۆ ئێرە،چەکی عەیشان، ماهوزەڕ بوو ، شەوی ڕابردوو بە ئەسپایی لە زڕبراکەی دزی بوو، زۆر ڕقی لەزڕبراکەی دەبۆوە، چونکی بەتەمابوو ژن بە ژنی پێبکات. بۆخۆی. ژن بەژن لەگەڵ کێ.؟ لەگەڵ کابرایەکی کەنەفت، بۆن گڕنی لێدەهات. بەڵام هەرچی (پەیمان) بوو. لەمێژ بوو باوکی بە پیلانی ئاغای گوند، بێ سەرو شوێن بوو، گومان لە (سالە کۆڕ)ی خوبزەی زینەڵ ئاغا بوو.سالەکۆڕ، سەرداری دووژنان بوو، بەزۆری زۆردارەکی بەپشتیوانی ئاغا، دایکی پەیمانی لەخۆی

مارەکردبوو، بە زاوا بەندی چووبۆوە سەر ماڵ، سالەکۆر، زۆر جاران لە دیوەخان، لە گەرمەی گفتوگۆ سینگی خۆی دەردەپەڕاند دەیگوت:

(من بە بەردێك دوو باڵندەم پێکاوە) لەمەوە خەڵکی ئاوایی زمنیان وابوو.! کە ساڵەکۆر دەستی هەبووە، لە بێ سەرو شوێنکردنی باوکی پەیمان. بەنیاز بوو بەکراسی بەری، پەیمان لە (سەعەگێل)ی کوڕی مارە بکات. پەیمان، بێ چەك بوو، چونکی شەوی ڕابردوو، ساڵەکۆری زڕبابی لەگەڵ زینەڵ ئاغا بەسەفەر چووبوون بۆ شار. تفەنگی سالە کۆر لای نۆبەتدارەکانی دیکە بوو. تەنها خەنجەرێکی دەسك سپی دەبانی پێ بوو. ژووری ئەشکەوتیان پاکوخاوێن کردەوە. هەرچی هەیانبوو لێیان دانا، دواتر هێدی، هێدی خەریکی هەڵکۆڵین بوون. بەریان لە تەڕایەتیەکە گرتبوو، هەرچەندی بنکۆڵیان دەکرد.تەڕایەتی زیادی دەکرد، لە تەڕاتەتییەوە بووە لیتراو، پتر قولیان کرد ئاوێکی شێلو لێ سەرکەوت، قۆڵتەکە پڕ ئاوبوو لە دامێنی قۆڵتەکە چاڵێکیان هەڵکەند، قۆڵتەکە بە سەریدا دەڕژا. غوربەت، لوولە (قەڵۆغان)ەکی هێنا، کون بەدەری کرد، سەرێکی لوولەکەی لە قۆرتی ئاوە شێلوەکە گرت، سەرەکەی دیکەی بەسەر چاڵەکەدا شۆڕکردەوە، خستیە ژێرقوڕ، ئاوەکەی دەپاڵاوت کەلێبوونەوە غوربەت گوتی: (خەمی گەورەمان ئاوبوو، سوپاس بۆ خودا ئەویش دابین بوو). پاشان گە بێنیان هاتەوە بەر، کۆمەڵێك بەردی گەورەیان هێناهیشکە چن، لە پێش دەرگای ئەشکەوت سەنگەرێکی قایم و مەحکەمیان دروستکرد، وایان دامەزراند بوو، بەسەر هەموولایەکدا زاڵ بوو، دواجار بۆخەوتن. لەترسی زیندەوەر. لەداروچروو، چوار هەرزارەیان دروست کرد، ئیدی کەتەواوخۆیان دامەزراند، بەنۆبەت لە سەنگەردا ئێشکیان دەگرت.

# (٤)

سێ ڕۆژان پرسەیان بۆ حەمە بۆر دانا. کوشتنی حەمەبۆر، لەناوچەکەدا دەنگی دابۆوە.پیاوان غەزەب لە چاوانیان دەباری. هەموو هێواران لە دیوەخانی زینەڵ ئاغا. بەمەبەستی تەگبیری تۆڵە سەندنەوە خڕدەبونەوە . دەمیان تێکدەنا بەلام قسەیان یەکدی گرنەدەبوو. هەبوو دەیگوت (خوێن گری حەمەبۆر کێیە.؟! با ئەو بەدوایاندا بچێ). هەشبوو دەیگوت نا، باکەسوکاری ئەو دەلیسانە بەشوێنیان دا بڕۆن، بیانگرن سەریان لە جەستەیان جیابکەنەوە). هی واش هەبوو لە ناویاندا، وایدەزانی.! گوێزی پوچەڵی بۆ دەژمێرن.هەرچی زینەڵ ئاغا بوو، چکو کارەساتەکە لە گوندی زەردەشت ئاوا ڕووی دابوو، بۆیە پێیوابوو کە شەقڵی هەیبەتی پیاوەتی ئەو شکاوە، ئەگینا لە خەمی خوێنی حەمەبۆردا نەبوو، بۆیە لێیان بەغەزەب ڕاچووبوو، بەقسەی سوك و چرووك.! (هەی لە ژنەکانتان کەمتر، ئەگەر لە ژنەکان و کەمترنەبن کەی بووە پیاو بەدەستی ژنان بکوژرێ، ئێوە بەخۆتان دەڵێن: پیاو. بڕۆن سمێڵتان بتراشن، (کتك)یش سمێڵی هەیە. هەی بێ خێرینە. بڕۆن جل و بەرگی ژنان بپۆشن. لە (ناندین)بکارن. چاترە بۆ ئێوە). دەیشوشتنەوە. دەهات و دەچوو سەرزەنشتی دەکردن.! (ئێوە ئەم تەرزە پیاوە بن.هێندە بێ خێر بن، دەسەڵاتی مێینەتان نەبێ. گوایە لە ڕۆژی تەنگانەدا چ . تەمایەکم بەنگۆ بێ. ئەگەر سبەینێ لێمان بقەومێ چۆن.؟! های های.پشت بە ئێوە ببەستم ).هەموو هێواران ئەم قەوانە دووبارە و سێ بارە دەبۆوە. تاکو هێوارەکیان.پاش ئەوەی شورت و شۆی شکاندن بەجوندان.پاشان گوراندی.!

(بڕۆن بیدۆزنەوە. ئەگەر لە بن عاردی بێ. یان لە ناو دەریا بێ. یان لە بەرزایی عاسمان. لە بن پەڕەگەی هەوران بێ. هەردەبێ بیدۆزنەوە. ئەم کارە کاری پیاوانە.کاری پیاوی بە جەرگ و مێرخاسانە، کاری (ڕەحمان کەڵۆس)ە. هەی بەقوربانی ژنەکەی کەڵۆس بن. شەرت و پەیمان بێ.! بەرانبەر بەسەری ئەم تیتك بڕاوانە، هەرچی ڕەحمان کەڵۆس بخوازی.؟! بۆی جێبە جێ بکەم.دەست لەسەر ژنی هەرکامەتان دابنێ.! دەبێ بۆی تەلاّق بدەن خەرجی و بارگرانی زەماوەندیش. دەبێ ئێوە لە کیسەی خۆتان بیژمێرن. دەبڕۆن بەر چاوم چۆلکەن). لە گوندی زەردەشت ئاوا .شیرازەی ژیان لە باریەك چووبوو. شەڕوناکۆکی هەموو ماڵێکی گرتبۆوە. شیرازەی خێزانداری بەتەواوەتی تێکچووبوو، ژن و مێرد، بەیەکەوە هەڵیانەدەکرد. خوشك و برا دەمیان تێکنابوو، ترمەو بۆڵەیان بوو، دەمیان لێکدی سپی ببۆوە. پیاوان بەتەمای تۆڵەکردنەوە بوون. هەرچی ژنان بوون، چاوەڕوانی دەنگو باسی ئافرەتانی یاخی بوو بوون لە ئەشکەوتی دێوان. بەگەرمی دەهاتن و دەچوون. فسکەفسکیان بوو،: بالێرە شەڕوگاڵەی دانیشتوانی گوندی زەردەشت ئاوا جێ بێڵین، هەوراز بینەوە بۆلای غوربەتخان و هاوڕێکانی لە ئەشکەوتی دێوان. بزانین کار بەچی گەییوە؟

# (٥)

غوربەت، لە دوێنێ هێوارێوە دانەدەکەسا، کێچی کەتبووەکەولی، حەجمانی لەبەربڕا بوودەهات و دەچوو، لە هیکڕا دەگژ فکران ڕادەچوو، بەزۆری سێرەی نیگای دەبرپە ئەو تولە ڕێیەی کەدەهاتەوە سەر ڕووبار. تێدەفکری، تاوناتاو لە سەر چنچکان هەڵدەقونجا، بەزلەپووش بەر دەمی خۆی چینە دەکرد ،وا دەبوو لە هیکەوە هەڵدەستاوەو دیقەتی دەدا تولە ڕێیەکە، هاوڕێکانی لێی بەگومان کەوتبوون. دەیانگوت(گوێی شەیتان کەڕ بێ، لەوانەیە پەشیمان بووبێتەوە، تێکچووبێ، یان شتێکی لە دڵ دا حەشارداوە، نایەوێ بیدرکێنێ. نا..هەرگیز باوەڕناکەم غوربەت. شتێکی لە دڵدا بێت و لە ئێمەی بشارێتەوە. نەخێر ئەوەی من بیزانم، پێموایە کە غوربەت باری قورسە. کۆڵی هەمووانی لە خۆی هەڵداوە، تووشی دەریایەکی شێلو بووە، دەیەوێ بپەڕێتەوە وابزانم بەدوای شوێنی تەنکاودا دەگەڕێ).

نازێ، هێدی هێدی لێی چووە پێش. بە شێنەیی دەستی هاویشتەسەر شان و ملی پێی گوت.

- غوربەت گیان، ئەوە چتە.؟! بۆ هێندە نارەحەتی.؟!

چ خێرتە.؟! خۆنەساغ نی.؟!

ئێدە پێمان بڵێ، بۆچی خەفەتخانمان دەکەی.؟! ئەگەر ناخۆشییەك لە ئارادایە، بۆچی لێمان دەیشاریتەوە.؟!

- ناهیچ لە گۆڕێ نیە.

- ئەی ئەگەر وایە، بۆچی خۆت سەخڵەت کردووە.؟!

دواتر لێی زیت بۆوە پێی گوت

- لەوانەیە پەشیمان بووبیتەوە.؟!

غوربەت بەم قسەیە زۆر توڕەبوو، لە حەیبەتان لێوی خۆی دەکرۆژتەوە. بەڵام دوای تاوێك. زەردەخەنەیەك بەسەر لێوی داهات، گوتی:

- نا.. نازێ خان، پەشمان نیم، هەرگیز پەشیمانیش نابمەوە پێداچوو گوتی:

..مرۆ، ئەگەر کارێك بەڕەوا بزانیت و بەئەنجامی بدات، دواتر لە کردەوەکەی خۆی پاشگەزبێتەوە، ئایا ئەمە چەندی بەچەند.؟! دەبێ هەموو کەسێك ئەوەبزانێ.! کەمرۆ لەژیاندا یان دەبێ ڕاوچی بێ، یانیش نێچیر. بۆیە دەبێ هەموو مرۆڤێك، بڕوای تەواوی بەخۆی هەبێت، ئەنجا دەستبەکاربێ) لەم قسانەدابوون، عەیشان و پەیمان هاتنە لایان. غوربەت درێژەی پێدا گوتی:

- هاوڕێیان.ژیان بەم شێوەی ئێستا بۆمان مەیسەر نابێ. لەم شاخ و هەلەمووتە دەبینە خۆراکی دەعباو دالآش، پێویستە هەوڵبدەین، تێبکۆشین تاکو بژین، ژیان هەمووی تێکۆشانە تێکۆشانیش قوربانی دەوێ، ئەگەر هەوڵنەدەین.؟! بێگومان ناژین. واتا دەبێ هەڵتەك، هەڵتەك بچینەوە بەردەستیان، نانی سەر شۆڕی و چاوبەردانەوە بخۆین. ئەنگۆ دەزانن زەوادمان لە بڕانە، کە بڕا پاشان چیبکەین.؟! ئایا چاوەڕوانی مەرگی خۆمان بکەین.؟! نەخێر دەبێ گورگ ئاسای پەلامار بدەین، هەرچی کەوتە پێشمان تێکوپێکی بشکێنین، ئەگەر تێکی نەشکێنین.؟ بێگومان تێکمان دەشکێنێ، ئەوە یاساوڕێسای شاخ وپاخیبووانە لە پێناو ژیان. بەدەست ئاماژەی تولە ڕێیەکەی بۆیان کرد گوتی:

ژیانمان کەوتۆتە سەر ئەو تولە ڕێیە، ئەوە ڕێگای کاروانچی وقاچاخچی و دزو جەردەو ڕێگرو پیاوکوژانە، ئێرە مەکۆی پیاوخراپانە، کەس بەزەیی بە کەس دا

نایەتەوە، کاروانچییەکان، بۆ پشوودانی خۆیان و ئیسراحەتی ولاّخەکانیان. لادەدەنە دەم ڕووبار. دەبێ ئێمە بەر لە گەیشتنی کاروانچییان، خۆمان لەدەروبەری(دەراو)ەکە قایم بکەین، دەبێ چاوەڕوان بین، هەتاکو بارەکانیان لە ولاّخان دادەگرن، دواتر ولاّخەکانیان ئاو دەدەن، ئێستا کاتی گیا و گۆڵ نیە، تورەگەی ئالیکیان لەسەر هەڵدەکێشن، پاشان مژولی خۆیان دەبن، چای دێم دەکەن، نان دەخۆن لەم کاتەدا دەبێ دەستبەکاربین، بواریان پێ نەدەین بەخۆبکەون، نەبادا لێمان بێنە دەست.حاڵی بوون.؟!

# (٦)

سەر لە هێوارێ کە دنیا ئەنگۆرە بوو،هەرچواریان بە هێواشی بە نشێودا شۆڕبوونەوە، لەتەنکاوەکەیان دا پەڕینەوە بەری ئەو بەری ڕووبار، لەدەوروبەری (دەراو)ەکە خۆیان دامەزراند، سەنگەریان گرت.چاوەڕوان بوون. هاوڕێ غوربەت، ناوەناوە گوێی دەگەیاندە زەوی، هەستی لەخۆی دەبڕی! چش. دواجار شەو بەنیوە ببوو، دیسان گوێی خۆی بەعاردی وەنوساند، هەستی ڕاگرت.! هەستی بە چرقە. چرقی نالّی ژێر سمی ولآخان کرد، هەرسێکیانی ئاگادار کردەوە.! (هوشیاربن، خۆتان شپرزەو شێلوەمەکەن دەستتان بلەرزی ). هەرچواریان زۆر بەپەرۆشەوە، سێرەی نیگایان گرتبووە ڕێگا. چاوەڕوانییان لە کارەساتێك دەکرد. کارەساتێك. کە هێشتا لە ژیانیاندا پێی ئاشنا نەبوون .

: پێتان عاجباتی نەبێ.! چوار کچە عازەبی جوان و شۆخ و شەنگ و نازدار. لە پیناو ژیانێکی بەکەرامەت و سەربەست و ئازادی و بەختەوەریدا. لەم نیوەی شەوەدا وادەستەو یەخە بەرانگژی مەرگ دەبنەوە. چرقەچرقی نالّ و فڕمە فڕمی کونە لووتی ولآخان. وەکو دەنگە دەنگی بەیانییانی گوند دەهاتە بەرگوییان. چەکدارێك لەبەرایی کاروان دا بەپیادە ڕۆ دەهات. شەش هێستر بارو دوو زەلآمی چەکدار بەدوایانەوە بوون، چەند هەنگاوێك بەدوور لەڕووبار، بارەکانیان لە هێستران داگرت، هێسترەکانیان ئاودا، هێسترەکان کەمۆ بوون، قەڕاسەیان لە ملیان ئالآندو تورەگەی ئالیکیان لەسەریان هەڵکێشا، پاشان تفەنگەکانیان لەشانیان کردەوە و بەبنە دارێکەوە هەڵیان پەسارد، دووانیان خەریکی دەستنوێژگرتن بوون، ئەوەکەی دیکەیان، هەندێك چیلکەو هوردە دارو

پووش و پەلاشی کۆکردەوە، خەریکی چا لێنان بوو، دواتر سێ قۆڵی دانیشتن، مژولی نان و پەنیرو چا خوارنەوە بوون. هاوڕێ غوربەت. پلوکە بەردێکی بۆ(نازێ) هەڵدا، ئاگاداری کردنەوە تا.! دەست بەکاربن. نازێ، پڵنگ ئاسای لە شوێنی خۆی دەرپەڕی و باقە نەجمەی ڕاکێشا، تفەنگی سوار کرد، لەگەڵ دەنگی خرمژنی باقەنەجمە، هەرسێکیان پارووپان لە قوڕگیدا عاسێ بوو، غوربەت، بەدەنگێکی نێرانە تێی ڕاخوڕین.! (نەبزوون کورە، هەر بجولێن کوژراون) لە جێوە زارە ترەکبوون، گەمارۆیان دان، غوربەت، بەسەر ئاماژەی بۆ پەیمان کرد، پەیمان ژنەوت، قەڵەمبازی دا. بەگورجی پەلاماری چەکەکانیانی دا. تفەنگێکی کردە شانی، تفەنگێکی بۆ عەیشان هەڵدا، تفەنگێکیشی سوارکرد و سێرەی لێگرتن، هاوڕێ غوربەت، لێیان چووە پێش، باخەڵ وبەر پژدینیانی پشکنی، دەستێکی بەباخەڵیان داهێنا. خەنجەری لەبەر پژدێنیان دەرێنا، چەکی کردن، زەلامەکان لەحەیبەتان پارووی ناو دەمیان تفاندەوە. واق وڕمابوون، دەستیان بەخۆیان دا شۆڕکردەوە، یەکێکیان بەسرتە گوتی:

لەکاتێکی خراپ لێمان قەوما. ئەوەی دیکە بڵماندی.! شەرمەزاربوون، چۆن ڕووبدەینە ئاوەدانی.؟! سێیەمان گوتی:

وێدەچێ ئەوانە بکوژی (حەمە بۆربن، تازە کارلەکارترازاوە، هیچمان لەدەست نایەت). لەداخان وێکهاتبوونەوە. هیشك هەڵگەڕابوون.

هاوڕێ غوربەت، دیسان دەنگی دان.! یاڵڵە بەخۆکەون، بارەکان لە ولاخەکان بارکەنەوە. ئاگاداربن.! هەرجولەیەك، یان پێ لەبەرپێ بنێن، کارلەکاردەترازێ، خوێنی خۆتان لە ئەستۆی خۆتان، یەڵڵا دەست و بردکەن. بێ جولەوخۆبادان، بارەکانیان لە هێسترەکان بارکردەوە. پاشان پێی گوتن.!

- من غوربەتی عەلی ئاوخۆرەوەم، بکوژی حەمەبۆرم. حەمەبۆری دەست گیرانم، حەمەبۆرم لەخوێنی خۆیداگەوزاند. لە دەستم دێ هەرئێستا بە دەردی حەمەبۆرتان ببەم. بەلاّم نە. ناتانکوژم. بەمەرجێك.؟!

هەرلێرەوە تادەگەونەوە مەنزل، گەیشتنە هەر رێبوارێك، شوانێك، هەرئاوەدانییەکی کەوتە سەر رێتان، گوند بە گوند دەنگوباسی ئێمەی یاخیبوو، ئێمەی کیژگەلی ئەشکەوتی دێوان، بەخەلّك رادەگەیەنن. ئێستاش ئەوە رێگە لە پێشتانە.فەرموون برۆن. بەلاّم نەکەن ئاوربدەنەوە.

حالّی بوون.؟!

- بەلێ حالّیبووین. بەلاّم چۆن بەدەستی والاّ بگەرێنەوە؟ بەچی وەلاّمی ئەم خەلّکە بدەینەوە!؟

- ئاخروئۆخری پێناوێ. کات درەنگە، هەروەکو پێمگوتن: ئەوە رێگا. هەتا زووە ئەسکوردتان بشکێنن و برۆن. ئەوە چاوم لێتانە، هەرئاورپبدەنەوە.! جامی سەرتان هەلّدەگرم. ناچار حیزەکە حیزەکە باریکەیان کردو رۆیشتن لێیان سەیادبوون هەتا لەبەرچاوان ونبوون، پاشان دەنگی هاورێکانی دا.! (هاورپیان، درەنگمان بەسەرداهات، دەست وبردکەن. کات وەبەری نەماوە.) هاورێ غوربەت لە پێشەوە و شەش هێستر بەبارەوە، دوابەدوای ئەم قەتارمیان بەست، هێواش هێواش بەرەو ئەشکەوتی دێوان هەوراز بوونەوە. ژنانی لادێ. بەبیستنی ئەم هەوالّە رووگەش و فرەدلّخۆشبوون، لەسەر رێگەی کانی و دەم رووبار، دەستە، دەستە کۆدەبونەوە. زۆر بەگەرمی باسیان لە قارەمانێتی کیژگەلی ئەشکەوتی دێوان دەکرد، پیرەژنە بەسالاّچووەکان. هانی کچانی جحێلّ و شۆخەژنانیان دەدا، کەچیتر نازو فیزی پیاوان نەکێشن، پێیان دەگوتن.! (نانی دەستی پیاوان بتفێننەوە، مالّ و مندالّیان بەسەردا جێ بهێلّن. هەرنە ریزی خوشکە

یاخیبووەکانتان، لە پێناو داخوازیەکانتان یەکبگرن، بڕۆن شان بدەنە شانیان، هاوکاریان بکەن، چیتر چاو بەرمەدەنەوە، ژیان بەخۆی پێنج و دووڕۆژێکە. هێندەی مەدەنە داو، بڕۆن ژیانتان ژیانی ئەوان، مردنتان مردنی ئەوان)پیرەژنی واهەبوو دەیگوت! چیبکەم.؟! شنگوتاقەتی جارانم لەبەردا نەماوە. تاکوهەیپاتی لێبکەم بدەمە شاخ و بەرمەیدان بوەستم. ئەگینا نانی چاوبەرەو ژێریم قووت نەدەدا.

# (٧)

ڕەحمان کەڵۆس، سەری چەندسالآن بوو ناوبانگی بە ئەشقیا دەرکردبوو، بەگورگی چیا ناودێربوو، زەلامەکی باریکەلەی درێژ، ناوقەدتاژییانی، چاوگورگانی. سمێڵ بابڕ، لووت بەرانانی، مچومۆڕ، ددانی کەڵۆس بوو، زەلام کوشتن و ئاوخواردنەوە لەلای وەکو یەك بوو. بێ بەزەیی وەك خۆی نەبوو، زۆر جاران ئاغاکان، ڕق بەڕق و لەدژی یەکدی لە نیوەی شەواندا دەینێرن، دەچی ئاوایی دەداتە بەرگوللە، یان بۆهەتك کردن و سووکایەتی پێکردن، دەچێتە تەویلەی ولآخان، کلك و گوێی کەربێ، ماین بێ لە بن بۆتەکەوە قووتی دەکاتن.دەست حەقەکەی، کورتەکوشەرواڵ، یان چەند پاکەت فیشەك و هەندێك توتن و جگەرەو هیچی تر. بەیانی زوو خەڵك دەزانن، ئەم جۆرەکردەوانە تەنها لە گورگی چیا دەوەشێتەوە، چونکە ئەوبێ مروەتە ناپەنگێتەوە، داك خۆگێەکی ئەوتۆیە هەرچی بیەوێ دەیکات. لە ئاوایی زەردەشت ئاوا، بووە مقۆ، مقۆ، چبوو.؟! چییە.؟! ئاغا دوو کاوڕە نێری سەر بڕیوە، گوایە دوای نوێژی شێوان. ڕەحمان کەڵۆس. تەشریف دێنێ میوانە. گزیروخوبزە، وەکو بەربووك دەهاتن و دەچوون ،پیاوان لە خۆشیان بزەی سمێڵیان دەهات. خۆیان پڕچەك کردبوو، هەربابابوو لە دیوەخان جێگەی بۆخۆی داگیردەکرد. منداڵە هورتکە لە دەوروبەری

دیوەخان گردببوونەوە، بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی (کەڵۆس) بوون. هەرکەسەو بەجۆرێك. وەسفی جەنابی کەڵۆس دەکرد. بەشان و باڵی دا هەڵدەدا. مەپرسە. (پووره سێوە)، ژنەکی بەسالآچووی هشیار بوولەگەڵ زەینەڵ ئاغا دانوویان لەیەك

مەنجەڵدا نەدەکولا. لەسەر دەستی خۆی دەژیا، هەیبو نەیبوو(حەیدەرکۆ)ی کوڕەزای بوو، ئەویش هێشتانەکێ گچکەبوو. پوورەسێوە، بەهاتنی کەڵۆس تەنگاوببوو، دەهاتو دەچوو حەجمانی نەبوو، هەر لەبەرخۆی بڵەبڵمی بوو جونی دەدا.! (ئەو کەڵۆسە پیس وچەپەڵە بێناموسە، هەر من دەزانم چەند فێڵبازە، بەنامەردی دەستیان لێدەوەشێنێ، چیبکەم.؟! دەستم نایانگاتی. کوو ئاگاداریان بکەمەوە.؟! وەیشش لەخۆم بێکەسێ). لەحەژمەتان دین وهاربببوو. نەدەسەنگرا، دواجار سەرپشتی لێبەستا. گۆپاڵەکەی بەدەستەوە گرت ڕۆیی، بەدارەدار، ئەو سەرو ئەو سەری گوندی دەکرد بەگوێی ژناندا دەیچرپاند.! (خوشکە یاخیبوەکانتان ئاگایان لە تەگبیرو سەین و بەینی ئەو گەوادانە نیە، ئەو حەلە بە ئاگادێن.! دەبینن وا (کەڵۆس) لەسەر سەریان ڕاوەستاوە، کارلەکار دەترازێ. هەتاکو گیرۆدەی داوی ئەو ژن حیزە نەبوونە، ئێستا فرسەتە بائەم هەلە لە دەست خۆمان نەدەین. دەبێ بە فریایان بکەوین. هەردوو دەستی خۆی لێکدەدا دەیگوت. (ئاخ خ چیبکەم.؟! شنگم لەبەر براوە، چاوەکانم کزبوونە، شەوکوێرم، ناتوانم شەوڕۆ بکەم، ئەگەرنا.! دەبوایە سەتی وەکو کەڵۆس بە هینی بابی دا بڕیەنم. کێ لە خۆی ڕادەبینی.؟! دووکەسی ئازاو بەجەرگ هەبان.هەرئەمشەو غوربەت و هاوڕێکانی ئاگادارکەنەوە تاکو وریای خۆیان بن. ئەم کەڵۆسە نامەردە بەقسەی ئەو گەمبۆرە، من دەزانم لەم شەوانەدا دەچێتە سەریان فێڵبازە .پارێزیان لێدەگری، لەناکاو پەلاماریان دەدات، وەکو (کارەکۆرپە) لە شیرنی خەودا دەستگیریان دەکات. بێناموسە، هەتکیان دەکات. پاشان ڕادەستی ئەو مەلعونەیان دەکات. هەموومان پێ چاوبەرەو ژێری پیاوان دەبین، کیژەکانم، دووانتان پێ بنێنە جەرگی خۆتان. غیرەت و بێ، شەرەف کیژگەلی ئەشکەوتی دێوان. شەرەف ئێوەیە. ئاخ خ.. بڕستم لە بەربڕاوە. ئەشکەوتی دێوان بۆمن

دووره دەست و هەورازە نایگەمێ، ئەگینا ڤالۆیەکە. خۆزی بینایيم بڕژابوونایە ژێر پێم، نەبادی چەهرەی ئەو کەڵۆسەی پێ ببینم). دولبەر. کچی ناو کێڵگەو سەر پەرێزبوو، کەبەری لەتەبارە دەگرت دەچووە گازێ، زەلام نەبوو شان لەشانی بدات. ئاواز، کچە شوانکارەبوو، بست بەبستی ئاڤارو رێ و بان و ئەشکەوتی دێوان شارەزا بوو، هێندەی شەوین و شیوەخوارکردبوو، مەپرسە، گوتیان: ئەم کارە بە ئێمەگەیی. لەیل. هەڵیدایێ گوتی:

- منیش ئامادەم هەرئێستێ بەرێبکەوین.: پووره سێوە، لەخۆشیان سوورهەڵگەڕا، چاوەکانی پڕفرمێسك بوون، هەرسێکیانی ماچ کرد، گوتی:

- کچەکانم، هەر لە ئێستێوە خۆتان ئامادە بکەن. دوای گەیشتنی ئەو سەگەتۆڕی یە، پیاوەکان لە حزوریدا کۆدەبنەوە، گوێ لە زمان شڕی کەڵۆس دەگرن، بەدەمو لچ و ددانیدا هەڵدەڵێن، لەبەر مێچکە مێچکو کڵکە سۆتەیی ئاگایان لە خۆیان دەبڕێ. ئێوە ناوی خودای لێ بینن و بڕۆن بۆ ئەشکەوتی دێوان.

# (٨)

ڕەحمان کەلۆس شان بەشانی زینەڵ ئاغا، بالیفەکی تووکداریان دابووە بەر پشتی دانیشتبوو، هێدی هێدی دەستی بە سمێڵی دادینا، ناوەناوە موڕدەبۆوەو دادەما، کەس ورتەی لەدەم دەرنەدەهات، هەموو چاوەڕوان بوون.! کەی کەلۆس، شەکرەکی دەشکێنی، ئاغا لەم بێدەنگییەی کەلۆس پەست ببوو، پاشان ڕووی دەمی کردە کەلۆس گوتی:-

- کاك ڕەحمان، بێگومان زانیوتە و ئاگاداری کە ئەو کچەتیمانە شەرمەزاریان کردووم. بەسەری تۆ قەسەم، لەڕووم نایەت لە دیوەخان دەرکەومە دەرەوە، ڕووی مەجلیسانم نەماوە، تۆ بڵێی: بە چ ڕووەك.؟! ڕووبەڕووی سەرەك خێل و ئاغاوپیاو ماقولآن ببمەوە، لە ڕووم نایەت زار هەڵێنم، هەرچی بڵێم شورەیی یە، خۆزگا لەگەڵ پاشای گاورانم لێقەومابا.! بەلآم لەگەڵ ژنانم لێنە قەومابایە، کەسیش نا، دەگەڵ ژنان، دەومرە لەگەڵ ئەو تیتك بڕاوانە تێکەو فڕکە. لەو دەمەدا (مچەگزیر)پیاوی ناو ماڵی ئاغا بەهەڵەداوان هات. دەمی بردە بنا گوێی ئاغا. بەسرتە چەند قسەیەکی بە گوێی ئاغادا چرپاند. ئاغا.لە جێوە ڕاچلەکی، ڕەنگی هەڵبزرکا. گوراندی.! (دیارە ئاوایی زەردەشت ئاوا. پیاوی تێدا نەماوە.

ئەگەر وانییە، ژنان سەری مەیدانیان لێنەدەگرتین، قەسەم بەگۆڕی باپیرەم، دەبێ کارێکی هۆتۆیان پێبکەم، بیانکەم بەپەندی زەمانە، هەربۆبەزم و خۆشی لە دیوەخانان بیگێڕنەوە). کەلۆس لە جێوە جوولەیەکی کردو پرسی:- ئاغا خێرە وا تێکچووی.؟!

- خێری چی ڕەحمان، پێتوایە ئەم ڕۆژگارەخێری پێوەمابێ.؟! من حەیاو حورمەتم چووە، کەڵکی دانیشتنی ناو مەجلیسی پیاوانم نەماوە، دیارە پرچ براوەکەی (مەولودە شەل)و تیتك بە گووەکەی نا حاجی ڕەمەزان و دێڵە سەیەکەی قالە قیت، ئەوانیشمان لێبوون بە ئەشقیا، چوونەتە پاڵ دەلیسەکانی یاخی بوو، لە ئەشکەوتی دێوان. ڕەحمان کەلۆس، بەبیستنی ئەم هەواڵە تازەیە شادمان بوو، پاشان گوتی :

- ئاغا، خۆت سەخلەت مەکە، شەرت بێ لە شەرتی پیاوان، ناهێلم نانی سبەی هێوارە بخۆی، هەر حەوتیان بە کەزی خۆیان جەلەدەکەم بەجەنابتیان دەسپێرم.

- دڵنیام کاك ڕەحمان، سەت هەندە لە تۆ گومانم نییە،بەلاّم بەدەست خۆم نییە، کێچ کەوتۆتە کەولم، هەراسانی کردووم.

- مادام هێندە نارەحەتی، هەر ئێستێ بۆیان بەرێ دەکەوم.

- نا کاك ڕەحمان،لە دوورەوە هاتووی، ماندوو هیلاکی ئەمشەو پشوو بدە، نانی بەیانیمان لەگەڵ بخۆ، پاشان خۆت دەزانی کوو لێیان بەخۆ دەکەوی. دوای تاوێ بێدەنگی، کەلۆس دەمی بردە بنا گوێی ئاغا، بەسرتە هەندێ قسەی بە گوێدا چرپاند. ئاغا، لەقاقای پێکەنینی دا پێی گوت:(سەر پشکبە، باشە).! پاشان پێی گوت: شەو درەنگە، تۆ سبەینێ سەفەری، واچاکە بیکەینە شەو. ئیدی خەڵك پەرتەیان لێکرد.

# (٩)

مانگ ئاوا ببوو، شەو باڵی ڕەشی بەسەر گوندی زەردەشت ئاوا کێشابوو ،هێشتا پیاوەکان لە حزور کەلۆس و ئاغادا مابوون، پەرتەیان لێنەکردبوو. هەرسێکیان لە ئاوایی بەدەرکەوتن، ملی ڕێگایان گرتەبەر، بەرەو ئەشکەوتی دێوان کێلبوونەوەدرپیان بە تاریکییەوە ناسەگ و گورگ لێکدی ئاشکرانەبوو بوون، نازێ، لە نۆبەتە ئێشکگری دا بوو دەهاتوو دەچوو، هەستی بە غەڵبەغەڵب کرد ، سەحی ئەملاو ئەلای کرد، دیقەتی دا.! دیتی سێ(٣) پیادە بەڕێوەن، خۆی قایم کردلێیان بێدەنگ بوو، یاغر یاغر دەهاتن، تەواو نزیکبوونەوە، کەتنە ژێر سێرەو ڕەحمەتی تفەنگ. دەمامکیان دابوو، نەدەناسران، لە پڕێکەوە فیشەکی هاژووتەبەر خانەی تفەنگ و دەنگی دان.! (لە شوێنی خۆتان نەبزوون، هەر بجوڵێن کوژراون) هەرسێکیان لە جێوە چەقین، واق و وڕمان، هاوڕێ غوربەت، لەگەڵ دەنگی نازێ و خرمژنی باقە نەجمەی تفەنگ، پڵنگ ئاسای قەڵەمبازی داو، دەرپەڕیە دەرەوە، عەیشان و پەیمان بە دواوەی بوون، سەنگەریان لێگرتن. نازێ دیسان دەنگی دان، ئێوە کێن.؟چکارەن.؟! هەتا زووە خۆتان ئاشکرا بکەن. ئەگەرنا.! لەخوێنی خۆتان دەتانگەوزێنم. هەرسێکیان دەمامکیان کردەوە، دڵبەرو، هاتە گۆو گوتی:

- ئێمە دۆستین، هاتووین غوربەتخان بۆ حەمەبۆر بەبووك ببەین. دواتر لە قاقای پێکەنینیان دا،لێکدی ئاشکرا بوون، هامێزیان بۆ یەکدی کردەوە، یەکدیان لە باوەش گرت، ئەماچێك و ئەدووان یەکتریان ماچ دەکرد و فرمێسکی شادمانییان دەباراند، دواتر (نازێ)یان لە سەنگەردا بەجێ هێشت، چوونە ژووری

ئەشکەوت، دوای پشوودان و گاڵتەوگەپ و تەشەرە، هاتنە سەر باسی (پورە سێوە )و ژنانی ئاوایی و گوندەکانی دەوروبەر، باسی زینەڵ ئاغا و هێوارانی دیوەخان وپیاوانی گوندو هاتنی ڕەحمان کەلۆسیان بۆکردن.! (تەگبیر وایە، لەم شەوانەدا بۆ هەتکردن و ڕیسواکردن، ڕەحمان کەلۆس دێتە سەرتان، گفتی بەئاغا داوە، نەك بەشەو بەڕۆژی ڕووناك. هەرچوارتان پەڵبەست بکات) بەقسەکانی پوورە سێوە دڵخۆشبوون، ناومناو هاوڕێ غوربەت دەیگوت:

- دەبۆمان بگێڕنەوە، بزانین پوورە سێوە لە چ حاڵدایە.!

- پوورە سێوە سەرپشتی لێبەستاوە، گۆچانەکی بەدەستیەوە گرتووە، دێت و دەچێ، ئەم سەر ئەو سەری گوند دەکاتماڵەو ماڵ دەگەڕێ، لەوەتەی ئاغا کلکی خۆی بەکلکی کەلۆسەوە گرێداوە، پوورە سێوە دین و هاربووە. سەری زمان بنی زمانی، تەنها جووندانە دەڵێ (ئەو کەلۆسە بێناموسە. سەگبابی وەکو خۆی نییە. بێ مروەتە، دەست ناپارێزێ بۆ ماڵی دنیا لەسەر دایکی خۆی بازنادات بای یەك زەڕە چییە.؟! شەرەف و ویژدانی نییە، دەیوسە،لێمان بوویتە کەرەگا. کەس نییە دەست لە دەستی هەڵدات. ئەو، ئەگەر پیاوە و ئازاو بەجەرگە. بەخۆی دەڵێ پیاو.! بابچی حەقە ناموسی خۆی لە (حەمە ڕێگر )ی هاوکاری وەربگریتەوە، گەوادە، ئەگینا ئەو حەمەڕێگرە. بە نوێژی نیوەڕۆیێ. (ئەسمەر)ی ژنی لە بن چۆکی دەرینا، بردی بۆ چیا، بابچی ئەو حەقە لە حەمەڕێگروەر بگرێتەوە، تەرسە، ئەگینا هیچ پەیوەندی بە غوربەتوهاوڕێکانیەوە نیە. خۆ کەلۆس خوێن گری حەمەبۆر نیە. لێان چویتە سەر کەڵی دارێ.! ئیللاوبیللا دەیانکوژم). پاشان غوربەتخان گوتی: مرۆ لە ژیانی دا نازانی چارەنووسی بە چی دەگات.؟! بەڵام گرنگ ئەوەیە. مرۆ هەتا لە ژیانی دا مابێ، قبووڵی سەر شۆڕی و شەرمەزاری نەکات، ئێستاش ئێوە ماندووهیلاکن ئیسراحەت بکەن. بزانین چارەنووسمان بە چی دەگات.

# (١٠)

ڕەحمان کەلۆس وای دابووە قەڵەم.! کە لە بەرە بەری بەیانی دا، کارمامز ئاسای لە شیرنی خەودا بەدەست بیانگری، وابوو بەیانی ڕۆژی ئاینده.دوای نوێژی شێوان کەلۆس و (جەلۆ وکەمۆ و سالۆ). ئەم سێیەیان کە پیاوی ئاغا بوون. لێ سوار بوون، هەڵتەك هەڵتەك بەرەو ئەشکەوتی دێوان بە هەورازدا هەڵکشان. ڕەحمان کەلۆس. ئەسپەکی شێی سم کۆتکی گوێ ڤیتی لەبن دا بوو، ئەسپی زینەڵ ئاغا بوو. لەبەرایی دا دەڕۆیی، ئەوانیش بەدوایدا قەتارەیان بەستبوو، سەر لە هێوارێوە دنیا ئەنگۆرەبوو، غوربەت و هاوڕێکانی داکشابوونە دامێنی چیا. لەمبەرونەوبەری ڕێگا لە سەنگەردا خۆیان قایم کردبوو، چاوەڕوان بوون شەو ڕاکشا، درێژبۆوە، هێدی هێدی بەرەوبەیان لە کورتی دەدا، سەگ و گورگ لێکدی ئاشکرابوون. گەزەنگی دا، هیچ لە ئارادا نەبوو، نازێ متەقی کرد چیتر خۆی پێنەگیرا، خۆی گەیاندە هاوڕێ غوربەت،

_ هاوڕێ، ئەوکەلۆسە بست بە بست، بەرد بە بەردی ئەم ناوە شارەزایە، تۆ بڵێی: ئەم فێڵبازەلە لایەکی دیکەوە پارێزمان لێنەگری.؟!

_ نا.. بڕوا ناکەم، چونکی هێندە بڕوا بە خۆو بێ منەتە،هیچ حیسابێکی بۆ ئێمە نەکردووە، تەنها حیسابی ئەوەی بۆمان کردووە. کەوەکو مریشکە کورکی سەرهێلکان، بەدەست بمانگریت و بزنەگەل ئاسای بەرەو ئاوایی زەردەشت ئاوا بە پێشەی خۆی مان بدات، تەسلیم بەدەستی زینەڵ ئاغامان بکاتەوە ،پاشان پاداشتی خۆی وەربگری. خۆر،چوار، پێنج باڵ بەسەر کێواندا بەرزببۆوە. لە زارکی گەلی ئەشکەوتی دێوان بەدەرکەوتن، چرقەچرقی ناڵ و فرمە فرمی کونە لووتی

ئەسپان. تێکەڵ بەفڕکە فڕکی باڵی باڵندە و قاسپە قاسپی کەو دەبوون، هەروەك بڵێی: باڵندەکانیش هەستیان بەکتوپڕی قەومانی کارەساتێکی دژوار کردبێ، بۆیە هێندە نارەحەت بوون، لە هیچ شوێنەکدا ئارامیان نەدەگرت، فڕکە فڕکیان بوو نەدەحەجمان، چەند هەنگاوێك مابوو بکەونە ناوکەمین، کەلۆس هەسپی خۆی سەنگراندەوە، هەربەسەر پشتی ئەسپەوە، ئاوڕێکی دواوەی داوە، بە گاڵتەجاری بەیاوەرەکانی گوت:

(ئەوەتانێ بووکەکانمان وان لەو شاخە بەرزانە ئەشکەوتێکی لێیە، هەر لە کۆنی کۆنەوە مەکۆی ئەشقیاو کەڵەمێردو عەگیدان بووە، بەلاّم ئێستا بووەتە سەرشۆرکی ژنان. سوردەزانم ئێستا والە شیرنی خەودان. خەون بە ئامێزی پیاوان دەبینن. بۆیە وا چاکە ولاّخەکان لێرە بەجێ بهێلین، نەبادا لەگەڵ چرقە چرقی ناڵ و کورژن و سمکۆڵی ئەسپەکان، لە شیرنی خەودا ڕاچڵەکن، هەترەشیان دەچێ) ئیدی هەرچواریان دابەزین، هەوساری ئەسپەکانییان دایە دەست جەلۆ، جەلۆ ئەسپەکانی لەڕێگا لاتەرێك کردەوە و بەدووری خستنەوە. ڕەحمان کەلۆس گوتی: هەر ئێستا زارکی ئەشکەوتیان لێدەگرین، لە شیرنی خەودا دەستگیریان دەکەین .پاشان بەبووکانە.. بووکانە دەگەڕێنەوە بۆ گوندی زەردەشت ئاوا). پاشان هەرسێکیان تفەنگیان کردە شانیان و بە پیادە ڕۆ، یاغر یاغر بەرەو ئەشکەوت بە هەورازدا کێل بوونەوە. لێیان بێدەنگ بوون. هەتاکو کەوتنە ناوبۆسە، لەگەڵ دەنگی شریخە شریخی ڕاکێشانی باقەنەجمەی تفەنگان، هەرسێکیان تێك قژقژان. چاشمیش بوون، لە جێوە چەقین، هاوڕێ غوربەت تێی ڕاخوڕین (نەبزوون کورە). کەلۆس زگاوزگ خۆی هەڵدایە سەر زەوی، خەریك بوو تفەنگی لە شانی داماڵێ. بەلاّم هاوڕێ غوربەت، بواری پێنەدا بەخۆ بکەوێ لێی ئاگردا، پێکای، وەکو (گا) قۆڕاندی قۆڵی راستەی هوردوخاش کردبوو، لەولاوەش نازێ و عەیشان.

بە جووتە دەستڕێژیان لە (گەمۆ و سالۆ) کرد، هەردووکیان بەلادا وەرگێران. هەرچی (پەیمان)بوو، داکشابووە خوارەوە،

پارێز لە (جەلۆ)بگرێ، بەلاّم جەلۆ پێ حەسیا بوو. بەتەقە کردن بواری پێ نەدەدا لێی نزیك بێتەوە، بەلاّم شپرزە ببوو.ئەوەی پتر شپرزەی کردبوو ئەسپەکان بوون، ئەسپەکان لەگەڵ تەقەی تفەنگان دەیانحیلاند، هەڵدەستانەوە سەر پاشیان، جەلۆ،لە دڕۆستیان نەدەهات بەرزە فتیان بکات. ناچار سێ ئەسپی بەر هەڵدا، تێیان تەقاند بۆی دەرچوون، بەلاّم ڕێشمەی ئەسپە شێی لە بنەدارێك گرێدا،پاشان تەقەی لە پەیمان دەکرد،نازێ چاوی لێبوو جەلۆ دەست نادات. بۆی داکشا.دزەی لێکرد، بەڵکو پشتی لێ بسەنێ. کەچی جەلۆ درکی پێکردبوو، جارێك لوولەی تفەنگی دەکردە پەیمان، یەکدوو گوللەی حەواڵە دەکردێ ئەمجار لوولەی تفەنگی دەکردە نازێ و دایدەگرت. نەیدەهێشت لێی نزیك ببنەوە، چرکە بەچرکە شەڕ گەرمتر دەبوو، جەلۆ وەختێك بە ئاگاهات فیشەکی لە بڕان بوو.یەك پاکەت فیشەکی پێ مابوو، ئەویشی داڕ نییە ناوخانەی تفەنگ. بە قوونە دزەو کوڕەکوڕ، خۆی گەیاندە ئەسپە شێ هەوساری لە دارکردەوە، خۆی هەڵدایە سەر پشتی ئەسپ تێی سرەواند، بۆی دەرچوو. بە جووتە سێ، چوار گوللەی بووکانەیان بەسەریدا تەقاند، کەلۆس خوێنی لەبەر دەڕۆیی، لە خوێنی خۆیدا سوور هەلگەڕابوو، دەینالاّند و دەگەوزی، برینەگەی کاریگەر بوو، قۆڵی هەڵتەکاندبوو، هاوڕێ غوربەت، وەکو جەنگاوەرێکی قاڵبووی ناو شەڕوجەنگ، زۆر لە سەر خۆوئارام بوو هیچ نەشێوابوو، بەسەرە سمکی پێی، لەبن پەراسووی کەلۆسی هەڵدا. بەسەر پشت دا وەریگێرا. بێ خێر ببوو، پێی لەسەر سینگی دانا، دەیگوت (چاوی دایکت کوێر بێ ڕەحمانە، ئەوە ڕەحمانەیە ئەوها بێناز کەوتووە، وەیشش ماڵی وێرانم، ئەوە گورگی چیایە ئەوها ڕەزیل و سەفیل بووە. وەیشش

کوو دەناڵێنێ، شەرمێ ناکات دەناڵێنێ). دواتر ئاوڕی لە (کەمۆو سالۆ)داوە. کەمۆ گیانی سپاردبوو، بەڵام سالۆ لرخە لرخی بوو، ڕنەی لە عاردی گیردەکرد، لەحەولەرۆح دابوو، دوای چەند چرکەیەك چنگی شلوخاوبۆوەگیانی سپارد.. کەلۆس، ئەگەر چی برینەکەی زۆرکاریگەر بوو، بەڵام هێشتانەکێ زمانی لە لوغ لوغە نەکەوتبوو، لەبەر هاوڕێ غوربەت دەپاڕایەوە دەیگوت:

_ دەستم دامێنت غوربەتخان، من کردم، تۆ مەیکە، دەخیلت بم، ئەمجارە بەزەییت بێ، دنیا شەوو ڕۆژێك نیە ئەم چاکەیەم لەگەڵ بکە، شەرت بێ تا ئەو ڕۆژەی دەمرم لەیادت نەکەم، ڕۆژێ لە ڕۆژان هەربەکەلکت دێم، ئەم چاکەیەت بدەمەوە)؟! هاوڕێ غوربەت زەردەخەنەیەکی باریك بەسەر هەردوو قەیتانی لێوی داهات ،پێی گوت:

- وابزانم تەمەنت هێندەی وەبەرنەماوە، تاوەکو لە یادم نەکەی، ئەسلەن پیاوی وەکو تۆ، لە هیچ کاتێکدا شایەن بە چاکەو پیاوەتی و لێبووردن نییە، تۆیەکی بەکرێگیراو کەی شایەنی بەزەیی پێهاتنەوەیە، خۆتۆ خوێنگری (حەمەبۆر)ی گۆڕبەگۆڕ چوونەبووی.؟! تۆفریدراوی. بەفیتی زینەڵ ئاغا. هاتووی بەکەزی خۆمان جەلەمان بکەیت و بزنە گەل ئاسای بە پێشە خۆتمان بدەی ئاخر پێمناڵێی: کەی پیاوی وەکو تۆ ئاسای موستەحەقە بە ژیان.؟! پێمناڵێی: لە زەمانی فرت و فێل و شەڕانگێزی و غەدرو بێناموسی و خراپەکاری بەملاوە،چیتر ماوە نەیکەی،ئەدی هەر ئەتوو نەبووی، پرکێشی (فاتە بێوەژن) بووی، داماوە لە حەیبەتان خۆی سوتاند. لەبیرتە.! پاش ئەم هەموو خزمەتە. ئابرووی کچەکەی (مام سولەیمان)ت برد، بەدەستی براکەی بەکوشتنت دا.

ئەوانە هیچ، لێگەڕێ.هەی حەرامزادەی بێ نمەکی بێ شەرمەف. کوو.؟! دەستت چووێ دەستدرێژی بکەیتە سەر ناموسی ژنەکەی (خلە). ئەی خلە هاوڕێی

گیانی بە گیانی تۆ نەبوو.؟! هەی دەیوسی شاخ هاتی. شەرمێ ناکەی ئەوها دەنووزێیتەوە !؟ بەرنەت گۆڕ بۆ خۆت هەڵقەنی چاترە لەوەی بپاڕێیەوە. هاوڕێ غوربەت. هێندە تورە ببوو.ئاگر لە لە چاوی دەباری دەنگی هاوڕێکانی دا. !(خەریتەکانییان لێ داماڵن، لاشەکانیان پەلکێشی ئەم دۆڵە کەن، بیانکەن بە خۆراکی دەعباو خەرتەلو سیسارکە کەچەڵە). دواتر ئاوڕی لە کەلۆس داوە، هێندە بە غەزەب تێی ڕوانی.! کەلۆس لە ترسان بەندی جگەری پسا. لوولەی تفەنگی ئاخنی یە ناو دەمی و ئاگری دا، جامی سەری هەڵگرت، مێشکی کردە پرپۆڵە، پاشان بە چواردەستە هەڵیانگرت هەڵیاندا بۆبنی گەلی. غوربەت هێشتانەکێ هەر تورەبوو. هەر بەم غەزەبەوە گوتی:

(گۆشتی پیاوی نامەرد قابیل بە چەقەڵ و سیسارکە کەچەڵە، باچەقەڵ بیخۆن).پاشان تەماشای هاوڕێکانی کرد، پێکەوە لە قاقای پێکەنینیان دا. دواتر بەرەو ئەشکەوتی دێوان هەوراز بوونەوە.

# (١١)

دیوەخان جمەی دەهات، دوو، دوو، سێ، سێ، سەریان لە بن سەری یەکدی نابوو. ورتە ورتیان بوو.! (ڕەحمان کەلۆس فێڵبازە، کاتێ بەئاگادێن، دەبینن ڕەحمان لە سەر سەریان ڕاوەستاوە). (نابابە، ئەوانە خواردنی کەلۆس نین، هەر بزانن ڕەحمان کەلۆس بەدویانەوەیە، ئەژنۆیان دەشکێ، ناتوانن هەنگاو هەڵێنن. (کاکە پێویست بەم قسانە ناکات، کاك ڕەحمان لە سەت ئاوی ئەوهای داوە گۆزینگی تەڕنەبووە. سوڕ دەزانم وەکو کارمامزی چاو لە خەوێ، هەتاکو لە هامێزیان دەکات بە ئاگانایەن).

(هەی ڕەحمەت لە گۆڕی مردووتان، ئەنگۆ باسی یەکێك بکەن کە نەیناسن، ئاخرکەسێك هەیە ناووشوهرەتی گورگی چیای نەبیستبێ؟! کێ سەری لە فرت و فێڵی کەلۆس دەرچێ.؟!

(بەخوا کەودەری.. کاکی برا، قابیلە نەیناسین کاك ڕەحمان بەدەستی خۆی زەلامەکی ڕەشیدە، خۆ بەهەوەنتە پێی ناڵێن گورگی چیا دیارە لێیان دیتوەبۆیە ئەم ناوەی بەسەردا براوە) : زینەڵ ئاغا، لە پێش هەیوانی دیوەخان، هەردوو دەستی لە پشتەوتێکئالآند بوو. دەهات و دەچوو. قرقرا بووبۆ بیستنی خەبەرێك، بەمەرەقدا چووبوو، تاوناتاو سەعاتی بەر باخەڵی دەردێنا. هەڵوێستەیەکی دەکرد و لە سەعاتەکە موڕ دەبۆوە لە بەر خۆی دەیبڵماند.! (درەنگ داهات، کەچی سەدایان نەبوو. خۆ ئەشکەوتی دێوان هەندە دوور نییە، لەوانەیە بە پێی ئەو کچە تیوانە بە ڕێوەبن، بۆیە دواکەوتوون). مچەگزیر. هەرچەند خولەکێك جارێك هەیپای لێدەکرد سەردەکەوتە سەر بانیژەی دیوەخان، دەستی دەکردە

چەپەری چاوی، سێرەی نیگای دەگرتە ڕێگەی ئەشکەوتی دێوان، دواجار لە هەللاّی دا.!

- ئاغا مزگێنیم کەوت. ئەوە خۆیەتی، والە پێشدان هاتەوە، ئەگەر بەسەهودا نەچووبووم. ئەسپەکەش، ئەسپەشێی جەنابتانە، ئەرێ وەللاّ خۆیەتی ئەسپە شێی یە. ئاغا ئۆخژنی بە دڵدا هات، بە پێکەنینەوە گوتی:

- ئافەرین مچە، دەستێك جلوبەرگت بۆخۆت حەلاّڵ کرد.

- مەمنوون، خودا لەسەرومالّتان بەزیادی بکات.

خەڵکەکە، تێکڕا وڕووژانە دەرەوە، دیوەخانییان چۆڵ کرد، لە ئاوایی زەردەشت ئاوا، بووە غەڵبە غەڵب و هەرا. پوورە سێوە، بەخەم داکەوتبوو، دەستی لێکدەدا، نەیدەزانی چبکات، لە حەژمەتان خوێنی خۆی دەخواردەوە، تا دەرگای حەوشە دەچوو، دەگەڕاوە، دواتر بانگی (حەیدەرکۆ)ی کوڕەزای کرد، باوکی حەیدەرکۆ بەنەخۆشی (لاڕەشە) کۆچی دوایی کردبوو ،دایکی شووی کردبۆوە حەیدەرکۆ فەراقە بوو،

پوورە سێوەلای خۆی گڵی دابۆوە.

- وەرە ڕۆڵەگیان، گوێبگرە، بزانە چیت پێدەڵێم.

- بەڵێ داپیرە.

- داپیرە لە دەوری سەرت گەڕێ، بەقوربان.! بڕۆ بۆ دیوەخان، گوێ قولاّغی قسان بە، بزانە چدەڵێن. باس و خواس چییە.؟! ئەوجا هەتا دێتەوە، هێلکەکی لۆ کوڕی خۆم دەبرژێنم. باشە.!

- ئا،داپیرە، دوو هێلکەم لۆ ببرژێنە.!

- داپیرە بە سەدەقەت بێ. دوو هێلکان لۆ کوڕی خۆم دەبرژێنم. دەبڕۆدرەنگە. بەلاّم نەچی لەملاولەولا. خۆت بگنخێنی . باشە

- باشە داپیرەلە خۆی هەڵداو ڕۆیی.

: ئەسپ سوار تەقلەکووت بەرەو ئاوایی دەهات، هێشتانەکێ مابوو بگاتە جۆخینان، سرتە، سرت و فسکە فسك دەستی پێ کرد.!

(ئەم سوارە جەلۆیە، ئابابە ئەوەکەی جەلۆیە.؟! وەللاّ دەقاو دەق خۆیەتی جەلۆیە و جەلۆیە.

: ئیدی کە ئاشکرا بوو سوار ئەسپ جەلۆیە.! برووسکەك خرپەی لە دڵی ئاغا هێنا دایهیزراند، لە دڵەوە گوتی:

(ئەم ماستە بێ موو نیە ئەگەرنا، ڕەحمان کەلۆس خۆی لە بەرایی دا دەهاتەوە، قەت جڵەوی ئەسپە شێی نەدەدا دەست جەلۆ).

:ئەسپە شێ شەلالی ئارەقە ببوو هێنکە هێنکی پێکەوتبوو، کەف، بەلالغاوەیدادەهاتە خوارێ، گشت گیانی وەکو (مەشکە و سێپێك)دەهەژا. مچەگزیر، هەوساری گرت و لغاوی لەدەمی داکەلآند بردیە تەوێلە.. ئاغا خۆی بۆ نەگیرا، تاکوجەلۆ بۆیان بدوێ، پرسی؟

- ها،جەلۆ، چییە.؟! دەڵێی لە مەیدانی شەڕدا بەزیوی ڕاتکردووە ئەوها شپرزە وبێ حاڵی.؟!

- بەڵێ قوربان، چتان لۆ بگێڕمەوە، کاشکا تێچاوێکت لێدەبوو، بە چ دەردێکیان بردین، ئەوەی بە سەر ئێمەدا هات، دوعا دەکەم بەسەر دوژمنت دا نەیەت، پێداچووگوتی: من لەلای وولآخان مابوومەوە، لێیان بەدوور بووم، نەکەوتمە ناو بۆسە، ئەگەرنا.! منیش دەرباز نەدەبووم، باشبوومن دەستوەکەریم کرد، تاکو فیشەکم وێمابوو دەستم نەدا، شەڕم کرد، بەلآم هەرچی کەلۆس وکەمۆو سالۆ بوون، کەوتنە ناو کەمین، بواری دەست وەکەری و تەقەکردنیان نەبوو، چاوم لێبوو.! بەیەك دەست ڕێز هەرسێکیان پەلەواژبوونەوە.. ئاغابەگیانی تۆ قەسەم

چاوم لێبوو کەلە بۆسە دەرپەرین،دەتگوت: پڵنگن پەلاماری نێچیر دەدەن..ئاغا لە توورەییان حەوسەڵەی گوێگرتنی نەمابووتێی ڕاخوڕی قسەی پێ بڕی.! قەوچەقەوچ، دەمت داخە، بازمانت لەلالغاوت دەرنەهێنم. دواتر بەسەر خەڵکەکەدا گوڕاندی.! بڕۆن بەرچاوم چۆڵکەن، هەی تەرەسینە، ئەگەر تەرەس نەبن نەدەبوونە قەشمەرجاڕی ژنان، بڕۆن هەی لەژنەکانتان کەمتر.

حەیدەرکۆ، بەهەڵەداوان گەڕاوە، هێشتا لە دەرگەی حەوشە بوو بانگی کرد

- داپیرە.. هۆ داپیرە.!

- وەی گیانی داپیرە، داپیرە بەلاگێڕت بێ. بەهێنکە هێنک گوتی:

- مامە جەلۆ دەڵێ: کەمۆو سالۆ و کەلۆس، هەرسێکیان کوژراون، ئاغاش تورە بوو.. داپیرە کووا هێلکەت بۆم برژاند.؟!

- ئەدی کوو نەمبرژاندیە. پاشان پورە سێوە باولەکی لە بن خەلانەی هەرزارە دەرینا، سەری هەڵداوە، کراس و کەوای ئاگرباران و کلاَوو هیزاری بووکێنی دەرێنا، ماوەیەك لە پێشە خۆی دانا، بەتاسووقەوە سەیری دەکرد، پاشان بە ئەندێشەی خەیاڵدا کەوت.! (خۆزگەم بەو ڕۆژە). دواتر ئاهێکی ساردی هەڵکێشا و سەری خۆی ڕاهەژاند، دواتر زەردە خەنەیەك بەسەر لێوی داهات، گرژییەوە، ئەنجا جلەکانی لەبەرکرد، خۆی ڕازاندەوە، قەستی ناو ئاوایی کرد. ماڵ بە ماڵی گوندی زەردەشت ئاوا گەڕا دەیگوت: (کەلۆسی سەگباب، بەقسەی ئەم گەمبۆرە خۆی بەکوشت دا، کەمۆو سالۆش بەگوونی بابی داڕیاند.. هەروەها دەیگوت: کچەکانم خەنەی بگرنەوە، دەست و پێتان لە خەنەی نێن، بەڵکو ئەم قوڕمساخە لە داخان وەکو گوندە بەژەهر شەق دەبات. خۆشی، ئەو خۆشییە بوو.! پوورە سێوەی تێدا بوو. هەواڵی کوشتنی کەلۆس و خوبزەکانی زینەڵ ئاغا، لە ناوچەکەدا دەنگی دابۆوە، چووبایتە هەرگوندو دیوەخانێك، باس، هەر باسی

کوژرانی کەلۆس بوو، بەدەستی کچانی ئەشکەوتی دێوان، پیاوان پێ تاسا بوون. هێندەی پێ قرسبوون مەپرسە ، هەروەکو بڵێی: قەباحەتێکیان دەرهەق کرابێ، پێ شەرمەزاربوون، لەو ڕۆژەوە ژنان هێندە گوێڕایەڵی پیاوان نەدەبوون، لەبەرانبەردا پیاوان توندوتیژتر ببوون، بە شتێکی کەم هەنجەتیان بەژنەکانیان دەگرت، ژنەکانیش لەبەر دەمیاندا زیت دەبوونەوە، ئیدی دەبووە شەڕوگاڵەیان. شەڕو ئاژاوەو گێچەڵ و ناکۆکی هەموو ماڵێکی گرتبۆوە، شیرازەی ژیانی خێزانداری تێکچوو بوو. سۆزو خۆشەویستی تێچۆلأبوو، شەو نەبوو بە هۆی شەڕوگاڵە و ناکۆکی نێوان ژن و مێرد، لە سەرتاسەری ناوچەکەدا، ژنان ماڵ و منداڵ ومێردیان جێ نەهێلن. دەچوونە پاڵ کچانی یاخیبوو لە ئەشکەوتی دێوان، نافرەتی سەربەهەوێ ، ژنی ´تالوقەکراو، شۆخە ژنی مێرد پیروکەنەفت، کچە عازەبی بەمارەوتەلأق. لەدەزگیرانەکانیان هەڵدەگەڕانەوە. دەیاندا چیا، پیاوان سەریان لێ شێوابوو، سەرەدەریان لە ئیشوکاری ناوماڵ دەرنەدەچوو، نەیاندەزانی بە چ شێوازێك زارۆك و منداڵی باژەرە ژیرکەنەوە، بەدەستیانەوە گرفتاربببوون. نەدەپرژان کاروباری کشتوکاڵ ومەڕوماڵأت بەناوبێنن، کەسیان بەری بەلای دیوەخانەوە نەمابوو،دیوەخان چۆڵ و هۆڵ بوو، ببووە مەیدانی تەراتێنی مشك و پشیلە، میوان و میوانداری هەر هیچ، بەدەگمەن ئەگەر ڕێبوارێك ڕووی تێکردبان، ئەویش سەت خۆزگەی دەخواست بریا لای نەدابووایە، پیاوان ببوون بە کەیبانووی ماڵ، هەموو شتێك گۆڕانکاری بەسەرداهاتبوو، بەرخەگەل تێکەڵ بە مێگەل بووبۆوە، گوڵکە ساواو سەنگۆ بەرهەڵدرابوون، لە بێ خودانی وبێ سەرو بەرییان، تورگ و ڕێوی جووجەڵیان لەبەر مریشکان نەهێشتبوو، تاقیان لێ بڕیبوون، زەلام لە پیس و پەڵۆخییان پشتەملی کراسیان یەکپارچە قرێژ و ڕشك و ئەسپێ بوو. پوورە سێوە. بەم بێحاڵی و شپرەزمییەی پیاوان زۆر دڵخۆش و شاد

و شەنگۆڵ بوو، دەیگوت: (دەهەڵیگرنەوە دەی، ئەگەر ژن نەبێ.؟! دەتانبینمەوە چتۆ عەگیدو چەلەنگن.. دەبخۆن دەی، عافیەت و بێ، (هەتانەنێن لە تەبەق، ناڵێن: ئەللاهو سەدەق). با لێرە پیاوان بەدەردی خۆیان بتلێنەوەو پوورە سێوەش، لەم خۆشی و شادییەدا جێیان بهێلین، بچینەوە سەروسۆراخی کیژگەلی یاخیبوو لە ئەشکەوتی دێوان.

# (١٢)

هاوڕێ غوربەت وەکو سەرکردەیەکی زیرەك و هۆشمەندو هەستیارو لێهاتوو بوو، زۆر بە ووردی بیری دەرکردەوە، بیری لە هەموو شتێك دەکردەوە،هاوڕێکانی لە شێوەی سەربازی، لە دەستەوگروپ دا ڕێکی خستبوون، هەر دە(١٠) کەسیان لە گروپێکدابوون، هەرگرووپەو سەرکردەیەك سەرپەرشتی دەکردن، هەر گروپەو بەناوی یەکێك ناونرابوو، گروپی نازێ، گروپی پەیمان، گروپی عەیشان هتد... گروپێکیش بەناوی پوورە سێوە بوو، (لەیل) سەرپەرشتی دەکردن، ئەرکی هەر یەکێك لەم گروپانە دیارکرابوو، هەموویان چەکداربوون، کاروپیشەیان ئێشکگرتن و پەلاماردان بوو.. بە مەبەستی دابین کردنی ئازووقە، بەلاّم بێ چەکەکان خەریکی دروستکردنی سەنگەرو ئاوکێشان و چێشت لێنان وبەخێوکردنی ئەسپ و ولاّخان بوون، هێندە جەربەزە ببوون مەپرسە، شەوان سەرە ڕێی کانی و دەراویان لە کاروانچی وقاچاخچییان دەگرت، ڕووتیان دەکردن ،پەلاماری ڕەشماڵ نشینەکانیان دەدا، داوای پووشانەومەڕو ماڵاّتیان لێدەکردن، لە نیوەی شەواندا هەڵیاندەکوتایە سەر گوندییەکان، هەرچی بەدەستیان بکەوتبایە گڵیان دەداوە، هیچ دێومرەیەك بەبێ سەرانە دەرباز نەدەبوو، لە هیچیان کەم نەبوو، بە پێی ڕۆژگارخەڵکی گوندەکانی دەفەری ئەشکەوتی دێوان لە گەڵیان ڕاهاتن، پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵ قاچاخچی و کاروانچییان پەیدا کرد، ناوچەی ئەشکەوتی دێوان ببووە بنکەیەکی بازرگانی، بازرگانی چەك و تەقەمەنی، کوتاڵفرۆش، خەلە فرۆشی دانەوێڵە، جامبازی ولاّخان، هوردەواڵە فرۆش، چەرچی مەڕوماڵاّت، بۆ سەوداو کڕینو فرۆتن ڕوویان تێکردبوو، ئەم سەوداو کڕین و فرۆتنەبوو هێمنی و

نارامی لە ناوچەکەدا خولْقاندبوو، ژیان لێرە لە ئەو پەڕی خۆشی دا بوو، شەو نەبوو، چەندین کچە عازەب و شۆخەژن نەگەنە ڕیزی کیژگەلی یاخیبوو لە ئەشکەوتی دێوان، کچەتیمەکانی ناو ماڵی ئاغاکان بەهەلیانزانیبوو، لە نیوەی شەواندا تێیاندەتەقاند دەهاتنە پاڵ خوشکەکانیان، ئاغاژنەکان بەبێ (کارەکەر)مابوونەوە، شەڕودەك دەکانێ ماڵی ئاغاکانیشی گرتبۆوە، هەردوو ژنە بچووکی زینەڵ ئاغا، چیتر لە وزەیاندا نەمابوو، زینەڵ ئاغا پیاوی چوارژنان بوو، لە دڕوستی چوار ژنان نەدەهات بیانڕەتێنێ، پیاوی شەمامە گۆیاندن نەبوو،بەم حاڵەشەوە چاولەدەر بوو، مۆزە مۆزی دەکرد، هەردووکیان بەدوای هەلێکدا دەگەڕان خۆیان دەرباز بکەن.

# (١٣)

دیوەخان، نەدیوەخانی جاران، جاران ئەگەر ئاغا (...)یەکی لێبەربووایە.! بیست کەس پێکرا دەیانگوت: شفایە. بەڵام هەنووکە لەبەر ئیش و کاری ناومالّ و حەواندنەوەی زارۆك. پیاوان بەریان بەلای دیوەخان نەماوە.هەیەو نیە.! مچەگزیر وجەلۆو مەلای گوندوعەلۆ قاوەچی. ئاغا دوای کوشتنی ڕەحمان کەلۆس کۆستی کەوتبوو، هەردەم مچو مۆڕو ڕووگرژ بوو، لە خەم و خەفەتان لە دین دەرچووبوو، هەر لە بەرە خۆی هۆڕێنەی دەکرد.!

((تەمایەکم بەکەلۆس بوو، ئەویش بوو بە پەندی زەمانە. سەیرە.! کەلۆس فێڵی لە ڕێوی دەکرد ، چۆن ئەوها بەئاسانی کەوتە داوەوە. نازانم. باشە ئەو دەلیسانە لە ژیانیاندا دەستیان بەداری تفەنگ نەکەوتووە ،چۆن جورئەتیان کرد ڕووبەڕووی کەلۆس ببنەوە. ئەو کەلۆسەی منداڵی ناولانکانیان پێدەخەواند..)) هێشتانەکێ لەم هوڕێنانەدا بوو، عەلۆ قاوەچی، بە فنجانێك قاوە هشیاری کردەوە، قاوەکەی فڕکرد، دواتر(قەنە)یەکی داگرت، مچەگزیر پۆلووەکی بۆی خستە سەر قەننەکە، دووسێ جاران بە توندی هەڵیمژی، توتنەکە ئاگری گرت گەش بۆوە. لەگەڵ هەڵمژینی دووکەڵی قەننە گەروی پڕ دووکەڵ دەبوو، چەندجاران لەسەریەکدی کۆخی، پاشان کەکۆخەکە بەریدا، ڕووی دەمی کردە (مەلا) و گوتی:

- لای جەنابتان مەعلومە کە لەگەڵ ئەو تیتك براوانە تێکەوتووین، هەرچەندی تێدەفکرم.! سووڕ دەزانم وا بەئاسانی نایەنەڕایێ، بەلاّم چونکی ئەوانە زەعیفەن، خۆت دەزانی کە زەعیفە ئەقڵی لە کۆشی دایە،

هەرگاوێ هەستێتەوە لێی بەگوڕێ وەردەبێت. ئەگەر هۆتۆ بەم بەڕەڵاییە لێیان بگەڕێین، بەدووری مەزانە پیرەژنەکانیش لێمان هەڵدەگەڕێنەوە، دەیدەنە چیا، سەرم تێدا سووڕماوە، ئەگەر لەشکریان بۆ دەکەم.؟! خودا پێی ناخۆشە، تەگبیر چییە.؟! نازانم. یەکدوو قومی لە قەننەکەی داو ،دەستی پێ کردەوە، مامۆستا تۆ کابرایەکی ئەهلی شەرع. فەرموو جەنابت شەرعی ئەم کێشەیەمان بۆ بکە. لەسەردەستی ئەم پیاوانە، من بە فەتوای تۆ ڕازیم، ملم لە مووەك باریکترە.! مەلا، کەمێك خۆی جوولاند، دەستی بردە بن مێزەری.سەری خۆی خوراند،پاشان سەری باداو،لە پێشە خۆی گوتی. (لاحەولە وەلا قووەتە ئیللاًبیللاً) دواتر پێداچوو.

- ئاغام سەلامەتدار بێ، بەپێی شەرع هەرکەسێك کاری گێرە شێوێنی و نائارامی و پشێووی، یان دووبەرەکی لە وڵات بنێتەوە، جاڕی یاخیبوون بدات. کە دەبێتە هۆکاری خوێن ڕشتن و ئاژاوە گێڕی و پێشێلکردنی دەستوور و کاریگەر بێت لەسەر داب و نەریت و ڕەوشتی باب و باپیران. بێگومان تێکدەرە، بەمەعنای ئەسەح، بە(مرتەد) حسێب دەکرێ.

ئەم جۆرە کەسانە لە ڕۆژی ئاخرەتدا، لەگەڵ مرتەددەکان حەشر دەکرێن، وە بێگومان شەرع.! لە هیچ کاتێکدا ڕێگای بە ئافرەت نەداوەوهەرگیز ڕێگای پێنادات، دەسەڵاتی خۆی بەسەر پیاواندا بسەپێنێ. لەدنیادا، دەسەڵات تەنها ماڧ پیاوە. خیلاڧ شەرعە، ژن بەری مەیدان لە پیاوان بگرێت. بۆیە مادام بەخۆشی نایەنەوە ژێر سێبەری پیاوان. حەز لە بەڕەڵڵایی و یاخیبوون دەکەن.

بە تەسدیق بزانە.! کوشتنی ئەو جۆرە کەسانە گوناح نییە، چونکی بە پێی کردەوەکانیان هەم تاوانبارن هەم گوناحبارن.

.ئاغا لە ڕۆژێکی ئەوها دەگەڕا. بە گۆتەکانی (مەلا) دڵ خۆش بوو، پاشان

گوتی:

- زۆر چاكە مادام وایە هەر خۆم دەزانم چۆن چۆنی قەتل وعامیان دەكەم ..شەرت بێ.! دوودووسێ سێیان بەكەزی خۆیان جەلەبكەم. لەسەر سەكۆی ئەم دیوەخانە، لەبەر چاوی هەمووخەڵكی زەردەشت ئاوا. پرچ و ئەبرۆی سەركردەكانیان هەڵپاچم و ماستیان لەسەری هەڵسووم، پاشان هەرسێ، چواریان لە پاڵ پیرەمێردێكی كەنفت بكەم.

: بەیانی ڕۆژی ئاینده. بە نیازی كۆكردنەوەی لەشكروهاندانی خەڵك، ئاغاو مەلاو جەلۆ سواربوون، گوند بەگوند، دیوەخان بە دیوەخان،، هۆبە بە هۆبەی ڕەشماڵ نشینان دەگەڕان. لە دژی كیژگەلی ئەشكەوتی دێوان.هانی خەڵكەكەیان دەدا. ئاغا بە زمانی ئایین قسەی بۆ دەكردن.!

(برایان، شوكر بۆخوای پەروەردگار، كە ئێمە هەموومان موسڵمانین، دینی ئیسلام، دینەكی هەق و پاكو خاوێن و بێ غەل وغەشە، مەعلومە باب و باپیرانی ئێمە بە زەبری شیروتیر، بە خوێن ئەم دینەیان بۆ ئێمە پاراستووە، بۆیە لەسەر ئێمەش پێویستە كوو پارێزگاری لە چاومان دەكەین .دەبێ بە هەمان شێوە پارێزگاری لە دیانەتی خۆمان بكەین.

: ئاغا، لەگەڵ ئەم قسانە. هون، هون فرمێسكی بەردەداوە،

..براینە ،بێگومان ئاگادارن، كە كۆمەڵێك كچ و ئافرەتی بێ شەرم و حەیا، دایتیانە بەرەڵلایی، خەریكە پێ لە داب و نەریت و ڕەووشتی بەرزی باب و باپیرانمان دەنێن. خەریكن دینەكەمان لێ سووك دەكەن ،دەیانەوێ ڕوو ڕەشی دنیاوقیامەتمان بكەن، دەیانەوێ شەرمەزاری باب وباپیرانمان بكەن، تووشی غەزەبی ئیلاهیمان دەكەن، ماڵی وێرانم لە ڕۆژی هەستانەوە پێغەمبەر(د.خ)لەسەر بێ گیانم بە قوربانی بێ، شەفاعەتمان بۆ ناكات، ئەگەر

لیٚیان بیٚدەنگ بین.؟! خودا غەزەبمان بەسەردا دەباریٚنیٚ، ئاخر ئیٚمەی گۆشت و ئیٚسقان چۆن.؟! خۆمان لە بەر غەزەبی ئیلاهی ڕادەگرین، من خۆ لە خۆمەوە ئەم قسانە ناکەم، ئاماژەی بۆ (مەلا) کرد. گوتی: مامۆستا دەفەرمووێ.! ئەوانە(مرتەددن)خۆ دەزانن مرتەد یانی چی.؟! بۆیە کوشتنیان حەلاڵە، واتا هەرکەسیٚك بچیٚتە شەڕی ئەو یاخیبووانە، هیچ فەرقی نیە لەگەڵ ئەو کەسەی دەچیٚتە غەزای کافران. جا بۆ ئەوەی ئیٚمەش بە ئاگری ئەوانەوە نەسووتیٚین هاتووین لە شکر کۆبکەینەوە، بچین گەمارۆیان بدەین، ئەگەر دەستیان نەدا، پەژیوان نەبوونەوە، داوای لیٚبووردنیان نەکرد.؟! چارمان ناچارە دەبیٚ ڕەشەکوژیان بکەین ئەوەش بزانن. (هەرگەنجیٚك، هەرکەسیٚك لە ڕیزی لەشکردا ئامادەبیٚت ، گفتی پیٚدەدەم، کچیٚك لەو کچە یاخیبووانەی لیٚ مارە دەکەم، هەروەها گفت بە جوامیٚرەکان دەدەم، ئەگەر بخوازیٚ ژنیٚکی لیٚ مارە دەکەم، ئومیٚدەوارم دریٚغی نەکەن، ئەم هەلە پیرۆزە لە دەستە خۆتان نەدەن..) ئاغا لە سەفەری حەفت شەوو حەفت ڕۆژەیدا، بەڵیٚنی لە کۆمەڵیٚك گیانفیدا وەرگرت، چاوەڕوانی فەرمانی ئاغا بوون، بەڵیٚ (ئاغا) کۆتایی بەسەفەرەکەی هیٚنا، بە دڵیٚکی خۆش بەرەو ماڵ گەڕانەوە، بەلاّم ماڵ،چ ماڵ.! ماڵیٚکی ساردو سڕ (بەلقیس ونازلی) هەردوو ژنە بچووکی ئاغا، مالاّواییان لە(هەویٚ) کانیان کردبوو، پاشۆلەك هەڕەشەو گوڕەشەیان بۆ ئاغاجیٚ هیٚلابوو، تفەنگیان کردبووە شانیان وبە نویٚژی نیوەڕۆ، بەرەو ئەشکەوتی دیٚوان هەڵکشابوون، کاتیٚ ئاغا بەمەی زانی ،باریکە ژانیٚك وەکو بروسك بەناو هەناویدا پیٚچی کرد، کووڕی کردەوە.دنیای لیٚ تاریك داهات، لەحەژمەتان لەپاولەپ لەسەر چاوکەوت، چەند ڕۆژان چاووڕووی ئەوەی نەبوو هاتوچۆی دیوەخان بکات. هەتاکو ڕۆژیٚکیان (مەلا) بەبەریدا کەوت، بەهەر حاڵی هەبوو لەگەڵ خۆی هیٚنایە دیوەخان.

# (١٤)

پورە سێوە هەڵچووبوو، لە ناوەندی حەوشەدا دەهات و دەچوو، هەر لەبەر خۆیەوە بڵەمو بۆڵەی بوو، دەیگوت:

(گەمبۆری قورمساخ، ئەوها بەهێنی باوكتدا دەپەرپەنم، لەشكر كۆدەكەیتەوە كافری لە بابێ كافر، دەچتە غەزایێ لەشكر كۆدەكاتەوە، چمە غەزاكردن هەومنتەیە، كەی كافروغەزایان گوتووە.؟! هەی گەلۆری مالۆس، بەقوربانی دەلینگە دەرپێی ژنەكانت بی، ئەگەر ژن نەبان.؟! ڕشكو ئەسپێ دەیخواردی، گرووی بۆگەنی پیس وچەپەڵ شەرمێ ناكات لەشكر كۆدەكاتەوە، كسۆكی لە بابێ كسۆك، خۆم دەزانم بە چ قەباحەتێك لە ناوی دەبەم، سەبرم لێبگرن، شەرت بێ دەبێ گوندبە دەری بكەم، وابێ لە شاران بە زگ بدات). پاشان سەرپشتی لێبەستا، كۆچانەكەی بەدەستیەوە گرت، بەلەقەلەق ڕۆیی ،هەر لەدەرگای حەوشەوە بانگی كرد.!

- ئەختەر، كچم ئەخنەر.

:ئەختەر، هاوسەری(مچەگزیر)بوو، ئافرەتێكی ڕەوشت بەرزو ڕووخۆش بوو، دەمی تەقەت بوو.

- بەڵێ، بەڵێ پوورە سێوە بەخێربێ ی فەرموو.

- وەرە كیژم وەرە، نازانم لۆ ئەورۆكە دڵم هێندە سوارە.

- گوێی شەیتان كەڕ بێ پوورە سێوە وامەڵێ.

- ئەدی كوو كیژم، چمە نەتزانیوە ئەم ترۆی ئابرووتكاوە، لەشكری كۆكردووتەوە بەنیازە ڕەشەكوژیان بكات، بێنە بەرچاوت ئەو گەڵەگورگە بكەونە

ناوکۆزی کاریلان چیان بەسەر دێنن.؟! ئەدی ڕۆڵە، ئەگەر هەرلە ئێستاوە لێیان بەخۆنەگەوین، دەستی خۆیان دەوەشێنن، واتا دەبێ بەرلەهێرش و پەلاماری ئەو گورگانە دەستبەکاربین، ئەگەرنا هەرمن دەزانم، گورگ چەندە برسی و چاوچنۆکە، نەخاسمە بکەونە ناو کۆز، هەندێکیان دەخنکێنێ هەندێکیان بریندار دەکات، کامەی قەڵەوو دوونگ زلە، ئەیداتە پێشە خۆی لە دۆڵێکا لە شیوێك لە عاردی دەداهەتا لێی تێر دەبێ دەیخوات،پاشان هەر لەوێ بەجێی دێلێ. کیژم ئەو بێ دین و بێ ئیمانە، لەوەتەی ژنەکانی ڕەویانکردووە، وەکو گورگی بەچکەی لێ دزرابێ، هاروهاج بووە، هەرچی بکەوێتە پێشی هەڵدەدڕی. ئەو گاوربابە، دەستی بەسەریاندا بشکێ. بەمەمکی خۆیان هەڵیاندەواسێ.

- باشە پوورە سێوە ئێمە چیمان پێ دەکرێ.؟! هەتاکوبەر پەرچیان بدەینەوە.؟!

- خۆ ئەگەر هیچمان بۆ نەکرێ، دەتوانین ئاگاداریان بکەینەوە، باهشیاربن، وریای خۆیان بن، وانییە.؟!

- بەڵێ وایە.

- کەواتە دەکرێ یارمەتیان بدەین.

- چۆن داپیرە.؟!

- تۆ گوێ لە داپیرەی خۆت ڕاگرە، تەگبیرم کردووە، ئێستا پێت دەڵێم چۆن یارمەتییان بدەین.هۆشت لای من بێ.

(مچە)ی هاوسەرت، شەوان ئێشك لە ڤینگی ئاغا دەگرێ. بۆیە شەوان بەری بەلای تۆوماڵەوە نییە. بێگومان بەیانییان، نەخێر چێشتەنگاو.هەتاکو ڤاوەڵتی بە چەلاوی بەر ماوەی ئاغا نەکات.ڕوو لە ماڵ ناکاتەوە. وانی یە.؟!

- بەڵێ وایە.

- کەواتە ئەگەر تۆلە خۆت ڕادەبینی جەسارەت بکەی، دەتوانی یارمەتییان بدەی بەمەرجێك.؟! هەموو شتێکت بۆ ئامادە دەکەم بچی و بێیتەوە (مچە)پێی نەزانێ گوتت چی.؟!

- باشە پوورێ ئەگەر سووڕ بزانم ئەم سەفەرەم لێدەبێتە سەفەری مەرگ هەردەچم.

- دەمخۆش بەختەوەرت کردم، خودا بەختەوەرت کات ڕەبی بێوەی بی کیژم.. کچەکەم گوێبگرە.! دوێنێ بەکوڕەکوڕ چوومە ئاقاری هۆلەهەورازئاوایی، لەدەم ڕێگای ئەشکەوتی دێوان یەك (پشتی)یە خرنوك وچیلکەو سورناتکم خڕکردەوەبە گوریس جوان پێچاومەتەوە هەرلەوێنەرێ بە جێم هێشتووە..

: قسەی پێبڕی، بەنەرمە پێکەنینەوە پرسی.

- باشە پوورێ. ئەو پشتییە خرنووکەت بۆ چییە.؟!

- کیژم حیسابم بۆی کردووە. پاشان تێت دەگەیەنم بۆ چییە.؟!

- جاکە شەو ڕاکشا، دەچمە دزی. خۆم دەگەینمە تەویلە و ئەسپە شێیی ئاغا دەدزم. ئەسپە شێ قابیل بە غوربەتخانە، کە ئەسپە شێم هێنا تۆ لێ سواربەو بڕۆ، بۆیە تۆ دەبێ ئەمشەو بێدار بی نەخەوی، نەبادا ڕیسمان لێبکەیتەوە بە پەتە.!

- نا.. پوورێ. دڵنیابە.

- پوورێ بەلانك ژمنت بێ.. ئەوجا کە گەیشتیە ئەشکەوتی دێوان، هوردو باریك قسەیان بۆ بکەتێیان بگەێنە، با هشیار بن.وریای خۆیان بن، خۆیان قایم کەن ‹با هەر لە ئێستاوە خۆیان ئامادەو تەیارکەن نەبادا لە کتوپڕی بەسەریاندابدەن و گەمارۆیان بدەن.پێیان بڵێ پوورە سێوە دەڵێ.!

با لە بەرزاییەکان خۆیان داپەزرێنن، ئەگەر بەرزاییەکانیان لێبگرن، دەست وەکەریان بۆناکرێ ناتوانن سەردەرێنن و بێنە پێش پێیان بڵێ: هەرتێفی هەوەڵیان زەحمەتە، تاکو هێرش بەران دەشکێن، کەشکان.! خۆیان ناگرن، کەسیان نابێتە برای کەس، ئیدی سەریان لێدەشێوێ شپرزە دەبن، هەر بابایە هەوڵدەدات خۆی قوتار بکات. کە گەڕایتەوە ئەسپە شێ، بۆ غوربەت خان بەجێ بێلە،پێی بڵێ:ئەوە دیاری پوورە سێوەیە بۆتو باشە..! کەگەڕایتەوە،بابەکێکیان، دووانیان بەسواری هەتا نزیك پشتییە خڕنووکوکە لەگەڵت بێن، پاشان بابگەڕێنەوە. ئەوجا باپێت بڵێم، ئەو پشتیە خڕنووکەم بۆ چییە!؟ کچم ئەختەر دنیایە ئەگەر دواکەوتی ڕۆژت لێ هەلات، پشتییەکە لەکۆڵە خۆت هەڵدە،هیچ خۆت لە گورە مەبە،هێدی هێدی وەرەوە بۆ ئاوایی دەزانی بۆ.؟! چونکی سبەینێ دەبێتە هەرا.چییە.؟! ئەمشەو ئەسپە شێ دزراوە دڵنیابە، بەهۆی ئەم پشتییەوەکەس گومان لە تۆ ناکات،بێ ترس بە تێگەیشتی.؟!

- بەڵێ،بێ خەمبە پوورێ.
- زۆر چاکە، هەروەکو پێمگوتی. بێداربە،ڕیسمان لێنەبێتەوە بەپەتە.
- پوورێ ، پێمگوتی:دڵنیابە.

شەوبالی ڕەشی بەسەر ئاوایی زەردەشت ئاوادا کێشابوو، پوورە سێوە هەستی خۆی ڕاگرتبووشەوێکی کشومات، بەهێواشی بەپەنادزە لەم بن دیوار بۆ ئەو بن دیوار دزەیکرد، خۆی گەیاندە تەویلە، بە ئەسپایی دەرگای تەویلەی لە ڕێسمە برد. بۆلای ئەسپە شێ خشی، ئەسپە شێ گوێی مووچکردبۆوە بەنامۆیی دەیڕوانییە پوورە سێوە، پوورە سێوە چنگی لە گیرفانی کەوای ڕاکرد گۆڵمەك خوێی دەرێنا، بە شێنەیی لێی چووەپێش لەپی دەستی بۆی واژیکردەوە، دەستی بۆ درێژکرد، ئەسپەکە سڵەمیەوە، پاشان بە فیکەفیك هێوری کردەوە،ڕام بوو،

لەپی دەستی بۆ ڕاگرت خوێی ناو لەپی دەلێستەوە. پوورە سێوە چاوی بەملاونەولادا گێڕا(قەشاویش) لەناودەلاقە دانرابوو، دایگرت، لەسەرخۆ جوان قەشاویشی کرد، هێدی هێدی دەستی بەسەر لمۆزو بژویاڵ و کەفەڵی دادەهێنا، تەواو دەستەمۆی بوو. زین و لغاوی ئەسپە شێ لەقەد دیوار بەسنگێکەوە هەڵواسرابوو، پوختەو جوان زین و لغاوی کرد. پاشان لە دەرگای تەویلە سەری بردە دەرەوە، تەماشای ئەملاونەلایکرد، هیچ لە ئارادا نەبوو دڵنیابوو، دواتر چوو هەوساری ئەسپە شێی گرت و بەشێنەیی ڕایکێشا بردیە دەرەوە. بەرەو ماڵی ئەختەر ڕۆیی، هێشتا مابووی بگاتە بەر دەرگای حەوشە ئەختەر، بە ئەسپایی دەرگای کردەوە ،دەمامکی خۆی دابوو، گورج و گۆڵ و چوست خۆی تەیار دابوو. (داسووك)ەکیشی بەدەستیەوە گرتبوو. پوورە سێوە زۆر پێخۆشحاڵ بوو، بەلأم سەری لەم داسووکە سوڕمابوو، بۆیە لێی پرسی؟

- ڕۆڵە ئەختەر، ئەم داسووکەت بۆ چییە؟

- پوورە سێوە، کێ دەڵێ ناکەومە بۆسەی دوژمنان.؟! ئەگەر بەسەلامەتیش گەڕامەوە، وابزانە چوومەتە داران بەم داسووکە، پشتییەك خڕنووك و حوشترالوکم کردووە. پورە سێوە لە خۆشیان هەرهەندەی بۆکرا.! هامێزی تێوەرینا ماچی کرد، دواتر ئەختەر پێی چەپی هاوێتە ناو ڕکێب و لە خۆی هەڵدا سەر زین و پشتی ئەسپە شێ، ڕێشمەی ئەسپەشێ هێشتانەکێ هەر بەدەستی پوورە سێوەبوو.چەندجاران سوورەتی (قل اعوذ)ی. بەسەردا خوێند، ئەمجاجلەوی ئەسپی دایە دەست ئەختەرو پێی گوت:

- تاکو لە ئاوایی دەربازدەبی، لەسەرەخۆ لێخوڕەهیچ خۆت لەگورەمەبەو، ئەسپەشێ تەنگەتاوەمەکە ئیدی دوعای بوونی خواست و بە ڕێکەوت ڕۆیی. تاپەڕگەی ئاوایی، کەلە تاریکی شەودا نقوم بوو، پوورە سێوە سەیاد بوو ، کەلە

ترس دەرچوو. ئاوزەنگی لە تەنگەی ئەسپی تاین دا، بەیەلغار بەرەو ئەشکەوتی دێوان سەری هەڵگرت، ئەختەر، بەختی یاربوو، هەرچەندە سەر لە هێواریٚ ئەنگوستەچاوبووبەلاٚم مانگ سەبرۆکە سەبرۆکە لە پەنا کێوان گەردەنی هەڵدەکێشا، ڕێگای سەفەری لە پێش ئەختەر ڕۆشن دەکردەوە، ئەخێرکردیە هەیوە شەوێکی خۆش.. ئەختەر لە دەروونەوە. ئاهێکی ساردی هەڵکێشاوبەخەیاڵدا کەوت.! (ئەوها مانگە شەو بوو، کیژوکوڕانی ئاوایی، لە(کاکێشان)بووین لەگەڵ( سمکۆ)خۆمان دزییەوە، چوینە ناو (لەودەگای) مامەحەمە. یەکەمجاربوو ڕازو نیازی دڵی خۆمان بۆ یەکدی درکاند. ئای کە شەوێکی خۆش بوو، هەرخۆم دەزانم چەند بەختەوەر بووم، ئای کە ڕوح سووك و شیرین گفتارو داوێن پاك و بەدەستنوێژبوو، دەستەخوشکەکانم ئیرەییان پێم دەبرد، کەبۆ سەرگین و تەپاڵە کۆکردنەوە دەچووینە دەشت ودەر، هەر بۆ گاڵتەو خۆشی شەڕیان پێم دەفرۆشت دەیانگوت:

((قەحپەی سەرکز، دەستەگوڵی خۆت لێداوە، سەرتۆپی کوڕانی زەردەشت ئاوات، گرفتار کردووە))منیش هەر بۆ دڵخۆشی دەستە خوشکان و تووڕەکردنی (غوربەت) دەمگوت:خوشکێ، خۆشەویستی خەوش نییە، خۆمارەبڕی (حەمەبۆر)نیم، سنگم بۆ داکوترابێ. غوربەت شێت و هار دەبوو، هەزار قسەی سووك و چروکی دەگۆتمێ، من خۆم لە گورە نەدەبرد، کیژگەل لە قاقای پێکەنینیان دەدا، چەند خۆش بوو، پاشان نازێ پلی دەنایە گەردەنی بالۆرەی بۆمان دەچڕی، دەنگی هێندە ناسك و بەسۆزو خۆش بوو، شوانەکانی سەراسیمە دەکرد زۆر جاری وادەبوو، بەسەدای(نایەوبلووروشمشاڵ)وەلاٚمیان دەداوە. ماڵی وێرانم مەرگ زوو دەستی نایە بیناقاقای سمکۆ، هەموو ئەو خۆشیانەی پێم

تفاندەوە ئەلحەقەخۆ(مچە)ش، ڕۆحی لەو جێیە کە من پێی لێدادەنێم، هێشتانەکێ لەگوڵ گرانتری پێنەگوتووم..

هێشتا لە دەریای خەیاڵدا بوو، ئەسپی تایین فرماندی ولەجێوە چەقی ،هەردوو گوێچکی مووچکردەوە، جوولەی نەکرد، ئەختەر، پێ حەسیا، زانی کە ئەسپە شێ هەستی بە شتێکی نامۆ کردووە، جائەو شتە ئینسان بێ، دڕندە بێ، هەرشتێکی دیکە بێ، چونکی ئەسپ و ماینی ڕەسەن، هێستر شەوان زۆر هەستیارن، لە فڕکەی باڵی چۆلەکەو باڵندە دەسڵەمێنەوە. هێشتانەکێ لەلێکدانەوەدابوو، لەگەڵ دەنگی خڕمژنی باقە نەجمەی تفەنگ، لەسەر پشتی ئەسپ ڕاچڵەکی، دوو چەکدارگەمارۆیان دا؟!

- نەبزووی، هەربجوولێی کوژراوی.!

: دەنگی ناسکی(مێینە) هیوای پێ بەخشی، زانی گەیشتووتە سنووری کچانی یاخیبوو، هیچ خۆی شێلونەکرد، هێمن و ئارام چاوەڕوان بوو بزانی سەرەنجام بەچی دەگات. عەیشان، بەپارێزەوە لێی چووە پێش، لوولەی تفەنگی ئاراستەی کردێ و پرسی؟

- تۆ کێی..؟! چکارەی.؟! هەتاکو ساردم نەکردیەوە زوو خۆت ئاشکرابکە.؟!

- دۆستم، ڕاسپاردەی پوورە سێوەم. هاتووم بۆلای غوربەت. زۆر بەپەلەم .بەڵکو ڕێگەم نیشان دەن، چونکی دەبێ هەر بەم شەوە بگەڕێمەوە.!

- کەوایەخۆت بۆمان ئاشکرا بکە.!

- من ئەختەرم، هاوسەری مچەگزیر، لەگوندی زەردەشت ئاواوە هاتووم.

:عەیشان ناسییەوە، بەلام بە ئەنقەست خۆی لێنەناس کرد، گەرەکی بوو هەروا بەئاسانی تێنەپەڕی، نیشانی بدات کە ژنان لەبەکارهێنانی زەبروزەنگ. هیچیان لە پیاوان کەمتر نییە. بۆیە بە هاوڕێ (خەجۆ)ی گوت: بیپشکنە. !هاوڕێ

خەجۆ خەڵکی گوندەکانی ئەو دیوی خواکورك بوو، لەرگی باوك و برای، گەرەکیان بووە بەزەبری نوکی خەنجەر لە کێخوای گوندی مارەبکەن. کێخوا خودانی سێ (٣) ژنان بوو، بۆیە شەوێکیان قەڵەمبازی دابوو. هاتبووە ئەشکەوتی دێوان، خەجۆتێی ڕاخوڕی.! دابەزە. بەهێواشی دابەزی.هەمووگیانی پشکنی، جگە لە داسووك، هیچی دیکەی پێ نەبوو، عەیشان هەر بۆخۆشی پێی گوت:

- ژنی مچەگزیر و ڕاسپاردەی پوورە سێوە، زۆر لێکدی بەدوورن، بەپەسندی نازانم، کێ نالێ تۆ، بەکرێگیراوی ئاغاوپیاوانی گوندی نی.؟! هاتووی بەزمانی پوورە سێوە دەدوێی. لەم قسانەدابوو، ئەختەرعەیشانی ناسیەوە، لە تریقەی پێکەنینی دا پێی گوت:

- هەی قەحپەی ڕەدوکەوتووی ئۆین باز، ئەوە خۆت لێم کردووە بەنەناس. گوایە نامناسیتەوە. ئەدی ئەو ماکەرە کێیە.؟ دەڵێی: جەندرمەی تورکە، خەریك بووزگم هەڵدڕی. :دواتر هامێزیان تێکومرێنا، یەکدیان لەباوەش گرت. لەخۆشیان گریان لە هەوکیاندا مابوو، ماوەیەك بەیەکەوە هەژانەوە ،پاشان ئەختەر گوتی:

- عەیشان، دەبێ هەر ئێستا بگەڕێمەوە، چونکو نابێ کەس پێبزانێ کە من هاتووم بۆ ئێرە. هەتا زووە دەبێ چاوم بە غوربەت بکەوێ. عەیشان دەستێکی لە دەستی ئەختەردابوو، بەدەستەکەی دیکەی هەوساری ئەسپە شێی گرتبوو، بۆ لای هاوڕێ غوربەت کێڵبوونەوە، ئەختەر دیقەتی دابووێ ،لەمبەر ئەوبەری ڕێگا سەنگەریان دروست کردبوو، دەگەیینە ئاستی هەرسەنگەرێك ئێشکگر، دەنگی دەدان.! عەیشان بەوشەی (دۆست)وەلآمی دەدانەوە، پاشان بواریان پێ ئەدان فەرموو بڕۆن. هەرکە لە دەروازەی ئەشکەوت نزیکبوونەوە،دوو ئێشکگر ڕاوەستابوون. عەیشان. ئیزنی لێخواستن.! تەتەرە، دەچینەلای هاوڕێ غوربەت، وەپێی گوتن ئەم ئەسپە ئاو بدەن، ئالیکی لەپێش ڕووکەن، چێشت لێنەرەکە

ئاگادار بکەنەوە، میوانمان هاتووە، باخواردنێکی سووك وسەرپێیی ئامادەبکات. پاشان چوونە ژووری ئەشکەوت، هاوڕێ غوربەت، لە نێوەندی ئەشکەوت لە پێش ڕۆناکی چرا،دەهات و دەچوو. کە چاوی بەئەختەرکەوت، لە خۆشیان شاگەشکە بوو، هامێزی لێوەرینا توونی لەباوەشی خۆی گرت، یەکدیان ماچ دەکرد، ئەسرینیان بەسەر یەکدی دا دەباراند، پاشان دانیشتن. دوای کەمێك پشوودان، ئەختەر هاتەگۆو گوتی:

- غوربەت، پوورە سێوە، سلاّوو ڕێزی هەیە بۆ هەمووان ڕایسپاردووم. پێتان ڕابگەیەنم. ئەو تەرەسەبەمەبەستی کۆکردنەوەی لەشکر، ئاواییەکانی دەور بەر گەڕاوە، لە پەنا پەردەی ئایین، لەشکرێکی زۆری کۆکردۆتەوە، وا خەریکن خۆیان ئامادەکەن، بۆ هێرش وپەلاماردان. گوتی: باوریای خۆیان بن. لەبەرزاییەکان سەنگەر دابمەزرێنن، خۆیان قایم بکەن، نەکەن دەستیان لێبپارێزن، ڕاستە لەشکرێکی گەورەیان ئامادە کردووە، بەلاّم لەشکرێکی بێ سەرو بەرە، هەروەکو دەڵێن (زۆری زلۆلە)هیچ نییە. هیچیان بۆناکرێ. چونکی ئەوان دێن دەستدرێژی بکەنە سەر نامووس و کەرامەتتان. بەنیازن هەر سێو چوارتان لە پیرە مێردێکی قۆتڕ مارە بکەن. ئەو گەمبۆرە، لەوەتەی ژنەکانی دایتیانەچیا، وەکو کوندەبەزەهری لێهاتووە، لەحەژمەت ژنەکانی وەکو(مار)ی بریندار پێچ دەخواتەوە خەڵکی لێتان هانداوە، پیاوەکانیش لەبەر بێ کابانی، لە ماڵ و حاڵی خۆیان بێزار بوونە، خوێن بەری چاوی گرتوون، لە پێستی خۆیاندا بوونەتە درندەی برسی، بەچکەی خۆیان تێکدەشکێنن دەیانخۆن. ئەم هەسپە، هەسپەشێی ئاغایە، پوورە سێوە بە دیاری بۆتۆی ناردووە، گوتی: ئەسپێکی ڕەسەنە، قابیل بە غوربەتخانە، ئەسپی ڕۆژی تەنگەتاولێقەومانە، زۆری ئاگالێبی لەدەستەخۆی نەدات. غوربەتگیان. من کارم تەواو، ئەوەی پێم ڕاسپێردرابوو پێمگوتن. دەبێ

هەتازووە بگەڕێمەوە. نەبادا مچەی هاوسەرم پێبزانێ. عەیشان بەپێكەنینەوە گوتی:

- مەترسێ. مچەهەتا بەرماوەی ئاغا تام نەكات ناچێتەوە ماڵ چونكی بڕی بەخوانی خۆی ناشكێت. هەرچوارییان لە قاقای پێكەنینیان دا دواتر هاوڕێ غوربەت گوتی:

- ئەختەرخان، سوپاست دەكەین، سلاّوو ڕێزمان بگەینە پوورە سێوە، دەستەكانی ماچ دەكەین، سوپاسی ئەم دیارییە بەنرخەی دەكەم، پێی بڵێ ئامۆژگاری و ڕێنمایەكانی بەسەر سەروسەرچاو جێ بە جێ دەكەین، بەپشتیوانی خودا بادڵنیابیت، لەشكری بەدكاری ئاغا بەدەردی ڕەحمان كەلۆس دەبەین، بائاسوودەو بێخەم بێ. هێشتانەكێ شەو وەبەریەوە مابوو، سێ سوار ئەسپ، لەبستۆی چیا، هێدی هێدی بەنشێودا شۆڕبوونەوە ڕێگای خۆڵە پۆكیان گرتبووەبەر، بەتووندی ئەسپەكانیان لێدەخوڕی. ئەسپەكان ڕەوهان وخۆشبەزبوون، لەدوای خۆیاندا باریكە تۆزێكیان لەژێر سم و ناڵیاندا جێدەهێشت، وەكو گەردەلوولۆكە بەئاسماندا هەڵدەچوو.. شەوێكی كشومات بوو، ناوەناوە لە هیكەوە تووشیان بەڕێوییەك دەبوو، لە ڕێگا بەدوور دەكەوتەوە، چاوی كووسكە كووسكی بوو.

: بێگومان لەدزینی جوجەڵەو مراوی خواردن دەهاتەوە، هی واهەبوو هێندەی گۆشت خواردبوو. پاشان لەحەژمەتی ژانی زگی و زەحمەتی ڕیتن ویقەویقی بوو دەیویقاند، دەنگی دەگەییە كەشكەلاّنی فەلەك. عەیشان لە تریقەی پێكەنینی دا گوتی:

- ماڵ بێ كابانە، ئەم مرادار خۆرەش هێندە برسی و چاوچنۆكە، هەرلف دەكات. پاشان لەبەر ئێشوئازاری زگی پڕهەڵماو قەبزی. دەیكاتە ویقەویق و

لوورانەوە. سەگ و تولە لەخۆی بەئاگا دێنی. گیانی دەکەوێتە مەترسی. ئەختەر پێکەنی گوتی:

- بەلاَم سەگەکان هەستیان بەدابڕانی کابانی ماڵ کردووە، بۆیە ساردبوونەتەوە، وەکو جاران سەرەونابەن. خەجۆ لێی وەگرتەوە گوتی:- خودای دەکرد، حاجی لەق لەق دەرپێ و شەرواڵی بۆیان نەدەهێشت، چونکی پیاو تەنها لە ئاستی ژنان دا زمان شرو بەزەبروزەنگن.

: لەم باس و خواسانەدابوون. ئەختەر هەڵوێستەیەکی بە ئەسپ کرد، ئەسپ سەنگرایەوە،گوتی:

- ئازیزان، دنیا تاریکوڕوونە، واگەیشتینەوە ئاقاری گوندی زرەردەشت ئاوا. ئەنگۆ، لێرەوە بگەڕێنەوە. ئەنجا بەخۆی دابەزی، جڵەوی ئەسپەکەی لە تەنکێش ئەسپی خەجۆ گرێدا، فەتارێکیشی کرد، وێردی سەلامەتی بەسەریاندا خوێند. ئیدی ئەوان چەورمیان کرد بەرەو ئەشکەوتی دێوان گەڕانەوە. هەتاکو لە پێش چاوی بزربوون، هەرتەماشای کردن، پاشان بۆلای پشتییە خڕنووکی پوورە سێوە خشی. چۆکی گەیاندە عەردی، پشتی خۆی دا پشتییە خڕنووکەکە ئەم گوریسەی پشتییەکەی پێ پێچرابوو، سەرێکی هاوێتە سەرشان و لاملی ڕاستەی سەرەکەی دیکەی خستە بن هەنگڵی چەپەی، هەردوو سەری گوریسەکەی، لەسەر سینگی گرێدا، دواتر تەکانی دا بەرخۆی هەستاوە، پشتییەکەی کردەکۆڵی. هێدی هێدی بەهەنگاوی هوردهورد لەسەرە خۆ بەرەو ئاوایی کەتەڕێ: پوورە سێوە، بەدرێژایی شەو بێداربوو،خەونەچووبووە چاوی،وەك ئەوەی(کێچ) کەوتبێتە کەولی پێیەکی لە دەرەوە بوو، ئەوەکەی دیکەی لە ژوورەوە بوو هەرچاوە چاوی بوو،کاتێ کە دیتی ئەختەر بەخۆی و بە پشتییە خڕنووکەوە هاتەوە.! شوکرانەی خوای کردو، ئۆخەی خۆ بەبێ (وەی) گەڕاوە. هەرکە گەیشتەوە ناو ئاوایی.

تەقەتەق و دەنگە دەنگی پێرەژنان ،لەهەندێ ماڵ و حەوشاندا دەبیسرا. باش بوو کەس بەدەرەوە نەبوو، دەرگاکان سەر لە هێوارێوە چۆن کلۆم درابوون، هێشتانەکێ شمشێرەیان هەر ڕەپێش بوو، بەنەسپایی دەرگای حەوشەی کردەوە چووە حەوشە، پشتییەکەی لە نزیك ناندین دانا، گەڕاوە دەرگای حەوشەی پێوەداوە. کەمێك پشووی دا.دواتر بەتەڕ دەستی دوو جامیلکە ئاردی لە (کەندوو) دەرکرد، کردیە هەویر، ئاگردانی ئاگردا، کتلی چای لە ڕەخ ئاگردان دانا و بە کەمالی ئیسراحەت دەستی کرد بەنان کردن.

# (١٥)

قووقەقوکی کەڵەشێرو قۆڕەقۆڕی مانگاوگوێرەکەو سەنگۆو، زەڕە زەڕی نێرەکەرو لووشەلووشمی هێستر، مچەکزیریان لەخەوکرد. ناچار لەجێوە نیوە ڕاست بۆوە، دەموچاوی خۆی هەڵپشافت. لەبەر خۆی بڵماندی.!

(سەری خاوەنتان بخۆن، تازە چاوم گەرم داهاتبوو لەخەوتان کردم، هەی دوواتان بڕێ. خەو لە ئێمەمانان حەرامە، دەبێ خودا پێداوەکان تێروتەسەل بخەون، ئێمە بە قۆڕە قۆڕی زگی برسی نێلین مێش لەخەویان بکات، دەبێ نۆبەت لەسەروەت و سامانیان بگرین)، دواتر بەشلوخاوی هەستاوە، هەروەکو عادەتی بەیانییانی پێشوو بەرەو (کادین) ڕۆیی، تەریسەکی پڕکا کرد، لە کۆڵە خۆی هەڵدا بردی لەپێش دەرگای تەویلە داینا، ئەمجار گەڕاوە چوو لە (ئەمبار) یەك قەزناخ جۆی لە گوشەکی کرد، لە پشتە خۆی هەڵدا، هێنای لە تەنیشت (کا)یەکە داینا، چوو دەرگای تەویلەی کردەوە هێسترەکان لووشماندیان، کاوجۆی لە ئاخوڕ رووکرد، هێسترەکان لوزیان تێنا لەلووشمەلووشم کەوتن. ئاخوڕی ئەسپە شێ بە تەنیا بوو، چاوی گێڕا، ئەسپ دیار نەبوو،چاوی بەشوێن زین و لغاوی ئەسپی تاین دا گێڕاسنگێکی ڕەق وڕووت مچرکی بەلەشی داهات، لە ترسی زینەڵ ئاغا پێی عاردی نەدەگرت، هەرلەبەرە خۆی دەیگوت.! (ئەی هاوار بەماڵم ئەو زاڵمە شیری مەمکی دایکم پێدەتفێنێتەوە، تووشی داوی ئەم بێ مروەتە بووم، ئەوەنەو ڕۆژە بوو کە لێی دەترسام، وا بەئاسانی لێی قوتار نابم، نازانم سەری خۆم لۆ کێندەر هەڵگرم. هەی،هەی لە خۆم، ئێستا خەبەری بدەمێ، بڵێم.! ئەسپە شێ دزراوە وەکو (گا) بەسەرمدا دەقۆڕێنێ. ڕق و کینەی هەردوو ژنەکەی بەمندا دەڕێژێ)

(مچە) گێژو هورپببوو، ناچار بەلنگە لەرزە ڕۆیی چووە پێش دەرگای ماڵی ئاغا، دەستی بڵند کرد لە دەرگا بدات، ترسا، ترس غەلەبەی لێکرد، دەستی شل بوو، دەستی بەخۆیدا شۆڕ کردەوە، ئەوەندی بیری لێکردەوە، نەخێر تروسکاییەك بەدی نەدەکرا، دیسان دەستی بڵند کردەوە، ناچار بەئەسپایی دای لەدەرگا، سێ چوار جاران، لەسەر یەکدی دەرگای کووتی. ژنەگەورەکەی ئاغا هات دەرگای کردەوە.

- ها، مچە، خێرە بەم سبەینەزووە دەرگات لێمان گرتووە.؟!

- بڵێم چی.؟! ئاغا ژن کووا خێرماوە.

- دەبڵێ بزانم چی ڕوویداوە؟!

- دەڵێم: ئاغا بەئاگایە، یان هێشتا خەوتووە.؟!

- ئەی قوڕ بەسەری خۆت و ئاغات، ئەگەر خەوتوبێ هەر بەئاگایە خەوی چی.. دەبڵێ بزانم بۆ دەپرسی.

- باشە، نازانم کوو، پێی بڵێم: ئەمشەوئەسپە شێ دزراوە.!

-کورە هەش بەسەر شتی وانەڵێی، ئەم پیاوە لەم ڕۆژەوە ژنەکانی ڕۆیشتوون، دین و هار بووە، چمە ئێمە جورئەت دەکەین بیدوێنین. های، های هەنووکە بزانێ ئەسپە شێ دزراوە. بەیەکجارەکی هاروهاج دەبێ، بەدەشتێ دەکەوی لەودیوی ژوورەوە شیڕاندی .!

- ئەوەچ مشتومڕو گاڵەگاڵتانە بەم سبەینە زووە، خۆ هێشتان شەیتان لەخەو هەڵنەستاوە، ئەنگۆ دەمتان تێکناوە، هەی خودا لەناو دەمودات..) مچە بەهێواشی چووە بەر دەمی ئاغا ڕاوەستا، چاوی لەعاردی نابوو، ئاغا زۆر تورەو تۆسن بوو، پێی گوت:

- مچە، حەوسەڵەی قسانم نییە، ئەگەر خێرە.؟! ئەگەر شەڕ.؟! هەرچی ڕوویداوە، بەبێ خۆگنخاندن پێمبڵێ و تەواو، تێگەیشتی.؟!

- بەڵێ قوربان تێگەیشتم، ئەوەی ڕاستی بێ، ئەمشەو ئەسپە شێیان دزیوە،

- دەك ملت بشكێ لەگەڵ خەبەری بۆ منت هێناوە، بڕۆ بەرچاوم چۆلكە دەی..نا اهەر ئێستا بڕۆ (حەمەشوون هەڵگر)م بۆ بانگكە بێتە ئێرە، یاللە سكتر بە دەی.

# (١٦)

پوورە سێوە دەستی خۆی بە پێش مچەخست، خۆی گەیاندە ماڵی (حەمە شون هەڵگر) بە گوێی دا چرپاند؟؟!

- کوڕم حەمە، بەم پرچی سپی هاتوومە دەرگات، خۆم هاوێتە سەر بەختی تۆ، ئەگەر بزانی.؟! ئەوە کەم نییە.

- پوورە سێوە، تێت ناگەم، پێمبڵێ بزانم چت لێ قەوماوە.؟!

- کوڕی خۆم، تۆ کابرایەکی شوون هەڵگری، لەکارەکەتا زۆر بلیمەت و شارەزای، لەسەرداروبەرد ، لەناو ڕووبار، شوون لە تۆ بزر نابێ، ئەگەر کابرای دز(قرڕژە ڕەشکە)ش بە شوێن پێی خۆیدا وەر بکات.! دڵنیام کە تۆ هەرگیز لێت تێناچۆڵێ سەرچیخ ناچی، گوێبگرە کوڕم.! ئەمشەو ئەسپە شێی ئاغا دزراوە بێگومان ئاغا بە دواتدا دەنێری تاکو شوونی کابرای دزەو ئەسپە شێی بۆ هەڵگری، بەکوڕی خۆم بڵێم: کارێکی وا مەکە لە پاشەڕۆژدا بەگران لەسەرت بوەستێ .

- پوورە سێوە تێناگەم. نازانم لەبارەی چییەوە قسان دەکەی.؟!

- هەنووکە پێت دەڵێم.. ئەمشەو ئەسپەشێ دزراوە، واتا تاوێکی تر، دەست دەکەی بە شوون هەڵگرتن، ئاگادار بە خەڵکی ئاوایی تووشی بگرەو بەردە نەکەی، شوون نەبەیتە بەرقاپی هیچ ماڵێك. هەر لە دەرکی تەویلەوە پێ بەپێ ، ڕاست برۆ لە ئاوایی برۆ دەرێ. .لەوە بەولاو بە ئارەزووی خۆت، بۆ کوێی دەبەی ببە. ئەوەشت بیر نەچێ.! تخووبی یاخیبووان نەبەزێنی، بۆتۆ باش نییە، چونکی تۆ.! بابایەکی هەژاری ئاوخۆرەوەی، باگرفتار نەبی، بەرگەی ململانێ ناگری، لەوە پێش پێمگوتی، تۆ لەکاری شوون هەڵگرتن شارەزای، دەتوانی دەستخەرۆیان بدەی،

لەپای چی.؟! خۆت تووشی گێچەڵ و سەرئێشە دەکەی، بە قسەم بکە، ئەو ماندوو بوونەت بەخۆڕایی ناچێ، پاشان هەقی ماندبوونت لە پووری خۆت وەربگرە.

حەمە شوون هەڵگر، تاوی داما، دواتر هاتە گۆ گوتی:

- پوورە سێوەمن ڕۆژێ لە ڕۆژان خراپەکاریم دەرحەق بە خەڵکی ئاوایی نەکردووە، من بۆ ئافەرین و دەست لە پشت دان خەڵکی تووشی گەرداوناکەم. بەلاّم من هەرگیز ناتوانم فرت و فێڵ و دۆرو دەڵەسە تێکەڵ بەکاری خۆم بکەم.. ئەگەر وەك ئەوەی تۆ مەبەستتە، وابکەم، واتە فێڵ لەخۆم دەکەم.

- کوڕم، ئەم کارەی تۆ، خوێن ڕشتنی بەدوادا دێت، تازە کار لەکار ترازاوە، ئەسپ دزراوە و لەدەست چووە ،بەقسەی پووری خۆت دەکەی.! چاکە بنوێنە، باشترە بۆتۆ، ئیتر من وادەڕۆم. ئەوەی پێویست بوو پێمگوتی. بیری لێبکەوە، بۆ خۆت سەر پشك بە دونیا شەووڕۆژێك نییە ڕۆڵە، هەر چاکە چاکە، چاك بیری لێبکەوە خاوەنی کۆشێك منداڵی.

- یانی چی: پورێ.؟!

- وەلاّم لای خۆتە. دواتر ڕۆیی.

مچەگزیر، بەهەڵداوان و هێنکە هێنك هات، قەستی مالاّ حەمە شوون هەلگری کرد، هێنکە بڕببوو، قسەی بۆ نەدەکرا، تاوێ لە سەر چنچکان هەڵقونجا، هەناسەی هاتەوە بەر.. ئەوجا گوتی:-

- کاکە حەمە، زووکە بابڕۆین، ئاغا کاری پێتە داوات دەکات.!

: حەمە شوون هەڵگر خۆی لە گوورە نەبرد گوتی:-

- باشە، دەتۆ جارێ دانیشە، بۆ هێندە بە تالووکەی، ئەوەی بووە، بووە، خۆت سەخڵەت مەکە. وەرە ڕوونە، با پێکەوە قاوەڵتی بکەین، پاشان دەچین بۆ خزمەت جەنابی ئاغا.- کورە باوکم، قاوەڵتی چی.؟! چمە, نقیشك و هەنگوینم بۆ دابنێی.!

بۆم دەخورێ، ڕاستە.! کەس ئاگای لە دەردی کەس نییە. هەرکەسەو لە باری خۆی دەژمێرێ. کاکە دەخیلت بم واز لە خواردن بێنە، قوزەڵقورتی دەخۆم، وەرە بابڕۆین.!

- باشە برا، مادام گەروت هێندە تفت و تاڵە، بابڕۆین

زینەڵ ئاغا، لە هەیوانی دیوەخان دەهات و دەچوو، ئاگر لە نێوچەوانی دەباری، هەر لەبەر خۆیەوە بڵمە بڵمی بوو، گازاندەی لەبەخت و یەغباری خۆی دەکرد.!

(لە چوار دێڵان، خودا نێرینەکی پێنەبەخشیم بەخت و ناوچەوان ڕەشی من بوو، هەر هەموویان دێڵەبوون، هیچیان گورگ خنکێن نەبوون، بەخۆشم ئەو هێزو گوڕو تینەی جارانم نەماوە. ئاخ خ خ.. پیری و سەت عەیب. حەیف و مەخابن ژنی بن چۆکی خۆم.سەری مەیدانیان لێگرتووم،

چمە، نێرەبوو لە تەویلەخانەی من نزیك بێتەوەو بە تێچاوی تەماشای ئەسپە شێ بکات) هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا، ڕووی وەچەرخاند.! مچەوحەمە شوون هەڵگر بەجووتە دەهاتن، بواری سەلام کردنی پێنەدان. گوتی:

- حەمە گوێبگرە.! بزانە چیت پێ دەڵێم. تۆ شوون هەڵگری چاکی دڵنیام لەوەی کەشوون لە تۆ بزر نابێ.. جا خۆشی بێ ترشی بێ سۆراخی ئەسپە شێم لێت دەوێ .نەکەی ناپاکیم لەگەڵ بکەی، دەستخەرۆم بدەی، لەژێرزەوی بێ .! لەبن پەرەکەی هەوران بێ، لە بنی دەریا بێ.! من نازانم سۆراخی ئەسپە شێم لێت دەوێ.. قەسەم بەگۆڕی ڕەحمەتی باپیرە گەورەم فرت و فێڵم لێبکەی، منداڵەکانت بە هەتیوی دێلمەوە. حاڵی بووی چم پێگوتی.!

: حەمە شوون هەڵگر، گەرمکی بوو پێی بڵێ.!

ئاغا ئەسپ دزراوە نەدزراوە بەمن چی ، قیڕی سیا، منداڵی من بۆ هەتیوو

دەکەی.؟! ئالّم و وێرم، خۆمن ئەسپی جەنابتم نەدزیوە. چاوو ڕاوم لێدەکەی. بەلاّم حیرس گرتبووی، لەحەژمەتان قسە لەناو قورگی دا گیری خواردبوو، خیزی ناو دەمی خۆی قووت دەداوە.

:بەخەنجەران گێرەت لەسەری بکردبایە، لە قاران خوێنی لێ نەدەهات. هەرئەوەندەی بۆ گوترا. (بەلّێ ئاغا حالّی بووم). پاشان ڕووی لە مچە گزیر کرد پێی گوت:

- پیاوی وەکو تۆ، نۆبەداری لە مالّ و مولّکی من دەگری، بۆیە حالّمان هێندە کۆکە. چمە، من نازانم دەستکێش لە خۆمانە، ئەگەر دەستکێش کەلێنی بۆی نەڕخساندبێ.؟! نێر حەددی چییە لە تەویلە خانی من نزیک بێتەوە، ئاوا بەسووك و سانایی ئەسپی من بدزی.شەرت بێ ئەوەی ئەم ناپاکییەی لەگەلّ کردووم دەبێ لە داری بدەم، ژنەکەی بێوە ژن دەکەم.) جەلۆ، لە پەنای دیوار هەستی خۆی ڕاگرتبوو، بەبیستنی ئەم قسانە فرە دلّخۆشبوو، چونکی دەمێك بوو چاوی بڕیبووە سمت و ساتان و بەژن وبالاّی (ئەختەر). وەکو پشیلە چاوی کوسە کوسکی بوو، هەرچەند جاری چاوی بە ئەختەر دەکەوت، لە حەژمەتان ئاو بەلالغاوی دا چۆڕاوگەی دەبەست لە مێژبوو لە ڕۆژێکی ئەوها دەگەڕا، بەلّکو بەمراز بگات، مچە، گەرەکی بوو قسان بکات، بپاڕێتەوە. بەلاّم ئاغا بواری پێ نەداتێی ڕاخوڕی لەقەوچەی داوە.!

- زمانت نەگەڕێ. ها، ئەگینا زمانت لەلالغاوەت دەردێنم، دەمهەراش. دەلّێن :حاجی لەق لەق فەقیرە، بەلاّم (مار)ی قووت دەدات، حەوسەلەی قسانم نییە. بڕۆن تەگبیری حالّی خۆتان بکەن.

دەکەی.؟! ئالْم و وێرم، خۆمن ئەسپی جەنابتم نەدزیوە. چاوو ڕاوم لێدەکەی. بەڵام حیرس گرتبووی، لەحەژمەتان قسە لەناو قورگی دا گیری خواردبوو، خیزی ناو دەمی خۆی قووت دەداوە.

:بەخەنجەران گێرەت لەسەری بکردبایە، لە قاران خوێنی لێ نەدەهات. هەرئەوەندەی بۆ گوترا. (بەڵێ ئاغا حاڵی بووم). پاشان ڕووی لە مچە گزیر کرد پێی گوت:

- پیاوی وەکو تۆ، نۆبەداری لە ماڵ و موڵکی من دەگری، بۆیە حاڵمان هێندە کۆکە. چمە، من نازانم دەستکێش لە خۆمانە، ئەگەر دەستکێش کەلێنی بۆی نەڕخساندبێ.؟! نێر حەددی چییە لە تەویلە خانی من نزیك بێتەوە، ئاوا بەسووك و سانایی ئەسپی من بدزی.شەرت بێ ئەوەی ئەم ناپاکییەی لەگەڵ کردووم دەبێ لە داری بدەم، ژنەکەی بێوە ژن دەکەم.) جەلۆ، لە پەنای دیوار هەستی خۆی ڕاگرتبوو، بەبیستنی ئەم قسانە فرە دڵخۆشبوو، چونکی دەمێك بوو چاوی بڕیبووە سمت و ساتان و بەژن وباڵای (ئەختەر). وەکو پشیلە چاوی کوسە کوسکی بوو، هەرچەند جاری چاوی بە ئەختەر دەکەوت، لە حەژمەتان ئاو بەلالغاوی دا چۆڕاوگەی دەبەست لە مێژبوو لە ڕۆژێکی ئەوها دەگەڕا، بەڵکو بەمراز بگات، مچە، گەرەکی بوو قسان بکات، بپاڕێتەوە. بەڵام ئاغا بواری پێ نەداىتێی ڕاخوڕی لەقەوچەی داوە.!

- زمانت نەگەڕێ. ها، ئەگینا زمانت لەلالغاوت دەردێنم، دەمهەراش. دەڵێن :حاجی اەق لەق فەقیرە، بەڵام (مار)ی قووت دەدات، حەوسەلەی قسانم نییە. بڕۆن تەگبیری حاڵی خۆتان بکەن.

# (١٧)

لەئاوایی زەردەشت ئاوا، بووە فسکە فسك و چبوو، چبوو، چی ڕوویداوە.؟! ئەسپە شێ دزراوە، کەی دزراوە؟ کێ دزیویەتی؟! دەستکێش لەخۆمانە. بڕواناکەم ئەدی کوو دزرا.؟! کاکە ئەم چەندوچوونەی بۆ چییە.؟! ئەمشەو ئەسپە شێ دزراوەو تەواو.

پوورە سێوە، دڵی کەوتبووە فرت و پرت. دڵی لە حەمە شوون هەڵگر کرمی کردبوو، تووڕەو تۆسن وگرژ، لەسەر کۆسپەی دەرگا هەڵکوڕمابوو، نیگای بڕیبووە دەروازەی تەویلە چاوەڕوان بوو، حەمە شوون هەڵگر چدەکات. حەمە شوون هەڵگر چەندجاران دەچووە ناو تەویلەو چاوی دەدا عاردی ،پێ بەپێی شوونەکە هەنگاوی دەنا، لە تەویلە بەدوور دەکەوتەوە، پاشان لە جێوە تاوێ دەسەنگراوە، دیسان دەگەڕاوە ناو تەویلەو لە نووکەوە دەستی پێ دەرکردەوە .حەمە شوون هەڵگر، لێی ڕوون بوو، کە شوون.! شوێن پێی پێڵاوی ئافرەتە، دەیزانی دەچێتە بەر دەرگای کامەماڵ، بەڵام بیری لە قسەکانی پوورە سێوە دەکردەوە.! (خەڵکی ئاوایی تووشی بگرەوبەردە نەکەی). هێشتاش قسە ڕەقەکانی ئاغا لە گوێیدا دەزرینگانەوە (منداڵەکانت بە هەتیووی دێلمەوە). هەردوو دەستی لەکەلەکەی خۆی گرتبوو، سەیری ئەملاو ئەولای دەکرد چاوی دەگێڕا، گشت ماڵەکانی ئاوایی بەسەرکردەوە، دواجار دیتی پوورە سێوە، لەسەر کۆسپەی دەرگای حەوشە هەڵترووکاوە.

هەستی پێکرد کە پوورە سێوە لێی بەگومانە، چونکی هێندە بەغەزەب تەماشای دەکرد چاوی نەدەترووکاند. وەبیری هاتەوە.! (لە ئاوایی بڕۆدەر، ڕێگای

گشتی بگرەو..) سەری ڕاڵەقاند، چۆوە گژکاری خۆی. دواتر پیێ بە پیێ و چاو لە عاردی، یاغریاغر ڕووەو پەڕگەی ئاوایی خشی، کە گەییە ئاست پووری سێوە بۆ دڵنیایی سووکە ئاوڕێکی لەدواوە،پووری سێوەژنەوت، هەربەچاو سوپاسی حەمەشوون هەڵگری کرد. بەڵام هەرچی (ئەختەر) بوو، لە کونی دەلاقەوە چاوە چاو بوو، کاربەچی دەگات، شادمان بوو، لەخۆشیان، دوعای خێروخۆشی بۆ حەمەشوون هەڵگر خواست..ڕێگای گشتی ڕێیەکی خۆڵەپۆك بوو، جێی سم و ناڵی ئەسپەشیێ زۆر بە ڕوونی پێوەدیار بوو، حەمە لە پێشەوە بوو، مچەش بەدواوە، ماوەیەکی دوور بەبیێ گریێ ڕۆیشتن. تاکو گەیینە کۆتایی تخووبی ئاقاری گوندی زەردەشت ئاوا. لەویێ بەملاوە، شوونەکەی لیێ تێکەڵ و پێکەڵ بوو، چیێ سمی (٤) چوار ئەسپ بەدی دەکرا، بۆیە سەنگرایەوە، دیقەتی دایێ.! تخووبیان نەبەزاندووە، کەچی بەئاشکرا شوێن پێی ئافرەتێك دیارە، بە پیادەڕۆ بەرەو ئاوایی گەڕاوەتەوە، بۆیە لێی تێچۆلابوو پێویستی بە پشوودان و بیرکردنەوەبوو بە (مچە)ی گوت:

وەرە با لێرە تاویێ دانیشین، سەرو جگەرە بپێچینەوە، کەمێك پشوو بدەین، تاکو بێنمان دێتەوە بەر. جەلۆ، نۆکەری ئاغا، سەر لە هێوارێوە بەگەرمی دەهات و دەچوو. لەخزمەت دابوو، چاوەچاوبوو خەڵك بڵاوەی لێبکەن دیوەخان چۆڵ بیێ. بەڵکو(تەڵە) بۆ مچەگزیر دانێتەوە گرفتاری بکات. پیاوەکان، بەهۆی بیێ (کابان)ی و شپرزەیی سەلیقەی گفتوگۆ و پێکەنین و دانیشتنیان نەبوو، بۆیە تاك تاکو، جووت جووت پەرتەیان لێکرد. زینەڵ ئاغا، بەمچومۆنی دەستی خستبووە ژێر چەناگەی، بیری ئەسپەشیێ و( بەلقیس ونازلی) ژنی دەکردەوە جەلۆ، بەهەڵێزانی، قاوەیەکی خەستی بۆ تێکرد، قەلونی بۆ داگرت، لەبەر دەمی دانا، کزومەلوول بەدیاریەوە هەڵقونجا، هێندە دەیکرد نەیدەزانی لەکوێوە دەست پیێ

بکات، پاشان جولەیەکی بەخۆی دا، منگە منگی لێوەهات، ئاغا پێ حەسیا، جەلۆ، وەکو مریشکی بەهێلکە گارەگاریەتی لە کوێ دابنێ.

- ها جەلۆ، بزانم چت پێیە.؟!

- قوربان، ئەوەی ڕاستی بێ، من لە زووێکەوە لەم حەرامزادەیە بەگومان کەوتووم، سوێندیش دەخۆم نە ڕقم لێیەتی، نەبوختانی بۆ هەڵدەبەستم ئەوەی من بزانم، مچە، لە دزینی ئەسپە شێ دەستی ئەم نەمەك حەرامەی تێدایە. چونکی ئەگەر ئەوڕێی بۆ دز خۆشنەکردبێ، دز تاسا ناکات بچێتە ناو تەویلە ئەوها بەئاسانی ئەسپە شێ بدزی.. جا نازانم جەنابت کوو لێکی دەدەیەوە.؟!

- وەللا، منیش لێی بەگومان کەوتووم..

بەلام پێمبڵێ بزانم، تۆ چۆن ئەوها لێی بەگومان کەوتووی.؟ ئایا لەوەو پێش هیچت لێی بینیوە.؟!

- قوربان، عەلی ئاوخۆرەوەی باوکی غوربەت لەگەڵ (مچە) بەرەچەڵەك دەچنەوە سەر یەك تیرە، خزمن، خزمەکی لێك نزیکن، واتە (مەڕ پێ لە بەرخی خۆی نانێ). هەروەها مەسەلەی خوێن بزاوتنە تێکەڵ بە گڕی عیشق و ئەوین و خۆشەویستی نێوان مچەو غوربەتیش سەربار.

- چمە، شتی وا لەئارادا بووە، من پێی نەزانم.؟!

- ئەی چۆن قوربان، ئەو نەمەك حەرامە، لە زووێکەوە مرخی خۆی لە غوربەت خۆشکردبوو، بەلام (حەمەبۆر)ی ڕەحمەتی، کۆسپ بوو لە پێشیان، پێموابێ هەر بەفیتی ئەم سەگسارە بوو، حەمەبۆریان لەناو برد، دڵنیام بە تەگبیرو ڕێنمایی (ئەو)بوو، ئەو دێڵە بە بایانەی ئەشکەوتی دێوان بۆسەیان بۆ (کەلۆس وکەمۆو سالۆ) نایەوە، وەکو چاوگرتی بەسەر بۆسەدا کەوتن، ئەوەیڕاستی بێ شەرمە بۆمن لە ڕووی جەنابتان هەموو قسەکی بکەم، ئەگینا دەمگوت:

بەتیخ تیخەی ئەو بێ شەرمەفەبوو، ئاغەژنە بەلقیس ونازلی

دایانە چیا، ئەگەرنا.؟! ئەوان لە چیان کەمبوو.؟!

بەدەم قسەکردنەوە. لە ژێرەوە بەبنی چاو سەیری ئاغای دەکرد، بزانێ ئاغا لە چ حاڵدایـە. ئاغـا، گـوێی بـۆ جـەلۆ هەڵخـستبوو، بـەلاّم لـەناوەوە دەروونـی پـڕ زووخاوبوو، پەیتاپەیتا ، هەڵدەچوو.

- ئەدی قوربـان، هـەرمن دەزانم ئـەو مـچەیە، چـتۆ زۆڵە، ئەگـەر ئـەو کـەڵێنی بـۆدز نەڕخـساندبێ. کـێ.؟! زاتـی ئـەوە دەکـات بەبـەردەرکی تەویلـەی جـەنابتان ڕابووری. بۆیەسێ، بە سێ سوێند دەخۆم، کە ئەو ناپاکە هـەر خـۆی دەسـتکێش و پاش دز بووە، ئەگەر بڕواشم پـێ ناکـەی.؟! حەمـە شـوون هـەلگر دێتـەوە، ئەگـەر سۆراخی ئەسپە شێ لە ئەشکەوتی دێوان سەری هەڵنـەدا.؟! دیـارە کـەمن بوختـان بۆ مچە هەڵدەبەستم.

- ئافـەرین جـەلۆ، بـاش چـویتە بـنج و بنـەوانی، بـەلاّم دەمـت تەقـەت داخـە بێدەنگ بە، هەتا دێتەوە بن چنگم، خۆم دەزانم بەچ دەردێکی دەبەم.

: حەمە شوون هەلگر، هەرچەندی لێکی دەداوە بۆی تـاوتوێ نـەدەکرا، لەبـەرە خۆی دەیگوت ((ئەگەر چوار دزن، بۆچی تەنیا یەکێکیان بە بەسواری لـە ئـاوایی ڕاهـاتووە، کەچـی بـە پیـادە ڕۆگەڕاوەتـەوە، سـوار ئەسـپێك بـە تـەنیا هـەوراز بوویتـەوە، کەچـی چـوار ئەسـپ سـوار هـاتوون تخووبیـان نەبەزانـدووە، دیـسان تێهەڵچۆوە دواتر بۆی ئاشکرا بوو کە (تەتەر) بەتەنیا چووەتە ئەشـکەوتی دێـوان و بـەیاوەری (٣)سـێ ئەسـپ سـوار گەڕاوەتـەوە، تخووبیـان نەبەزانـدووە. دواتـر ئەسپێکی قەتارکێش و (٣) سوار بە پڕتاوی گەراونەتەوە بۆ ئەشکەوتی دێوان.

: حەمەشوون هەلگر ئەوەی بـەلاوە گـرنگ نـەبوو، گـرنگ ئـەوە بـوو سـۆراخی ئەسپە شێی دەست کەوێ..

ئیدی بە ڕێکەوتنەوە، بە شوێن شوونەکەداچوون، کاتێ گەیینە دامێنی چیا. لەوێوە توولە ڕێ بوو، دەچۆوەدەربەندێکی چڕوپڕ دارستان، هەردووکیان سەنگرانەوە، لاری بوون، تاوێ لە پەنای تاوێران دانیشتن، بەدەم جگەرە کێشانەوە، بیری لە هەڕەشەو گوڕەشەی ئاغا دەکردەوە، لە قاران لێوی خۆی دەکرۆژتەوە، دیسان لەبەرە خۆی لەگەڵ پوورە سێوە تێهەڵچۆوە:

(ئەوەشت لە بیرنەچێ، سنووری یاخیبوان نەبە زێنی) .پاشان ڕووی بەلای مچەدا وەچەرخاند گوتی:

- تا ئێرە تەواو، کارمان کۆتایی پێ هات.

- بەڵێ دەزانم کۆتایی پێهات.

- باشە بەچی دەزانی.؟!

- کاکە من بست بەبستی ئەم هەرت و پەرتە شارەزام، لێرە بەدوا مەڵبەندی یاخیبووانە چیتر بچینەپێش، تووشی گێچەڵ و سەر ئێشە دەبین.

- باشە؟ مچە، وەکو خۆت گوتەنی، ئەگەر چیدیکە بچینەپێش لەگەڵ یاخیبووان گرفتار دەبین، ئەگەر بگەڕێنەوە، لەگەڵ ئاغا تووش دەبین ئەی چارمان چییە.؟! خۆ لە ترسی ئاغا دەست لە ماڵ و منداڵ هەڵناگرین.؟

- خۆشی بێ، ترشی بێ‌هەردەبێ بگەڕێینەوە.

- کەواتە تازووە، بابەخۆ کەوین بەرەو ماڵ بینەوە.. بزانین چارەنووس بەچی دەگات.؟!

# (١٨)

خۆر تازە تیشکی زێڕینی بەسەر ئەشکەوتی دێوان دا پڕشنگی دابوو، دەنگی بەجۆشی قاسپەقاسپی کەو، تێکەڵ شنەی بای سەحەر دەبوو، ئەوناوەی خرۆشاندبوو.. هاوڕێ غوربەت، شەڕواڵەکی ڕەش وکورتەکەی قەستۆری ڕەنگ مامزی بەسەردا بەردابۆوە، خەریتەو فیشەکدانی لەسەر بەستابوو، پرچی کردبووە دووکەزی بەسەر شان و ملیدا بەریدابۆوە، چەفییەکی سووری بەلاری لەنێوچەوانی بەستابوو، تفەنگی بەدەستەوە گرتبوو، خەنجەرێکی دەسك قەزوانی لەبەر پژدێنی ڕاکردبوو، لە زارکی ئەشکەوت ڕاوەستابوو، چێژی لە هەوای سازگارو جوانی سرووشت وەردەگرت چاوی بەملاوئەولادا دەگێرا، لەنکاوڕا دیتی نێرە(کەو)ێکی خورت و لەخۆبایی ،تەنگی بە (ماکەو)ێك هەڵچنیوە، گەرەکی بوو بە خورتی ڕامی بکات، حەزو ئارەزووی خۆی پێ دامرکێنێتەوە هێندەی هێناو بردبوو بێزاری کردبوو، ماکەو.چیتر لەحەوسەلەی دا نەمابووقبووڵی شەرمەزاری بکات، سەرکەوتە سەر تاشە بەردێك و لێی هەلگەڕاوە و چەقی، لەهیکرا فجوری کردێ خۆی هەڵدایە سەری، بەدندووکان، لێدە.. لێدە لێدە، گێژو وێژی کرد،دواجار خۆی بۆ مشتومار کرد، دندووکەکی خێواندە ناو چاوی، سۆمای چاوی بەگۆڕێ وەرکرد بەدندووك کەوتە گیانی هەنجن هەنجنی کرد، تاوێ بەدیاریەوە ڕاوەستا. پاشان گەردەنکی بڵندکرد، بەسەربەرزی لێیدا ڕۆیی. هاوڕێ غوربەت، زۆر دڵخۆشبوو بەم ڕووداوە لەبەر خۆی پێکەنی گوتی:

(ئەگەر دەست وەکەری نەکردبایە، ئابڕووی دەچووواند) پاشان بۆ تەماشاکردنی ئەسپەشێ چووە تەویلە، ئەسپەشێ گوێی مووچکردەوە، نامۆیی لێدەکرد،

بەشێنەیی و فیکەفیك هێوری کردەوە، دەستی بە سەر کەفەڵ و بژویاڵی داهێنا، ئەسپی تاین گوێی بۆ بەرداوە، بەتەواوی ڕام بوو، دواتر بەئەسپایی زین ولغاوی کرد، هەوساری گرت بەدوای خۆیدا ڕایکێشا بردیە دەرەوە،پێی چەپی دانایە سەر ڕکێب، دەستی بەقەر پۆسی زینەوە گرت، خۆی هەڵدایە سەر زین و لێ سواربوو، بەنەرمی ئاوزەنگی لەتەنگەی دا، ئەسپەشێ گەردەنی بەرزکردەوە، سینگی دەرپەڕاند، گوێی قیت کردەوە. هێندە بەنازو عیشوە و تەعزیم دەڕۆیی دەتگوت: نێرییە مامزە گەردەنی کێلکردووتەوە لە بەرایی (ڕەوە)دا بەهەستیاری ڕێ دەکات.جەنگاوەرەکان لەمەتەرێز دەرکەوتبوون، لەسەر لێواری شوورەی سەنگەرەکانیان ڕاوەستابوون، پیرۆزبایی ئەسپەشێیان لە غوربەتخان دەکرد. غوربەت، فرە دڵخۆش وشادمان بوویەك. یەك سەنگەرەکانی بەسەرکردەوە سەردەستەکانی ئاگادارکردەوە، سەرلەهێواریێ بۆکاری پێویست لە ئەشکەوت ئامادە بن. کە ئێوارەهات سەردەستەکان، خۆیان لەفیشەکدا غەرق کردبوو، غوربەت لەبەر ڕۆشنایی چرا، لەناوەڕاستیاندا ڕوونشتبوو، هەوەلجار بەگاڵتەوگەپ وپلارو پێکەنین دەستیان پێکرد. غوربەت هێندە ڕووگەش ودەم بە پێکەنین بوو. هەرگیز تووڕە نەدەبوو.. نازێ هەڵێدایێ گوتی:

- کوێرایم دایێ بۆت (حەمەبۆر) کاشکا زیندووبای، ئەوڕۆ بەچاوی خۆت دەزگیرانە نازدارەکەت بەسواری ئەسپەشێ دەدیت دەتگوت:نەوبووگە، بەباوە خوند دێتەوە بۆماڵەباوان.

:هەمووله قاقای پێکەنینیان دا، غوربەت بەپێکەنینەوە پێی گوت

- کچێ هەی دێڵە سەگ، شەیتان دەستی لێ شۆریوە، تۆ هێشتانەکێ دەستی لێ هەڵناگری، گوناحتەگاتێ.

: تاویٚ بێدەنگ بوون، چاوەڕوان بوون، کەی غوربەت لێوی لێك دەترازێنیٚ دێتەگۆ، ئاخۆ بۆچی بانگهێشتی کردوون.. کە هاوڕیٚ غوربەت لێوی لێکترازاند، سوێندت خواردبایە، تازەخونچەیە دەمی بۆماچی خۆر شکۆفەدەکات. گوتی:

- هاوڕێیان، حەزدەکەم بزانن کە ئەم ئەسپە ئەسپی زینەڵ ئاغایە، پوورە سێوە بەدیاری بۆمانی هەناردووە لەڕاستی دا، ئێمە هەر هەموومان قەرداری ئەم دایکەین، پێداچوو گوتی:

: ئەوەی من بزانم، ئاغا بەهەلأتنی هەردوو ژنەکەی هێندە سەرگەردان و خەفەتبار نیە،ئەوەندەی خەفەتخان و پەرۆشی ئەسپەشیٚ یە.بۆیە خەڵکی دێهات وڕەشماڵ نشینی لێمان هانداوە، لەشکرمان بۆبکات. گوایە (مەلا) فتوای داوە.! ئەوانە، واتە ئێمە لەئایین لامان داوە پاشگەزبوینەتەوەو لەدین دەرچوین، فرمان بەسەر ئایین ودیانەتی باب و باپیرانمان نەماوە، وای لەکەللەی ئەو خەڵکە پەستاوە. کەشەڕ.شەڕی کوفرو ئیمانە. هەرکەسێك بەشداری لەم شەڕەدا بکات بە(غەزا) بۆی دەنوسریٚ.. هەروەها گفتی پێداون (ئەوەی ژنێك و دووان و سیٚ ژنیشی هەبیٚ، ژنێکی دیکەی لەقەبەل دەکەم) بەزمانی لووس ودرۆو دەلەسە، لەشکرێکی گەورەی کۆکردۆتەوە، بەگوێرەی ڕاپرسپاردەی پوورە سێوە، خەریکی خۆ ئامادە کردنن بۆهێرش و پەلاماردان، بۆیە دەبیٚ لە سبەینێوە لە ئامادەباشیدابن، ئەو جەنگاوەرانەی تاکو ئێستا چەکیان پینەدراوە، چەکیان بدەنیٚ، هەروەها ئازووقە وتەقەمەنی وئاو عەمباربکەن، سەنگەرەکانتان قایم و مەحکەم بکەن، تاکو دوژمن زەفەرتان پێنەبات. کە گەڕانەوەلای هاوسەنگەرەکانتان، ڕاوێژو ئاخافتنیان لەگەڵ بکەن، ئاگاداریان بکەنەوە تاکو لەکاتی پێویست دەستبەکاربن. وەلەسبەینێوە قاچاخچی و بازرگان ودێوەورەکان ڕاسپێرن، بائازووقەو تەقەمەنی بار بکەن بێن بۆ ئێرە، نەبادی دووچاری

شەڕێکی درێژخایەن بین.. بەلاّم هەروەکو پوورە سێوە گوتبووی.! (لەشکرێکی زۆرو زلول وبێ سەروبەرن). لەو بڕوایەدام هەر لەگەلّ یەکەم تەقەی دەستپێکردنی شەڕدا،کەسیان نابێتەبرای کەس. هەر ئەمجارەیە، قەپۆزیان تێك بشکێنین، جارێکی تر ڕووناکەنەوە ئەم ناوە، ئێستاش ئەگەر ئێوە شتێکتان لەلا گەلاّڵە بووە. بەباشی دەزانن فەرموون.! پەیمان گوتی:

- باشە هاوڕێ. ئەگەر هات و داوای گفتوگۆو(چاکێ) یان کرد، ئەوسا چلۆن؟!

- ئێمە دەست بۆ (چاکێ) درێژ دەکەین. بەلاّم قەت لەو بڕوایەدا مەبە ، ئەوان داوای ئەوەمان لێبکەن، چونکی حیرسی پیاوسالاری، ڕێگەیان پێ نادات پێیانوایە کە ئەوە کەمایەتییە، لە شەقل و هەیبەتی پیاوان کەمدەکاتەوە. عەیشان هەلّیدایێ گوتی:-

- قسەی منیش هەر قسەی هاوڕێیە. ئەوان هەرگیز بیر لە وتوو وێژ ناکەنەوە، بەلاّم گوتمان داوایانکرد ئەوسا داواکاری ئێمە چییە.؟!

- ئێمە لە ژیاندا وەکو پیاوان ڕەنج دەدەین، داوای بەشە ڕەنجی خۆمان دەکەین.

داوای یەکسانی لە بەشە میرات دەکەین، داوای ماق مولّکداری دەکەین ،لە شووکردنا ماق نارەزوومان بدرێتێ، چیتر سولح (چاکێ) بەخوێنی ئافرەت نەکرێ، لێرە بەدواوە کچ لەسەر پشتی لانکێ مارە نەکرێ. ئاخر ئاژەلّ بەئاژەلاّتی خۆی، ئەگەر مەیلی لێنەبوو، ناهێلێ نێرینە تووخنی بکەوێ، ئەوان لە ڕیزی ئاژەلّیش دامان نانێن، بەچاوێکی سووك مامەلّەمان دەگەلّ دەکەن، سووکایەتی بەئافرەت دەکەن، لەپای شتێکی کەم توورە دەبن. بەسێ بەردان سوێندەکی گەورە دەخۆن، پاشان بەدوو دەستان (لۆلکە)ی دەخۆن، خۆیان داوێنە بن دەست و پێی مەلاو شێخان، تەلاّقی کەوتووە، بۆی چاکبکاتەوە، دەرەنجام هانا

بۆ(مارەبەجاش)دەبەن، ئێوە تێفکرن چتۆ قەباحەتە بە ئافرەتانی دەکەن.!
لەحیاتی هەڵەی مێردی، شەرەف و نامووسی خۆی بخاتە بن دەستی پیاوێکی دیکە، ئەوە یاسایە.؟ !یان سووکایەتی کردنە بەئافرەتان..

: هێشتا قسەی مابوو، لەیل، لە تریقەی پێکەنینی داقسەی پێبڕی ، گوتی:

- من، بەم قسانە گریانم نایەت، چونکی قەت لەو بڕوایە دا نیم، هیچ پیاوێك بتوانی واز لە خوو ڕەوشتی پیاوسالاری بێنی. چونکی پێی وایە نەنگییە، لەنرخی پیاوانەیان کەم دەکاتەوە، بۆیە واچاکە،خۆمان تەیار دەین. لەم قسانە بەسوودترە بۆ ئێمە. بزانین چارەنووسمان بەچی دەگات

# (١٩)

زینەڵ ئاغا ،(پند)ی کەوتبووە کەوڵی، نەدەحەجما. لەهەیوانی دیوەخان دەهات و دەچوو. دەسەنگراوە، ڕادەوەستا، چاوەڕوان بوو. کەی حەمە شوون هەڵگرو مچە دەگەڕێنەوە. ناوەناوە لەبەرخۆیەوە قسەکانی جەلۆی پەسند دەکرد.! (جەلۆ ڕاست دەکات، ئەم هەراو فرتەنەیە هەمووی لەبن سەری مچەیە، وەکو سەگە تۆڕی لە پشتڕا گاز لەخاوەنی خۆی دەگری، ئای، چتۆ سووکایەتی پێکردم. حەیاو ..ورمەتی بردم). لەحەژمەتان مووی سەری خۆی دەرناندەوە.. لەم لاوەش پوورە سێوە سەیاد بوو، سەرەڕێی گرتبوو هەریەکێك ڕەتبووایە پێشی لێدەگرتەوە، لێی دەپرسی.

- ئەرێ فلانی، ئەوە ئاغا چ خێریەتی.؟!

هەبوودەگرژیەوەوهیچی تر، هەبوومنگە منگەکی لێوەدەهات ودەڕۆیی.

پوورە سێوە، لەپشتەوە زمانی لێدەردینا، گەشکەی پێدەگرت.. دەمەدەمی زەردەپەری خۆرئاوا بوون بوو، گەیشتنەوە ئاقاری گوندی لەبرسان و هیلاکییان لاکەیان لێوە دەهات، دڵیان دەخێوراوە، سەنگرانەوە حەمە شوون هەڵگر گوتی. مچە، وەختەکەی ناوەختە، واچاکە لێرە کەمێك پشووبدەین. خۆمان بگرخێنین، تاکو خەڵك دادەومرێنەوە، پاشان دەچینەوەماڵ‌شام دەکەین دواتر بەکاوەخۆ شۆڕدەبینەوە بۆ دیوەخان ، مچە، بەنیمچە گرژینەوە گوتی.

- پێموایە بچینەوە ماڵ، یان نەچینەوە شام بکەین یان نەکەین، بۆ ئێمە هەر بەڕبەی تەق تەقە. چونکی ئەو جانەوەرە سەر زیندووی پاشەڵ مردوو توتڕك ئاسای قرتۆکمان دەگرێ، هەرچی خواردوومانە پێمان دەتفێنتەوە، چونکو

زەلامی بۆرە، هەرهێندە لە ئادەمیزاد دەکات، تاوەکو زاری لە باریەك هەڵدەپچڕی. زمانی بەگەڕدەکەوی ئیدی کەزمانی گەڕانزمانی ناکەوێتەوە کاڵان، بواری ئەوەشت پێنادات تێی بگەیەنی، ئەو هەردەزانی بنەڕێنی.

: جەلۆ لەسەر ئاوو ئاگر بوو، گەرەکی بوو هەرچی زووە مچە بە(تەڵە) وەبکات،چوو بوو لە پەنا دیواری (لەودەی کا). قانگلەی کردبوو، چاوەچاو بوو کەی دەگەڕێنەوە، چاوی لێبوو لە قەراغ گوندی هەڵوێستەکیان کرد،پیچەك ئاخافتن، هەر لەوێ لێك دابڕان، هەریەکەو بەلایەکدا ڕۆیشتن. جەلۆسەری تێدا سوورمابوو. لەبەرە خۆی لێکی دەداوە.! باشە. ئاغا لە سۆری سبەینێوە چاوەڕوانە کەی دەگەڕێنەوە، کەچی هاتنەوەو نەچوون بۆ دیوەخانی ئاغا، دەبووایە لە پێشدان برۆن بۆ خزمەت جەنابی ئاغا، بەلاّم بۆچی نەچوون.؟! نازانم بێگومان (ئەم ماستە بێ موو نییە). بەچووستی هەستاوەسەرپێ، ڕوویدا دیوەخان هەکە پێی نایە ئەو دیوی کۆسپەی دەرگای دیوەخان. ئاغا پێی حەسیا لێی پرسی؟

- ها جەلۆ چ باسە؟!

- قوربان مچەو حەمە هاتنەوە بەلاّم..

: نەیهێشت قسەی تەواو بکات، بەسەریدا گوراندی.

- ئەی کووا، لەکوێن، بۆچی نەهاتن بۆلام.؟!

- قوربان ئارامت بێ، باقسەت بۆ بکەم.. لە پەنای لەودەوە چاوم لێبوو دەهاتنەوە، لەسەرەوەی گوندی ڕاوەستان.فسکە فسکیان بوو، پاشان لێك جیا بوونەوە هەریەکەو بەلایەکدا چوونەوە ماڵی خۆیان.

- ئاوها.

- بەڵێ قوربان. ئاوها من دەزانم فیتی ئەو بێ قیمەتەیە، نەیهێشتووە حەمە بێتە حزور جەنابتان، نەگینا حەمەشوون هەلگر هێندە بێ ڕێزو حورمەت نییە

،بەلام ئەو سپڵەی حەرامزادەیە، وەکو ئاگری بن (کا)وایە، من دەمزانی لەبەر خاتری دوو چاوی (غوربەت)، دژایەتی جەنابت و بەرمبەرەکانی خەڵکی ئاوایی دەکات، هەر بۆیەشە خەڵکی دێهاتەکانی دەوروبەر، حەزلەچەهرەی ناکەن دەیبوغزێنن). هێدی هێدی دیوەخان قەرەبالغ دەبوو، بۆن قاوەی برژاوو کوتەکووت و زرنگەی (ئاوون) پیاوی سۆزگ دەکرد،هەر هەموو چاوەڕوانی دەستوفنجان وقاوەی عەلۆقاوەچی بوون، لەلایەکی دیکەوە گوێ قولاغ بوون ئاخۆ سۆراخی ئەسپەشێ بەکوێ گەیی.؟! ئاغا لەسەرەوەی دیوەخان پاڵی دابۆوە ئانیشکی کردبوو پرهەڵمابوو، لە پڕێکەوە بانگی عەلۆی کرد.

- کورە عەلۆ، ئەم قاوەی تۆ بووبەچی.؟! دڵە سۆزە بووین، چی بەسەرهات.!

- بەڵێ ئاغا، کەمێك ئارامت بێ، هەر ئێستا با نەختێك بنوێتەوەو تەواو.

- دەی بە ملی شکاوت تێیکە. نازانم بۆ هێندە ساردوخاوی.

دواتر زەردەخەنێکی گڕبەسەر لێویداهات گوتی:

- کوڕینە، ئەمشەو دوای قاوە نۆشین، بەزمێکی خۆش دەگێڕین.

هەرهەموو سەرسام بوون، ناحەقیان نەبوو سەرسامبن، چونکی ئاغا لەژیانیدا قەت ڕووخۆش و زمان شیرین نەبووەسەری زمان و بنی زمانی تەنها جووندان بووەو هیچی تر. کەسیان دەنگی لێوە نەهات، لە پڕ مچەو حەمەشوون هەڵگر بە ژووری دیوەخاندا کەتن. ئاغا،خۆی لە گورە نەبرد، چۆن پاڵکەوتبوو، هەرلەجێوە خۆی نەبزاوت، بەتەوسەوە پێی گوتن: (کەروبارتان بەخێربێتەوە ،فەرموون، فەرموون، تێپەڕن، هەڵکشێن بۆ هەوراز). حەمە شوون هەڵگر.ڕووبەڕووی ئاغا دانشت، چاوی چەقاندە دوڕ چاوی ئاغا، مچەش، لە دامێنی دانیشتووان ملی لار کردەوە هەڵقونجا.

جەلۆ، وەکو (کتك)ی کەتن کەر ئاسای. بەچاوەمۆنی خۆی ماتکردبوو، ناوەناوە نیگای دەچەقاندە ناوچاوی ئاغا هەروەك ئەوەی پێی بڵێ (قوربان ئەوەتانێ غەنیمەکەت) کەسیان نووزەیان لێوەنەدەهات، هەستیان لەخۆیان بڕی بوو، هەستو خوست لەئارادا نەبوو، زینەڵ ئاغا،لەپڕ ڕەنگی ڕووی پەڕی. نێوچەوانی تێکنا، گرژوتاڵ بوو، چاوی دابووە تەزبێحی لە دەستی یاری پێدەکرد، دەتگوت: بەرازی میز گیراوە غەزەبی لێدەباری. هەرئەوەشبوو بەئەنقەست کۆخی، خەڵکەکەی هشیار کردەوە، هەر هەموو گوێ قولاغ بوودواتر ڕاستبۆوە سەر فینگ و چاوی بەهەمووواندا گێڕا، تاوێ مووڕبووەوە، دواتر نیگای گواستەوە بۆ سەر حەمەشوون هەلگر. گوتی:

- ئێ حەمە، دەبڵێ بزانم لەسۆراخی ئەسپەشێ گەیشتییەکوێ .؟!

- قوربان پێ بە پێ بەشوێن شوونەواری ئەسپەشێداچووم، ئاسەواری شوونەکە زۆر بەڕوونی دیاربوو

- چۆن دەبڵێ بزانین.

- لە ڕاستیدا دز، دزێکی کارامەو لێهاتووبووە بەمەوە لێم ڕوونە، لەکاتی زین کردن ولغاو لەزارنانی ئەسپەشێ، ئەسپی تاین هیچ پەلوپۆی نەکوتاوە ،دواتر هەوساری گرتووە تاکو دەرەوەی ئاوایی بە دوای خۆیدا ڕایکێشاوە، واتە ئەسپەشێ بەتەواوەتی بۆی ڕام بووە. هیچ خۆی لەگوورە نەبردووە. لەوێوە تا دەگاتە تخووبی ئاقاری گوندی زەردەشت ئاوا. تەنیا سواربووەو بەڕێکاوە، هەوراز بووتەوە بۆ ئەشکەوتی دێوان. پاشان شوێنەواری چوار ئەسپ سوار دیارەهاتوون، لەسەر تخووبی گوندی، تاوێ ڕاوەستاون، تخووبیان نەبەزاندووە، پاشان بایاندایتەوەئاسەواری هەر چوار ئەسپ دیارە کە گەڕاونەتەوە. تەنها یەك پیادەڕۆ بەرەو ئاوایی هاتووتەوە.

: ئاغا تەواو قەلس ببوو، دەتگوت: کرۆسکی خواردووە.دەمری ببوو لە قاران سمێڵی خۆی دەقرتاندحەمە شوون هەڵگر پێدا چووگوتی:

- وابوو لەگەڵ (مچە). پێ بەپێ بە شوێنەواری سم و ناڵی ئەسپەکان دا چووین. هەتاکوو گەیشتینە زارکی دەربەندی چەتان، ئیدی خۆتان دەزانن لەوە بەدواوە کەڵکی ئەوەی نەما چیتر بەدوایاندا بچین.

: ئاغا وەکو کوندە بەجەفت هەڵپەڵمابوو، بەڵام بەسەرە خۆی نەهێنا. لەسەرەخۆ دەستی پێکرد گوتی

- خزمینە، بڕوام بەقسەکانی (حەمە) هەیە کە دەڵێ: ئەسپەشێ هەڵپەی نەکردووە، یان تاکەسواربووە بەڕێگاوە، چوارئەسپ سوار هاتوون تخووبیان نەبەزاندووە، ڕاستەبەڵام کەئەسپی تاین خۆی لەگورە نەبردووە، پەلیزێوی نەکردووە، واتا کابرای دز، کەسێکی بێگانە نەبووە، کەسێك بووە لەلای ئەسپەشێ نامۆ نەبووە، بۆیە بۆی ڕام بووە، سەرسەختی لەگەڵ نەکردووە، پێموایە کە ئەوە پێویست بە چەندوچوون ناکات. شتێکی حاشا هەڵنەگرە، کە(دز) لەنێو ماڵی خۆمان دایە، بەڵام حەمەشوون هەڵگر لێمان دەشارێتەوە.
- ئاغا ئەوەی پێویست بوو لەسەرە من سۆراخی ئەسپەشێ بوو، ئەوە تانێ ئەسپ والای یاخیبوانە لە ئەشکەوتی دێوان. من لەمە پتر هیچم لەدەست نایەت بۆتی بکەم.

- حەمە، تۆ بڵێی و نەڵێی.! من دەزانم ئەسپ لەسەر ئاخوڕی کێ بەستراوەتەوە.؟! بەڵام تۆ خۆت لەگێلی دەدەی، بەم خۆگێلکردنەت دەتەوێ فریومان بدەی. سەزی گلۆرەمان لێ ئاڵۆز بکەی.

: ئاغا بەدەم قسەکردنەوە، پەیتا پەیتا هەڵدەچوو. ناوەناو خیزی ناو دەمی خۆی قووت دەداوە.

- باشە حەمە ئەی پاش دز،کێیە..؟!

ئەوها بەئاسانی پاشدز پەنادەی، بزەی سمێڵی بێ.؟!

: جەلۆ، هەلی بۆ ڕەخسا، خۆی تێهەڵقورتاند گوتی:

(کەواتە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ هەیە لە نێوان دزی ناومالی خۆمان و یاخیبوان.. لەگەڵ قسەکردن چاوی نابووە دوڕ چاوی مچەو.

پێدا چوو گوتی:

- ئەگەرنا، من قەت لەو بڕوایەدا نیم، ئەو کچەتیمانە جەسارەت بکەن، بوێرن پێ بنێنەوە ئاوایی وبەنزیك تەویلەدا ڕەتبن

ئاغا لێی وەرگرتەوە گوتی

- بەڵێ ڕاستە. هەڵبەتە پەیوەندییەکی توندو تۆڵ لە ئارادایە، مەسەلەی خزمایەتی و خوێن و خۆشەویستی و عیشقبازی لە گۆڕێیە.. تێچاوێکی دابووە مچەی.

.. قەیدی چییە.؟! ئەو ناپاکەی کە دەستکێشی کردووە ملی خۆی لە کێرد دەسوێ .

: مچەگزیر، لەهەڕوگیڤی ئاغاو کلکە سۆتەیی جەلۆوە، سووڕ دەیزانی ئاغا بیانووی پێدەگری، توشی گۆبەندو گێچەلی پێدەکات. لەوەش ناخۆشتر ئەوە بوو، هەرهەموویان بەگومانەوە سەیری(مچە) یان دەکرد.

: مچە وای دەهاتەبەر چاوی، کەگەڵە گورگێکی برسی چاوچنۆك گەمارۆیان داوە، هاکا پەلاماری دەدەن. بە کەڵبە تیژەکانیان شیتاڵ بە شیتالی دەکەن. دیسان ئاغا دەستی پێ کردەوە گوتی:

- با ئەوەشتان پێبلێم، کەلە ئاوایی زەردەشت ئاوا. هەرچی بکرێ، دزی بێ، حەزحەزۆکێ بێ، زەلام کوشتن بێ. هەرچییەکی هەبێ لە من بزر نابێ، ئێوە لەم

بڕوایەدان. من نەزانم کێ.؟! حەمە بۆری ڕەحمەتی بەکوشت دا. یان وادەزانن کە من نازانم کێ بوو.؟! تەڵەی بۆ (کەلۆس) داناوە. من، غەنیمی خۆم زۆر چاك دەناسم، قەیدی چییە.؟! با ئەسپ لە تەویلە دەرکات و بیبات لە دووری گوندی بە دێڵە سەگەکەی (عەلی ناوخۆرەوە)ی بسپێرێ، ئەوەی ئەم ناماقوولیەی کردووە، وادەزانێ کە من لە گوێی گادا خەوتووم.!

(جەنابی ئاغا. واتە هەر ئەو ناکەس بەچەیە، ژنەکانمان لێ گاڵ دەدات ، دەدەنەچیا. خێرەومەندێکی دیکە بەرماڵە نوێژەکی هاوێتە مزگەوت گوتی:

- ئەوە چتۆ ڕافزی حەرامزادەیە. ئەوها شەرمەزاری دنیاوقیامەتی کردین.. دەبێ دەرسی لە شەیتان وەرگرتبێ ئەوها ژیانی لێمان کردووە بەقوزەڵقورت و زەقنەبووت. یەکێکی دیکەش شەکرێکی شکاند گوتی:

باشە. ئەو قوڕمساخەی ئەم ناپاکییەمان لەگەڵ دەکات، دەبێ بەتەمای چی بێ، یارمەتی ئەو سەلیتانە دەدات.!

: ئیدی کەس نەما بەرێك ناوێتە مزگەوت، دواتر ئاغا دەستی پێکردەوە گوتی

- خزمینە، من دەزانم پاشدز کێ بوو.؟! بەڵام حەز دەکەم بەزمان و لە زاری حەمەشوون هەلگر ببیستین، کێ پاشدز بوو؟!

ئەگەر ڕاست و ڕەوان پێمان نەڵێ: ئەوە ناچار دەبم بە خۆم (ئەو) زۆڵی نمەك حەرامە دەست نیشان بکەم، بەڵام بە شاهێدی ئێوە، ئەگەر حەمەشوون هەلگر درۆم لەگەڵ نەکات، خەڵاتێکی گرنگ و بەنرخی پێشکێش دەکەم، بەمەرجێك.؟! لەبەری بحەسێتەوە. ئەگەرنا.شەرت بێ لەشەرتی پیاوان. هەر ئێستا گوند بەدەری دەکەم

ناهێلم سبەی هێوارێ کووچاگری گەرم بکات. ئەوەتا گوێی لێیە، بابۆخۆی سەرپشك بێ.

---

- جەنابی ئاغا، خەڵکینە. من لەکارەکەم دا خیانەتم نەکردووە. من، بابایەکی شوون هەڵگرم، لە هەموو دنیادا، پیشەی شوون هەڵگری بریتییە لە بەدەست هێنانی سۆراخ، من سۆراخی ئەسپەشێم پێڕاگەیاندی، ئەسپ وا لە ئەشکەوتی دێوانە. لەمەبەولا کاری من نیە سەرمڕای ماندوبوونم، چ ڕەوای هەقە گوند بەدەرم دەکەی.؟!

: ئاغا بە سەریدا گوڕاندی.

- تۆ ناپاکی، ئەگەر ناپاك نەبووای، ڕاست وڕەوان پێت دەگوتم، پاشدز کێ بوو.؟!

- ئاغا خۆمن کەرامەتم نییە لە غەیبەوە پێمبڵێن: فلآنەکەس پاشدز بوو، من چووزانم کێ پاشدز بوو، کەنەزانم لە ختوخۆڕا ملی کێت بۆ بشکێنم.؟!

: لە حەمەشوون هەڵگری خوڕییەوە.!

- قەوچەقەوچ، دەمت تێکنێ، زمانت نەگەڕێ، دەزانی زۆرت ڕێست، هەر ئێستا برۆ شرۆشیتاڵت بپێچەوە، بەیانی نەتبینم، تێگەیشتی.؟! دواتر پێی گوت گوێ بگرە. ئەوەش بزانە، باپێت بڵێم: هەر کەسێك لەو دێهاتانەی دەوروبەر داڵدەت بدات، دارو دیواری دێیەکەیانی بەسەر خاپوور دەکەم، دەبرۆ. هەتا زووە بارگەت تێکنێ نەتبینمەوە، دەبرۆدەی ناپاك.

: حەمەشوون هەڵگر ، لە حەیبەتان ئاگر لە چاوی دەباری. ئەگەر دەسەڵاتی بەسەردا بشکابایە پێی دەگوت.!

(مادام هێندە عەگیدو بەزەبرزەنگی، بۆ ناچی دارو بەردی ئەشکەوتی دێوان، بەسەری ژنەکانت دا وێران بکەی). هەستاوە ڕۆیی.

# (٢٠)

ماوەیەك کپ وبێدەنگبوون، کەس نقەی لەبەر نەدەهات، وەك ئەوە لە پرسە دانیشتبن، عەلۆ قاوەچی، چرقەی لەفنجان هێنا قاوەکی بۆ تێکرد، بەیەك بێن قاوەکەی فڕکرد، دواتر دەمی داپچڕی گوتی:

- خۆمن دەزانم کاریتە لەداری کفر هەڵناکەوێ، بەڵام هەموو گوناحی خۆمە دێتەوە ڕێم، چونکی داڵدەیان دەدەم، دەیانحەوێنمەوە، کەچی لێم هەڵدەگەڕێنەوە..

:دواتر پەنجەی بۆ(مچە) درێژکرد گوتی:

- ئەم مچەیە دەبینن.؟!

: خەڵکەکە بەسەر سوڕمانەوەسەیری مچەیان کرد.

.. خۆ دەیبینن چۆن کریشکەی کردووە، ئەوەی نەیناسێ، پێیوایە کە هێندە بەستەزمانە، زمانی دەزاریدا نیە، کەچی ئەم سەرکزە، ئاگری بن کایە. بۆ گەیشتن بە مەرامی خۆی، لەبەرخاتری دوو چاوی کاڵی کچەتیوەکەی عەلی ئاوخۆرەوە، شیرازەی ژیانی ئێمەوخەڵکی گوندەکانی ناوچەکەی تێکداوە. ئێوە وەکو من نایناسن، چەند گلاوەڕاستە دەڵێن (سەگ، هەرچەندی بیشۆن، گلاو تر دەبێ). ئەم توخمە ئادەمییە لە پشیلە بێ نمەکترن..

مچە، لەبێ دەسەلاتی سەرەگێژەی گرتبوو وێکهاتبۆوە، چاوی ڕەشکەوپێشکەی دەکرد، وەکو( مار)ی بریندار پێچی دەکرد، هێلنجی ڕشانەوەی دەهاتێ بڕشێتەوە.

.. ئەو سەلیتەیە، وادەزانێ بەکوشتنی حەمەبۆرو کەلۆس و ئەوانی دیکە ، تەواو کۆتایی هات، بەمرازی خۆی دەگات، بەلام خەیالی خاوەشەرتبێ بەشەرتی پیاوی مەرد، دەبێ لە پاشووی ئەسپی ببەستمەوە، وەکو کوچ کوچە بە گشت دیهاتەکاندا پەلکێیشی بکەم، دیوەخان بەدیوەخان بیگێڕم.. وابێ هەموو ژنانی پێ تەمبێ بکەم. ئەبادی جارێکی دیکە پێ لەزادی بنێتەوە.

:خەلکەکە، لەبەر ساویلکەیی خۆیان بەبیستنی ئەم قسانەی ئاغا، لە (مچە) دەهری ببوون، ددانیان لێ بەجیڕەوە دەبرد، بەچاوی دوژمنداری لێی موڕ ببەنەوە، ژن هەلاتوو، کچ هەلاتوو دەزگیران هەلاتوو، پڕ هەلمابوون، پتت لێدابانە شەقیان دەبرد، هەر هەموویان لەبیری تۆلە سەندنەوەدا بوون.

: ئاغاشەویلاکی شل ببوو زمانی خستبۆوە کالان، مچە، بەهەلێزانی، زۆر بەنەرمی و زەلیلی کەوتە پاڕانەوە گوتی

- قوربان من ،خزمەتکارێکی بەئەمەك وبەوەفا بووم، ئەم کارو کردەوە دزێوانەی جەنابت فەرمووی، من لێیان بە دوورم. هیچ پەیوەندیم بەکچەکەی عەلی ئاوخۆرەوە نییە. لەبەرچاوی هەمووان، سێ بەردە فرێدەدەم کە من ئاگام لەکوشتنی حەمەبۆرو کەلۆس و ئەوانی دیکە نییە، بە(٣٠) سی جزمی قورئان سوێند دەخۆم، کە سەروسۆراخم لە دزینی ئەسپەشێدا نییە، وەك عارەب دەخیلت بم، من نمەك حەرام نیم، بەقسەی خەلکیم دەگەل مەکە.!

: ئاغا بە توڕیی هەستاوە سەر پێ گوتی:

- خۆ گوێتان لێ بوو. ق [illegible] ێانم لێبەدرۆ دەخاتەوە. گوایە من درۆو بوختانی بۆ هەلدەبەستم. ئەستە [illegible] ی س نەمگووتوە قسەی پێبڕی.

- چەنە چەن. [illegible] لەفزت نەگەڕێ [illegible] ئەر نا، زمانت لە بێخمەوە دەردێنم، تێگەیشتی [illegible] وو فرتەنەو کەلەکبازی یە.

ئەنجا نۆرەی زمان ڕەپی و چەنەبازییە، گەرەکیەتی بەم گاڵتە جاڕییە لە خشتەمان بات. گوێبگرە مچە، منیش لە هەقی خۆم خۆشبم، ئەو خەڵکە لە هەقی خۆیان خۆش نابن ،تۆ سووکایەتیت پێیان کردووە، من نەتکوژم، خزمی گوندی دەتکوژن، بەڵام هەر بەخۆم بتکوژم چاترە، بەڵام چۆن کوشتنێك.! هەر خۆم دەزانم چلۆنت دەکوژم، بەعەجەمەرگی دەتکوژم. هەر ئێستا دەست پێدەکەین.. یاللاَ کوڕگەل بتان بینم، وەکو سەگسار پەتکی کەن، شۆڕی کەنەوە ناو (چاڵ)ی گەنم . لە نانەڕەقەو ئاوی پەتی بترازێ هیچی دیکەی نادەنێ، بالە نێوچاڵدا وەکو مەیموون ببێتە قەشمەرجاڕی منداڵە هورتکان، دەی دەست پێبکەن.

: هەربەم شەوە گوریسیان لەتەنگەی شەتەك دا، شۆڕیان کردەوە بۆناو چاڵ. جەلۆ. لەخۆشیان دەستی بەسمێڵی دادێنا، لەنێوان دووبەرداش بەتەمای ئاردێکی هووردوجوان بوو. ڕۆژانی دواتر لەدەورەبەری ماڵی (ئەختەر)، مۆزە مۆزی بوودەخولاوە، بەهەر بڕوبیانووەك بایە، ڕۆژی جارێك خۆی لە قەرەی ئەختەر دەدا .ئەختەر پێی حەسیا بوو ئەم خول ودەورانەی جەلۆ، هەروەك دەڵێن (ڕاوی ڕێوی بۆ کەوڵکەیەتی)جەلۆ. نیازی گلاَوە. ئەختەر، ئافرەتێکی ڕەوشت بەرزوداوێن پاك بوو، بەم نەزیرۆکانەو لاواندنەوەی جەلۆ، هەرگیز ناکەوێتە داو، بەڵام بەئەنقەست خۆی لە گێلی دەدا، بیری لە پلانێك دەکردەوە، مچەی هاوسەری پێ ڕزگار بکات. چونکی مچە، لە چاڵێدا خرابووە ژێر چاودێری جەلۆ. سێ ژەمە خواردنی مچە بەدەستی جەلۆ بوو، شەوانیش ئێشکی لێدەگرت، بۆیە ئەختەر زۆر بەنەرمی لەگەڵ جەلۆ دەجوولاوە. بەگفتی خۆش و نیگابازی و لەنجەی هات و چۆ. جەلۆی دەستخەرۆدابوو، جەلۆ وەکو بەرخەمێشکەی ناوماڵ بێ ترس و دڵەڕاوکێ دەهات و دەچوو. ئەختەر بۆ جێ بەجێ کردنی پلانەکەی،

پێویستی بەهاوکاری و یارمەتی دانی کەسێك بوو. بەمەرجێك؟. جێی بڕوا بێ. چاوی هاوێتە سەر یەکدی، یەك، یەك خەڵکی ئاوایی زەردەشت ئاوای دەهێنایە پێش چاوی خۆی، لە پوورە سێوە بترازێ ،دڵی بەکەسیان خۆش نەبوو، دواجار هانای بردە بەر پوورە سێوە. هەرچی پوورە سێوەبوو، دڵی لە هاموشۆی جەلۆ کرمی کردبوو، پێی ناخۆش بوو جەلۆ هاتووچۆی ئەختەری دەکرد، بۆیە بە ڕاشکاوی بە ئەختەری گوت:

- کچم ئەختەر، تۆ جوان وجحێڵ و ڕووسووری، مێردت بەبێ سوچ و قەباحەت. والە چاڵی دا دەناڵێنێ. جوان نییە بۆتۆ جەلۆ هاموشۆت دەکات، بێجگە لە قسەو قسەلۆکی خەڵك، ئەگەر سبەی ڕۆژێ مچەی هاوسەرت پێبزانێ، دڵی لێت کرمی دەبێ. کچی خۆم، سەگی ئەوها بێناموس چییە. ئەگەر خۆت ڕووی نەدەیتێ.؟! تاسا ناکات بە پێش دەرگایماڵتان دا ڕابووری، چەقەی لێبکە. کیژم حەیا قەترەیەکە کە ڕژا.! هەڵناگیرێتەوە. ئەو سەگە نیازی گلاوە، حەزناکەم گلاوت بکات نامووست پێوەی دەچێ.

- پوورێ، قسەکانت دروستن، بەلام هەروەك دەڵێن:-

(دەریا بەدەمی سەگ پیس نابێ).

من، هیچ شتێك لە پووری خۆم ناشارمەوە،دەزانم جەلۆ مرخی خۆی لە من خۆشکردووە، تەماحگیرم بووە، هەر ئەو تەماحگیریەشە، مچەی هاوسەرم والە چاڵێدا دەناڵێنێ، ئەگینا مچە بێگوناحە. بەدوورە لەو تۆمەتانەی بۆیان هەڵبەستاوەتۆ لەهەمووان پتر شارەزای مچەی، مچە ناپاك نییە، ئاو لە(کانی)یەك بخواتەوە، هەرگیز بەردی ناوێتێ، زمانی تەقەتە. مرۆیەکی بەئەمەك و وەفادارو ڕاستگۆیە. لە گیانی خۆم پتر خۆشم دەوێ، بەلام من دەستم لە بن بەرداشە. من

کەبۆ جەلۆ پێدەکەنم،بۆ خاتری مێردی خۆم پێدەکەنم چونکی هەردەبێ رزگاری بکەم.

: پوورە سێوە ناوچەوانی ماچ کرد پێیگوت: مادام وایە بۆ پووری خۆت لێیگەڕێ، لەم ڕۆژانە جواب دەنێرم، ئەوجا بزانەچۆن.؟! پیاوەکەت ڤوتاردەکەم، جەلۆش بەگوونی بابیدا دەرپەنم، ئەوە باخەمی من بێ.

- نا پووری، ئەوە خەمی خۆمە، دەبێ هەڤی پیاوی خۆم بەدەستی خۆم وەردەگرم، پاشان هەر خۆم دەزانم چلۆن ئەم دڕکە لە بن پێی جەلۆ دەردێنم پووری، من ئەخشەو پلانێکی ڕێك و پێکم بۆ کوشتنی جەلۆو ڕزگارکردنی مچەی سەردارم داڕشتووە، بەلاّم پێویستیم بە هاوکاریو یارمەتی دانە، بۆ ئەم مەبەستە هاتووم داوای یارمەتیت لێ بکەم.!

- ئامادەم بڵێ بزانم.

- بۆشەوی ئایندە پێویستم بە دوولاّخی بەرزە هەیەو هیچی تر.

- بێ خەمبە، لە ژێر زەویش بێ، بۆت پەیدا دەکەم، بەلاّم وریای خۆت بە کچم، نەکەویتە داو.

- باشە پووری، دەستت ماچ دەکەم، ئێستا دەڕۆمەوە پاشان دەتبینمەوە.

: هێواری بەرلەهاتنەوەی مێگەلی مەڕومالاّت، جەلۆ(پەختە ڤولە)ی خستبووە بن دۆلاّب، ئاوی لە بیرێ هەڵدێنجا. (کۆڵ)ەکانی لێوان لێو کردبوو، چاوەڕێی مێگەل بوو، ئەختەر، دوو (جەڕە)ی لە پشتی خۆی هەڵدا، یاغر یاغر بە عیشەوەو ناز بۆ سەر بیری خشی، جەلۆ،لە پێش ڤەناتی بیرێ ڕاوەستابوو، (دەولك)ی وەردەگرت، کە چاوی بە ئەختەر کەوت دڵی داخورپا، لە خۆشیان لیکاو بە دەم و لەوسیدا هاتە خوارێ، ئەختەر ،بۆی خەنییەوەە گوتی:

- تۆ بڵێی: سەڤا لوتفی هەبێ جەڕەیەك ئاومان بداتێ.؟!

- هەر ئاو.! بڵێ روح،گیان،چاو، ئەوەی هەمە هەمووی لە مزگینی دەدات.

- خودایە لەچاوی پیس بەدوور بێ، ئەی بۆ دەڵێن: سەقامان ڕەزیل و قرچۆك وبەرچاو تەنگە.؟!

- ماڵی بەدگۆ وێران بێ، لەقسەی خراپ بترازێ، چمەقسەی خێر بەسەر زمانیان دادێ.!

- هەر لەبەر زمانی بەدگۆیانە، ناوێرم ڕازی دڵی خۆمت بۆ بدرکێنم.

- ڕاستەگیانەکەم، بەلاّم ئەی نەتبیسووە دەڵێن. (ئەگەر دزو خاوەن ماڵ یەکبن (گا)ی لە کولانکە ئاودیو دەکەن).

- جا ئەم دێیەی ئێمە کوا دزی وای لێهەڵکەوتووە.؟

- ئەگەر ماخۆ بخوازێ.؟! دز هەردەبێ.

: ئەختەر لە تریقەی پێکەنینی دا گوتی

- دەباشە دەی، بابزانین ئەم دزە، چتۆ دزە،

:دواتر هەردوو جەرەی بۆ پرئاوکرد، لە پشتی هەڵدا، توونند مەچەکی گرت، پێی گوت:

- ئەختەرگیان، دەخیلت بم. کەمێك لوتفت هەبێ.! ئەختەر بەگوێدا چرپاند.!

- ئەمشەو کەشەو ڕاکشا وەرە.بەلاّم وریابە. کەس نەتبینی. چاوەڕوانم باشە.!

# (٢١)

پورە سێووە، دوو(جۆنی) چەڵتووکی کووتا بوو، لەسەر بانیژە بەبای دەکرد، چاوی لێبوو ئەختەروجەلۆ لەپێش قەناتی بیرێ یەکدی گر بوون، سەریان لە بن سەری یەکدی نابوو، دڵی کەوتبووە قرت و پرت. هەر لەبەرخۆیەوە پرتەو بۆڵەی بوو.!

(دەترسێم ئەو سەربەهەشە گیرۆدەی داوی جەلۆ بی، ئەو قرخنی گورگنە لەخشتەی ببات). لەم خەیاڵانەدا بوو. گوێی لە دەنگی ئەختەر بوو.

- پوورە سێوە، هۆ پوورە سێوە، ئەوە لە کوێی.؟!

- گیانی پوورە سێوە، ئەوەتام لەسەربان.

- ئەوە خەریکی چی.؟!

- خەریکم ئەم گۆڵمە چەلتووکە بەبادەکەم. ئەوە هاتم، دواتر دابەزی گوتی:-

- خوودایە لەچاوی پیس و نەگریس بەدوور بی. چەندە جوان خۆی ڕازاندووتەوە، دەڵیی بۆ شایی و گۆڤەند داوەت کراوە.!

ئەختەر پێکەنی گوتی:-

- ئەی چۆن پوورێ، لەوە خۆشتر ئەمشەو جەلۆ بەزاوا بەندی دێتە سەرماڵێ.

: دواتر ڕەنگی ڕووی هەڵبزرکا. ئاگر لە چاوی دەباری، ددانی بە جیڕەوە برد، دەستی نایە مشتۆی خەنجەری بەرباخەڵی، هەر لەبەرە خۆی گوتی. (شەرت بێ بەم خەنجەرە. جەرگوهەناوت هەڵدڕم. نامەردی خوێڕی شەوت لێدادێ بۆ کوێ دەچی دەبێ لە خوێنی خۆت بگەوزی).

- کچم ئەختەر دەنگت دەرنەچێ، ئاگات لە خۆت بێ، دیوار بەگوێیە ڕۆڵە.!

- باشە پوورێ، بەلاّم پێمبڵێ ئاخۆ تەگبیری ولاّخت بۆم کردووەیان نا.؟!

- ئەی چۆن کیژم، بێ خەمبە.

- باشە تەگبیر چییە پوورێ..؟!

من بەتەنیا، (ئەو) لەناو ئەم چاڵە قووڵەودا پێناوەستم ئەم پیاوە هەڵکێشم، لە درۆستی نایەم.پوورە سێوە، تاوێ داماىبیری لێکردەوە، پاشان گوتی

- هاسانە، خۆت سەخلەت مەکە چاری دەکەم.

- چۆن پوورێ.؟!

- دوو(پەیژە) لێك دەبەستین، بۆی شۆڕدەکەینەوە باپێدا هەڵگەرێ. ئەمەشیان باخەمی من بێ.

- باشە. پوورێ خودا بۆ ئێمە بتهێڵێ.. ئێستا دەڕۆمەوە، شەو کە ئەم سەگسارەم بەتەڵەوە کرد دێمەوە بۆ لات ئاگادارت دەکەمەوە.

- زۆر چاکە،دەبرۆ بەلاّم وریای خۆتبە،ڕیسمان لێنەبێتەوە بە پەتە..!

- نا پوورێ دڵنیابە، چونکی دایکم ئەوهای لەلانکێدا پێچاومەتەوە و لایەلایەی بۆگتووم، سەتی وەکو جەلۆ دەبەمە سەر ڕووبار، ناهێڵم ئاویش بخواتەوە. چمە ئەتو کیژی خۆت ئەوها دەناسی..؟! نا پوورە سێوە، من هێندە دەبەنگ نیم، پیاوی وەکو جەلۆ زەلەم پێبکات، ئەمشەو بۆتی ئیسپات دەکەم.

: سێ بەتری شەو ڕاکشابوو شەوێکی کشومات. جەلۆ، دووورونزیکی (چاڵ). چاوەدێری مچەی دەکرد، دڵیشی لەلای ئەختەر بوو،

چاوەڕوانی لەسات و وەختی زووان دەکرد ئەختەریش لەسەر ئاووئاگربوو، بەڵکوو هەرچی زووە بەخەنجەر قرقرتۆکی هەڵبڕی. مچەی سەرداری ڕزگار بکات و ڕێی ئەشکەوتی دێوان بگرنەبەر، چای دێم کردبوو بۆ میوانداری کردنی جەلۆ، لەدەلاقەوە سەرەتاتکێی بوو کەی جەلۆ بەدیار دەکەوێ، لەلایەکی دیکەوە پوورە

سێوە، سەر لە هێوارێوە سەرپشتی لێبەستبوو تووندوتۆڵ، گورج خۆی تەیاردابوو، بە(کەژی) دوو پەیژەی داری لێك بەستابوو، چاوەڕوانی ئەختەربوو. مچە، بێ ئاگابوولە بنی چاڵێدا بەخەم دا کەوتبوو، بیری لە چارەنووسی خۆی دەکردەوە. بەم درەنگی شەوە لە گوندی زەردەشت ئاوا، تەنها چوار کەس بێدار بوون، لەدەریای خەیاڵدا مەلەوانییان دەکرد، ئەگەر چی هێشتا نەزانراوە کێ.؟! لەگەڵ تەوژمی شەپۆلی سەر شێتانەی دەریا نقوومی گێژەن دەبێ،جەلۆ، ئارامی لەبەر براببوو، چیتر خۆی بۆ ڕانەگیرا لەسادە وساکاری ئەختەر دڵنیابوو. چونکە ئەختەر، ڕێ و شوێنی چوونی بۆی دەست نیشان کردبوو، بۆیە بێ ترس ودڵە ڕاوکێ بە ئەسپایی بۆ ماڵی ئەختەر خشی. ئەختەر چاوی لێبوو، جەلۆ، بەشێنەیی بەکەلێنی دەرگای حەوشەدا هاتە حەوشە دەرگاکەی پێوەداوە، بۆ پتر دڵنیابوون و لە خشتە بردن جەلۆ هێشتا لە ناوەڕاستی حەوشەدا بوو، ئەختەر چووە پێشوازی، دەستی گرت بردی بۆ ژووری ولە سەر دۆشەکی (لووا) داینیشاند.

لە هێوارێوە سەماوەری جۆش دابوو، گیزەگیزی دەهات، دووچای خەستی بۆ تێکرد، بەمە بە یەکجارەکی لە ڕاستگۆیی ئەختەر دڵنیابوو. بەدەم چاخواردنەوەو گفتوگۆ هاتە سەرنمەك حەرامی و ناپاکی مچە، ئەختەر، بەئەنقەست چەند دڵۆپ فرمێسکی گەرمی بەسەر ڕوومەتی خۆیدا باراند، جەلۆ، پیاڵەی چای دانا گوتی:-

ئەختەرگیان، بۆچی فرمێسکان بەردەدەیتەوە.؟!

- چووزانم، بۆسەر بە(هەش)ی خۆم و مچەی قوڕبەسەر دەگرییێم، ئەوە دوو حەفتەیە مچە لەناو چاڵێدا زیندانی کراوە. چمە، لەبەر دڵڕەقی و سەرسەختی تۆناوێرم سەری بەسەردا شۆڕبکەمەوە، هەرنا خۆ، مچە سەرداری منە من خۆشەویستی تۆم، هەر لەبەر خاتری من، تاکو لەناو چاڵێدا لەزمان نەکەوتووە،

بوارم بۆ برەخسێنە، ئەگەر بۆ تاوێکیش بێ چاوم پێی بکەوێ، بەزەییت بێ گوناحە، دەزانم چاولەرێیە. بالێی نەبێتە کەسەر.!

: جەلۆ، لەبەرامبەر چاوی مەنگ و فرمێسکی ئەختەرزمانی شکابوو، بەسەرزاری دا نەهات بڵێ: نا.

- ئەختەرهەرچەند دەکەم نازانم بڵێم چی، لەبەر خاتری خاترداران دەستم شکاوە، ئەگەرنا، مچە، هی ئەوە نییە پیاو بەزەیی پێدابێتەوە، بەڵام دڵت نارەنجێنم، ئێستا لێگەرێ، چراکە کزکە با ئاوێزان بین. پاشان دڵت ناشکێنم.!

- نا گیانەکەم، ئێستا بیروهۆشم زۆر ئاڵۆزە، حەوسەلەی ئەوەم نییە، لەزەتی لێ وەناگرم.

- باشە، ئەی پێمنەگوتی: دڵت ناشکێنم. بەڵام دەبێ لە کاتێکی وادا بچی کەس نەزانی، ئەگەرنا، ئاغا لەدارم دەدات، باشە ئازیزم بادڵت دا بکەوێت.!

- جەلۆگیان، لەدەوری سەرت گەرێم، کات لە ئێستا لەبارتر هەڵناکەوێ، شەوە، شەوێکی ئەنگوستەچاوە، کەس بەدەرەوە نییە، بەپەلەپرووزە دەچم دەیبینم وبە چوستی دەگەرێمەوە، کە هاتمەوە دڵنیابە.! هەموو شتێك بەدڵی تۆ دەبێ، ئەوەش بزانە، مادام تۆ دڵی منت نەشکاندشەرت بێ منیش دڵت نەشکێنم، بەئارەزووی تۆ دەکەم. گوتت چی.؟!

- بڵێم چی، دەهەستە برۆ. بەڵام خوانەخواستە یەکێك بتبینی، ئەوساچۆن.؟!

- ئازیز، ئەگەر تۆ مەیلت لێبێ یارمەتیم بدەی زۆر ئاسانە، تووشی گیروگرفت نابین.

- چۆن.؟!

- جلوبەرگی تۆ، لەسەرپۆشاکی خۆم لەبەردەکەم، خەریتەو فیشەکدان لەخۆم دەبەستم، تفەنگەکەت بەدەستمەوە دەگرم، دەمامکی خۆم دەدەم، هەر کەسێك بمبینی.! وادەزانی جەلۆیە ئێشکی لە مچە گرتووە. نەبادا ڕابکات. دەڵێی چی.؟!

- بڵێم چی، وەکو منداڵ گرناگەت گرتووە، وازناهێنی.دەڵێم: ئامەننا؟

: جەلۆ، جلەکانی لەبەرەخۆی داکەناند، بەتۆی کراس ودەرپێی سپی دانیشتەوە. ئەختەر، کورتەکو شەڕواڵی بەسەرە خۆیدا هەڵکێشا، خەریتەی لەتەنگەی خۆی بەستا، تفەنگی بەدەستیەوەگرت خۆی تەیاردا، بەئەنقەست بەجەلۆی گوت: لێم دێ.!

جەلۆ گوتی: بێگومان. دواجار پێی گوت.

- جەلۆگیان، من وادەڕۆم، ئەگەر خودا.چ. مقەدەر نەدات، ماوەی جگەرەکێشانێك و دەگەڕێمەوە، لە دوای من چراکە بکوژێنەوە، لەم ساتەوەختە ڕۆناکی پەسند نییە، دەرگاکە هەر بەوالأیی لێگەڕێ، شمشێرەی ڕەپێش مەکە. بادەروجیران

لەجیرەجیرِی ناوەخت لێمان بە گومان نەکەون، ئیدی ئەوە ڕۆیشتم سەخلەت مەبە گیانەکەم، تاوێکی تردەگەڕێمەوە.

# (٢٢)

ئەختەر، یەکسەر بۆلای پوورە سێوە هەیپای لێکرد، ئاگاداری کردەوە، بەتەردەستی دەستبەکاربوون، پوورە سێوە دوو پەیژەی لێك بەستابوو. ئەختەر لەپێشەوە پوورە سێوە لە دواوە پەیژەکەیان هەڵگرت و بردیان هێشتانەکێ شەوی وەبەر مابوو، بەئەسپایی پەیژەکەیان شۆڕکردەوە بۆ ناوچاڵ، بەچرپە دەنگی مچەیان دا.! مچە سمۆرە ئاسای پێدا هەڵگەڕا سەرکەوتە سەرەوە، پڕی دا دەستی پوورە سێوە دەستی ماچ کرد، لەخۆشیان گریان لەهەوکیدا مابوو قسەی بۆ نەدەکرا، پاشان نێوچەوانی ئەختەری ماچکرد. گەرەکی بوو قسان بکات.. بەڵام پوورە سێوە بواری پێنەدا، پێی گوت:

- کوڕم، ئێستا وەختی کارە، وەختی قسان نییە، یاڵڵا بەخۆکەون درەنگە.!

ئەختەر گوتی:- ئێوە بڕۆن بۆلای تەویلەی ولاخان دوو ولاخان ئامادەکەن، منیش کارم بە جەلۆیە دەچم لەگەڵی یەکلا دەکەمەوە.

مچە پرسی؟

- ئەختەر، چی یەکلادەکەیتەوە..؟! ئایا هیچ ناماقولییەکی کردووە.؟!

- ئازیزم، کات وەبەری نەماوە. ئەوە خەمی منە، پاشان وەڵامی ئەم پرسیارەت دەدەمەوە. ئێوە دەست و بردکەن. من پاشی کەمێکی تر دەتانگەمێ.

پوورە سێوەو مچە. دەرگای تەویلەیان لە ڕێسمە برد، دوو هێستریان کورتان کرد، چاوەڕوانی ئەختەر بوون هەتا دەگەڕێتەوە.

: جەلۆ، پێلۆەکانی دەکەوتنە سەریەکدی دەبورژا، چاوی گەرم دەبوو نەدەبوو، ڕادەچڵەکی، دواجارخەو زەفەری پێبرد بەسەریدا زاڵ بوو دەستی لێستاند، کپ خەوی لێکەوت. ئەختەر، بەهێواشی بەدەرگای حەوشەدا چووە حەوشە، هەست

و خوستی نەبوو، هێدی هێدی وەکو دزی کارامە خشی، تاگەییە کۆسپەی دەرگای ژووری ماڵ، هەستی ڕاگرت، پێی نایە ئەودیوی کۆسپەی دەرگە دیقەتی دا.! جەلۆ لەسەر گازەرای پشت ڕاکشاوە، پرخە پرخی بوو، دەستی ڕاستەی هاوێتە مشتووی خەنجەر بەسپایی لەکالان دەریکێشا، چووە دیار سەری ڕاوەستا. یەکەم خەنجەری دایوەشاند خێواندیە سەر دڵی. دووەم وسێیەم و چوارەم دەستی لێ هەڵنەگرت، دواجار هورگی بەگۆڕێ وەرکرد. دواتر هیچ خۆی لەگورە نەبرد، هێمن وئارام خەنجەرەکەی جوان سترِیەوە وئاخنییەوەکالآن. سەر لە ئێوارێ هەندێك خواردن وکەلوپەلی پێویست بەخۆی ولۆ مچەی ئامادەکردبوو، کردیە پریاسکەو بەدەستیەوە گرت و بایداوە، بەدوای خۆیدا درەگای لەسەرلاشەی جەلۆ کلۆم دا بەچوستی هەیپای لێکرد بۆ لای مچەو پوورە سێوە گەڕاوە. گوتی:-

بە جەهەنەمم سپارد ئەنجا ڕووی کردەپوورە سێوەگوتی:

- پوورەگیان. قەت حەزم نەدەکرد گوندی زەردەشت ئاوا بەجێ بێڵم، بەلآم چارەنووس ئەوهایە هیچی لەگەڵ ناکرێ، ئێستاش نازانم چارەنووسمان بەچی دەگات.. پوورێ، دەزانی لەئاست گەورەیی و مەزنی دایکێکی وەك خۆت ئاسای زمانم لاڵە، نازانم چلۆن و بەچ زمانێك سوپاست بکەم، داوای لێ بووردن دەکەم.

- کیژم تۆ لە پێناو شەرەف و نامووس و کەرامەتی پیاوەکەت ئێرە جێدەهێڵیت، من پڕبەدڵ دەست خۆشیت لێدەکەم، چونکە بەرگریت لە نامووسی خۆت کرد، حەق وایە، ئافرەتان بەگشتی شانازیت پێوەبکەن، ئەم کارەی تۆ ببێتە دەرسێك بۆ پیاوان، وابێ ببڕای ببڕ جارێکی تر دەستدرێژی نەکەنە سەرنامووسی ئافرەتان. دەبێ ئەوەبزانن کە هەموو کونێك هی ئەوە نییەدەستی تێڕاکەن، ئێستاش ئۆغرتان خێر بێ دەستوبردکەن، بەدوای چارەنووسی خۆتان بڕۆن، هەردووکیان دا چەمانەوە دەستی پوورە سێوەیان ماچ کرد،پاشان لێ سواربوون ڕێگای ئەشکەوتی دێوانیان گرتەبەربەرێ کەوتن.

# (٢٣)

خۆرەتاو تازە گزنگی دابوو گەیشتنە ئەشکەوتی دێوان. دەمودەست بردینیان بۆلای هاوڕێ (غوربەت). دوای قاوەڵتی وپشودان. ئەختەر هوردوباریك لەسیری هەتا پیازی چیان بەسەر هاتبوو. بۆ هاوڕێ غوربەتی گێڕاوە، غوربەت، دەستخۆشی لە ئەختەر کرد. زۆریش شانازی بەهاوکاری و نەبەردی پوورەسێوە کرد. پاشان پێی گوتن:

- لێرە بەدوا ژیانتان ژیانی ئێمە، مردنیشتان مردنی ئێمە، وە لەسبەینێوە بەهاوکاری و هەرەوەزی هەمووان، خۆتان لێهەڵکەن خانووچکەیەك بۆ خۆتان دروست بکەن،پێکەوە لە ناویدا بحەوێنەوە.

بەلأم ئەوەش بزانن کە لێرە دەبێ هەمووکاربکەن. ئەختەر تۆ، لە گرووپی عەیشان دا دەست بەکاربە. بەلأم سەبارەت بە کاك (مستەفا) پێمخۆشە ئەگەر بەلایەوەگران نەبێ، پێویستمان بە (مەیتەرچی)یە چونکی لە ڕاستی دا پیاو چاتر لەژنان شارەزاو زووتر لە زمانی ولأخی بەرزە حاڵی دەبن، ئەگەر کاکی گەورەمان ئەوەمان لێقبووڵ بکات شانازی پێوەدەکەین.!

- بەچاوان غوربەت گیان، سوپاست دەکەم سوپاسی ئەم پێشوازیە گەرمە و میوانداریەتان دەکەم، لە ڕاستی دا هەتا شەوی ڕابردوو، من نەمدەزانی بەڵکو هەرگیز لەم بڕوایەدا نەبووم. کە توخمی ئافرەت هێندە بەجەرگ وبەوەفان. ئەوەی پوورە سێوەو ئەختەر بۆمنیان کرد. برا بۆ برای ناکات،

من بەگیان قەردارم بەڵێن بێ، نەك مەیتەرچی. هەرکارەکی پێم دەسپێرن بەدەستپاکی و شانازییەوە لەخزمەت دام. وە سوێندی شەرەف دەخۆم، بێجگە لە

ئەختەر کە حەلاَل و خۆشەویستی خۆمە، بەچاوی خوشك و برا سەیری ئەوانی دیکە بکەم.

- سوپاس کاك مستەفا، تۆ براگەورەی ئێمەی ڕێزت هەیەئێستاش هەروەکو پێمگوتن:

خانووەکی بچکۆلانە بۆ حەوانەوەی خۆتان قیت کەنەوە. ئیدی هەمووومان پێکەوە سەر پێکوە دەنێین. بزانین چارەنووس بەچی دەگات.

# (٢٤)

جەلۆ، خووی بەوەگرتبوو سبەینان زوو لەپێش عەلۆقاوەچی. دەچوو دەرگای دیوەخانی دەكردەوە. خەریكی ئاگردان وقاوەلێنان دەبوو، لەخورێنی یەكدوو فنجانی فڕدەكرد، بەلاّم ئەم سبەینەیە دیارنەبوو، خۆر وەبانان كەوت هەر دیارنەبوو، عەلۆقاوەچی دڵی كەوتە قرت وپرت، هەستا بەدوای سۆراخیدا چوو. ئەم سەرونەوسەری ئاوایی گەڕا دیارنەبوو، دواجار سەری بە حەوشەی ماڵی مچەونەختەر داگرت. هەست وخوست لەئارادا نەبوو، بانگی كرد (ئەختەر..ئەختەر) دەنگ نەبوو، پاڵی بەدەرگاوەنا كەچاوی پێكەوت جەستەی جەلۆ خەنجەرئاژن كرابوو زەندەقی چوو، لەجێوە چەقی، لەبەرخۆیەوە دەیگوت (یەككوو لەم كارەساتە، كارەساتێكی دڵ تەزێنە، ئێباشە خۆ جەلۆ لەختوخۆڕا نەكوژراوە، هەڵبەتە قەباحەتێكی گەورەی كردووە، ئەگینا ئەوەی من بزانم جەلۆ دوژمنداری لەگەڵ كەس نەبوو، كەچی مایەی سەرسوڕمانە بۆچی هاتووتە ئەم ماڵە؟! ئاخر تەنیا ژنێك و میوانداریان نەگوتووە.

: پاشان جاجمەكی لەبان هەرزارە داگرت تەرمەكەی داپۆشت، هەیپای لێكرد بەغاردان بەناوكووچەو كۆلاّنی گوندی زەردەشت ئاوا، وەكو شێت هاواری دەكرد.!

(هۆۆ خزمینە.. هۆۆ خەڵكینە. ڕەحمەتی خوداتان لێبێ، وەرن بگەنێ ئەمشەو جەلۆ، لە ماڵی مچەگزیر كوژراوە).

: خەڵك بەدوای بانگەوازی (عەلۆقاوەچی)دا ڕێچكەیان بەست هووردو درشتی ئاوایی لەحەوشە ولە دەوروبەری ماڵی

مچەو ئەختەر گرد بوونەوە. پیاوەکان لەحەیبەتان تاسابوون، بەڵام هەرچی ژنەکان بوون. لەخۆشیان ختوکەیانێ دەهاتێ. پیاوەکان لەوەسەریان سوورمابوو چونکی جەلۆ، بەتای کراس و دەرپێێ سپی لەمماڵەدا خەڵتانی خوێنی خۆی بووە، ئەوە مۆرکی ناپاکی بوو بەتەوێڵی پیاوان، لەگەڵ ئەوەشدا پیاوان هێشتانەکێ ددانیان بەجیڕەوە دەبرد. قسەی سووك و چروکیان بۆ ئەختەر حەواڵە دەکرد.!

(ئەو سەلیتەیە پەردەی بێ حەیای لەرووی خۆیدا هەڵماڵیوە، جەلۆی فریوداوە، خۆی پێ گەرم کردووتەوە، تاکو بەم ئەنجامەی گەیاند، مەگەر خودا بزانێ ڕەدووی کێ کەوتووە).

- چووزانم قوربان، گوایە لە دوێنێ ئێوارەوە سەری بەماڵدا نەکردووتەوە.

: ئاغا تاوێ داما بیری لێکردەوە، پاشان بەعەلۆی گوت:

- عەلۆ، دەبڕۆ چاوێك بەتەویلەی ولاخان دا بگێڕە. بزانە هێسترەکانی ئالیك داوە.! عەلۆ، بەهەڵەداوان چووسەری بەتەویلە داگرت، هێسترە قوولەو هێسترە شین بۆزی بەرچاونەکەوت. هێسترەکانی دیکەش نەئالیکیان لە ئاخوڕدابوو نەتەرەماش. لەبرسان لووشمە لووشیان بوو، هەیپای لێکرد هاواری بەئاغا ڕاگەیاند، ئاغا لە داخان سپی هەڵگەڕا، دڵی هەڵدەچوو هێڵنجی دەهاتی بڕشێتەوە. هەر لە جێوە لەسەر چینچکان هەڵقونجا، توونە چاوی خۆی گرت، پاشان ڕابووە سەرپێ، بەعەلۆی گوت: وەرە بابڕۆین.

: پوورە سێوە چاوی لێبوو، تاگەیینە سەر لێواری ئەو چاڵەی مچەی تێدا حەپس کردبوو، سەریان بەناو چاڵدا گرت، چاڵێکی ڕەق و ڕووت وهیچی تر. (ئەدی گیانە ژیان ئەوهایە، تۆ کەلە ئێوارێوە سەر دادەنێتە سەر بالیف، بەهیوای ئەوەی کە لەبەیانی ڕۆژی ئایندەدا پێ لە ڕکێفی ئەسپی زەمەن بنێی.

بەئارەزووی خۆت مل بەشتە زەمەنییەکان کەچ بکەی، لەژێر سێبەری پێت دا نەش و نما بکەن. جەلۆ دەمێك بوو شێت و شەیدای شۆخ و شەنگی ئەختەر لەکەللەی دابوو، شەوی ڕابردوو پێی وابووە کەلە سبەینەی ڕۆژی ئایندەدا پێ دەنێتە ژیانێکی خۆش و هەتا هەتایە بەختەوەر دەبێت. کەچی ئەوەتانێ والە هۆدەکی تاریك، تاکوتەنیا بەتۆی کراس و دەرپێی سپی لەسەر دۆشەکی لووا. سەرینی نەرمو نۆڵ لەخوێنی خۆیدا گەوزاوە. دەرگای لەسەر کلۆم دراوە).

: پوورە سێوە هەر وەك یەکێك نەبای دی بێ نەباران دڕی بەئاپۆرای خەڵکەکەدا، چوو سەیری تەرمی جەلۆی کرد، گوتی:

(چاوی دایکت کوێر بێ چەند بێکەسە).

لەدڵەوەش دەیگوت: (حەقە مستت بێ ناپیاو، ئەگەر نامووسی خۆت لەبەرچاو گرتبا خەڵتانی خوێنی خۆت نەدەبووی. بێ شەرمەفانە پێیانوایە کەئافرەت بێستانی بەر هەڵدرایە، هەر کەسێك بێت و لێی بڕنێت تێروپڕی لێبخوات پاشان میزی پێدابکات) پاشان چاوی چەقاندە دوڕچاوی پیاوەکان، هەروەك پییان بڵێ:

( ئەوە ئەنجامی دامین پیسانە فەرموون هەڵیگرنەوە)

: ئیدی جەلۆیان بەخاکسپارد پرسەیان بۆدانا، بالێرەوە خەڵکی زەردەشت ئاوا لە پرسەی جەلۆ بەجێ بهێلین، هەوراز بینەوە بچینەوە بۆلای ئافرەتانی یاخیبوو لە ئەشکەوتی دێوان، بزانین باس و خواس چییە.؟!

# (٢٥)

كاروبار لەئەشكەوتی دێوان زۆر بەرێك وپێكی بەڕێوەدەچوو، مچەو ئەختەر، خانووچكەیەكی خۆشیان بۆخۆیان بنیاتنابوو، هەندێك لەجەنگاوەرەكان خەریكی تاوتوێ كردن وعەمباركردنی دانەوێڵە بوون، هەندێكیان بەكاری نان كردن و چێشت لێنانەوە خەریك بوون هەندێكی دیكەیان خەریكی سەنگەر دروستكردن بوون، هەندێكیان بەنۆبەت لەقوڵغەكاندا ئێشكیان دەگرت. بەگشتی هەرهەموویان سەرگەرمی كاركردن بوون. ئەو ئافرەتانەی كە تازە دەهاتنە ڕیزی یاخیبووان لەئەشكەوتی دێوان، بەزۆری كچەعازەب وشۆخەژنی (هەوێ)دارو ئەو ژنانەبوون كەلە هیچ و خۆڕا (تالوقە) كرابوون ئەوانە دەستەدەستە لە مەشقی بەكارهێنان وڕاهێنانی چەك دابوون، زۆرجاران لەكاتی مەشقدا هاوڕێ غوربەت قسەی بۆیان دەكرد. (هاوڕێیان ..ئێمە كەلێرە لەئەشكەوتی دێوان دەستمان داوەتە چەك و یاخی بووینە، دژبەكۆمەڵ و ژیانی هاوسەری و خێزانداری چەكمان هەڵنەگرتووە. بێگومان لە ختو خۆڕاش نیە، ئێمەلە دژی گومڕایی پیاو سالاری دەستمان داوەتە چەك لێیـان هەڵگەڕاینەوە. چونكی ئەوان بەچاوی كۆیلەو زەعیفەو نۆكەرو هەڵس وكەوتمان لەگەڵ دەكەن. بەچاوی سووك تەماشامان دەكەن. لەبەرامبەر خۆبەزلزانین وگومڕایی كۆمەڵی پیاوان چار نییە، دەبێ بەزەبرو زەنگی چەك وەڵامیان بدەینەوەو بەربێنگیان لێبگرین، هەر یەكێك لەئێمە لەژیانی دا ماڧی شووكردنی بەئارەزوو، ماڧی كاركردن، كۆكردنەوەی سەرمایەماڧی موڵكداری، یەكسانی لە بەشە میرات، ڕێزگرتن لەماڧی ژن و مێردایەتی، هەروەها پەیوەندی كۆمەڵایەتی زۆر شتی دیكەش، هەروەها ئەوەش

بزانن، کەلە هیچ دەوروزەمانێکدا مافنابەخشرێ، دەستێندرێ، من بەش بەحاڵی خۆم بۆ ستاندنی ئەم مافانە تەنها لەلوولەی تفەگدا بەدی دەکەم.

بۆیە دەبێ لەپێناو داخوازیەکانمان برەو بە ڕاهێنان و بەکارهێنانی چەك بدەین. چونکی کاتێ کە مرۆ چەکی بەدەستەوە بوو، هێزێکی کاریگەر ئاوێتەی گیانی دەبێت، لەبەرامبەر دوژمنانی دا دەبێتە شاخێکی سەخت و ڕەق قەت نارمێ)

: هاوڕێ غوربەت، بەم قسانە دووشتی زۆر گرنگی لە دڵ ودەروونی جەنگاوەرەکان دا دەرواند.

یەکەم: فێری ڕێزگرتن و خۆشەویستی و پیرۆزی ژیانی هاوسەرێتی دەکردن،

دووەم: فێری بڕوا بەخۆبوون و خۆڕاگرتنی دەرکردن، بۆبە دەستهێنانی مافەکانیان. بۆیە هەرهەموویان گوێڕایەڵ بوون غوربەتیان لە خودی خۆیان خۆشتردەویست. بەلێ لەئەشکەوتی دێوان هەر هەموو سەرقاڵی خۆڕێکخستن وخۆئامادەکردن بوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هێرش و پەلاماردانەی کە پیاوان بەتەمان لەم چەنانە دەستی پێ بکەن. گەرەکیان بوو بەزمبرو زەنگ سەر بەکیژگەلی یاخیبوو شۆڕبکەن هەر سێ چواریان لە پیرەمێردەکی کەنفت مارە بکەن.. هاوڕێ غوربەت لەکاتی تەنیاییدا بەزۆری بیری لەم شەڕە چاوەڕوان کراوەدا دەکردەوە. هۆش و هزری خستبووەکار نەخشەو پلانی بۆدەکێشا.

: ڕۆژێکیان بانگی مچەی کرد.. (لەو ڕۆژەی کە مچە هاتووتە ئەشکەوتی دێوان بەمچە گازی ناکات، یان بەکاك مستەفا یان بە هاوڕێ مستەفا بانگی دەکرد) پێی گوت:-

- کاك مستەفا، سبەینێ دابەزە خوارێ، بەدێوەرە و بازرگانان ڕاسپێرە. بەڵکو ناڵبەندێکی کارامە ڕادەسپێرن بێ وڵاخەکان ناڵ بکاتەوە، هەرکاتێکی ناڵبەند

هات. لەدەم ڕووبار شوێنەکی بۆ دەست نیشان بکە. پاشان خۆت ولاخەکان بەرە بۆلای با ناڵی تازەیان بۆ چێبکات. شتێکی دیکەش هەیە حەزدەکەم پرست پێبکەم. حەزم لێبوو ئەگەر جەنگاوەرەکان فێری سوارییان بکەی چونکە پێموایە دەستەیەك، دووان هێزی سوارەمان هەبێ بۆ ڕۆژی تەنگانە خراپ نییە.!

- هاوڕێ لێتان ناشارمەوە کەمن، تاکو ئەو شەوەی کە پوورە سێوە و ئەختەری هاوسەرم. لەزیندانی ناوچاڵ ڕزگاریان کردم، وە ئەختەر بەخەنجەران گیانی پیسی جەلۆی حەرامزادەی بە دۆزەخ سپارد. وامدەزانی کە خیانەتکاری تەنها لەژنان ڕوودەدات، بەلاّم ئێستا گەیشتوومەتە قەناعەت کەمن بەهەڵەدا چووبوم، ئێستاش لەو ڕۆژەوەی کە هاتومەتە ئەشکەوتی دێوان. فرە دڵخۆشم بەوەی کەلێرە ئاسوودەم،

وەهەرکارێکی پێم دەسپێرن بەدڵ و بەگیان جێ بەجێی دەکەم.

- کەواتە دوای ناڵ'کردنەوەی ئەسپ و ولاخەکان، لە کەمو کوڕی و پێویستییەکان ئاگادارم بکەوە، تاکو بۆت دابین بکەم. پاشان دەست بەکار بە لە مەشق و ڕاهێنانی جەنگاوەرەکان فێری سوارچاکییان بکە.

: بەڵێ، یارۆ، ژنانی گوندنشین زۆر سەلیقەدارو بەتوانان لەکاری قوڕکاری، لە کێڵگەوەمەزرارەوا جوتیارن، کاتێ کەداس بەدەستیانەوەبگرن سەپانن، کە پێیان دادەنێنە سەر (ئەسپەرەی پێمەڕە) جۆوانن، هەرگاوێ گۆپاڵ بەدەستیانەوە بگرن شوانن، لەئانی شەڕی دووبەرەکیدا بەرچیغ بەدەستن ،لەسواری دا سوارچاکن. دەست بۆ هەر شتێك بەرن، لەناوچنگیاندا دەبێتە هەویر.) ئەسپەکان لەهەفتەی یەکەمی ڕاهێنان سەرکێشییان لەگەڵ دادەکردن، بەلاّم ڕۆژانی دواتر مچەمەیتەر وای ڕاهێنابوون، کە خۆیان هەڵدەدا سەر پشتی ئەسپ و جڵەویان لێگورج دەکرد، ئاوەزنگیان تێدەسرواند، ئەسپ گوێی کەروێشکە دەکرد، وەکو نێریە مامز بۆی

دەردەچوو، لەسەر قوڕێ تۆزی دەکرد حەددی چبوو.؟! لەبن دەستیان سەرکێشی بکات. هەرلەبای غاردان بەبن زگی ئەسپ دا ئەم تەنکێش و ئەو تەنکێشیان دەکرد.دەتگوت: هەر لەئەزەلەوە ئەسپ سواربوونە، هاوڕێ غوربەت کە دەیدیتن ئەوها تاو بەئەسپان دەدەن ئەسپ لە ژێریاندا خەریکە باڵ بگرێ، لەخۆشیان شادو شەنگوڵ دەبوو. هەناسەی شادمانی هەڵدەکێشا.

: بەلێ خۆشەویستی و تەبایی هەموو کون وقوژبنێکی لە ئەشکەوتی دێوان گرتبۆوە، ڕق وکینە ومخەننەتی تێچۆڵابوو، خرشتەکانی ئەم دەڤەرە بۆ یەکدی پێدەکەنین هەرچی مەخلوقاتی لەم ناوچەیەدابوون، هەرهەموویان هێمن و ئارام و ئاسوودە بوون. ئەوە تانێ ڕەوەی شووروبزنەکێوی بێ ترس و بەدڵنیایی چرە لەگیای بن پووش وپەلاش و گەومرە شاخ وپەژمووردەی گەلای داران دەکەن. هەموو سبەینەو هێواران بزنەگەل ئاسای. بێ سڵەمینەوەو دڵە ڕاوکێ، وەبەر چاوی هەمووان ڕێچکە دەبەستن بۆ سەر ڕووبار. زۆر بەشێنەیی تێرئاو دەخۆنەوە، پاشان بەهەڵبەزو دابەزو یاریکردن بەرەو چیاکان ولانەکانیان بەهەورازدا کێلدەبنەوە. بزنەکانیان وەکو دایکێکی میهرەبان، خۆیان بەسەر بێچوەکانیان دا دەهێنن تێرشیریان دەکەن، دواتر وەکو خێزانێکی بەختەوەر سەر بەیەکدی دەکەن بێ خەم و خەیاڵ دەخەون.

# (٢٦)

کوشتنی جەلۆ، کەوتەسەر زمان و زاران، لەگشت کووچەو کۆلآن و لەسەر کێلگەو دیوەخانان دا، باس و خواس هەرباسی کوژرانی جەلۆ بوو. بەلآم پیاوان قەت بەسەر زاریان دانەدەهات باسی ناپاکی و دامێن پیسیی و بەدڕەوشتی جەلۆ بکەن.

پێیان وابوو ئەگەر بەخراپە ناوی بێنن لەدین وەردەگەڕێن. لە شەقلۆ هەیبەتی پیاوانەیان کەم دەبێتەوە، تەنها سەرزەنشتی ئەختەریان دەکرد. بەسۆزانی و ئابڕوتکاو ناویان دەبرد تۆی ڕق وکینەیان لەدلآندا دەچاند. بیریان لە تۆڵە کردنەوە دەکردەوە، هەڵس و کەوتیان لەگەڵ ژنەکانیان توونلو تیژتربببوو، جنێودان ودەمەقاڵێ پەرەی سەندبوو، خێزان نەبوو شەڕو ئاژاوەی تێنەکەوتبێ. لەئەنجامی ئەم شەڕو دووکەدووکەوە بەچەندان ئافرەت تالووقە کرابوون، پیاوی واهەبوو لەپای شتێکی کەم و بێ بایەخ ،دەماری پیاوەتی جووت دەبوو، سێ بەردەی فڕێ دەدا. دەستی لەبنی هەنبانەدەما، پاشان خۆی داوێتە بن دەست و پێی مەلا، خۆی دەخیلی دەکات بەڵکو تەلآقی چاك بکاتەوە. مەلا، فەتوای مارەبەجاشی بۆ دەدات، ئەویش چاوی خۆی بەردەداتەوە. واتا ژنی خۆت بەڕەزامەندی خۆت لەقەبەل پیاوێکی دیکە بکەی. بەمەرجێك، شەوێك هەتا بەیانی بیتەقێنێتەوە ئای لەم قەباحەتە.

پوورە سێوە خۆی هەڵکردبوو هانی ژنانی تالۆقەکراوی دەدا پێی دەگوتن:

(نەکەن چاو بەردەنەوە گوێیان مەدەنێ بابەم دەردەوە بتلێنەوە، بەڵکو بەم (لۆلکە)خواردنەیان ئەوانی دیکە پێ تەمبێ دەبن،هەر.. هەڵەی خۆیەتیان

ئیوەچۆن.؟! ڕازی دەبن شەرەف و ناموس و (شەرمینگە)تان. لە پێناو هەڵە و سەرسەختی و سەرەڕۆیی پیاوسالاری دا، بنێنە بن دەستی کابرایەکی بێگانەوسپێدە زوو سێبەردتان لە مست بنێ، ئاینی ئێمە ئاینەکی پیرۆزە (بیژی) زۆڵ بەخۆی ناگرێ، ئەوە حەیا چوونە، سووکایەتی کردنە بەئافرەتان.. بەزۆری زۆردارەکی بەسەریاندا دەسەپێنن، مادام ژیان بەلەتێك نان و چوڕێك ئاو مەیسەر دەبێ، نابێ لەپێناو نان وئاو خۆتان چاو بەرەو ژێر کەن. چاو بدەن خوشکەکانتان لەئەشکەوتی دێوان. چەند سەربەست و سەربەرزن. وێرای ئەمەش هیچ پێویستییان بە ڕێنمایی و چاوەدێری پیاوان نییە، خۆیان ئەرك و کاروباری ڕۆژانەی خۆیان زۆر بە چاکی بەڕێوە دەبەن لە هیچیان کەم نییە. ئامادەن بەرگری لەماف و کەرامەتی خۆیان دەکەن): ژنان چیتر لە حەوسەلەیان دا نەمابوو لە ئاست سووکایەتی پێکردن و دەم شڕی پیاوان بێدەنگبن. بۆیە لە هەرکاتێکدا فرسەتیان بۆ بڕەخسابایە، تێیاندەتەقاند دەچوونە ڕیزی ئافرەتانی یاخی بوو لە ئەشکەوتی دێوان.

# (٢٧)

ئاغا وپیاوانی ژن هەلأتوو، کوڕانی خوشك ڕاکردوو، ئەو جحێلانەی دەزگیرانەکانیان لە ژووانی ژووژکاندا جێیان هێشتبوون، زۆر ڕژدو پەرۆش بوون هەرچی زووە ڕۆژێك پێشتر دەستبکەن بە هێرش و پەلاماردان، بۆ سەریاخیبوان. ئەشکەوتی دێوان بکەنە کوشتارگە بەڵکو ئەو (زل)ە لەچاوی خۆیان دەردەکەن، چیتر لە دیوەخانان چاوبەرەو ژێری خەڵك نابن، بەتایبەتی زینەڵ ئاغا. چونکی لەو ڕۆژەوە کە هەردوو ژنەگچکەکەی ڕەویانکردووە چاووڕووی ئەوەی نەبوو لەبەرامبەر ئاغاو پیاوماقوڵ و قۆلە کێخوایان چاو هەڵێنێ، بۆیە بەکوشتنی جەلۆ لەناخەوە دڵخۆش بوو،حەزیدەکرد.! هەموو شەوێ زەلامێك دووان بەدەستی ژنان بکوژرێن، تاکو خەڵکەکە گوێڕایەڵی بن دەیگوت (خزمینە، بێگومان جەلۆ مرۆیەکی دەست و دامێن پاك و ڕەوشت بەرزو بەناموس بوو، سەت حەیف و مەخابن بۆ جەلۆ بەدەستی ژنان بکوژرێ. جەلۆ پیاوەك بوو نوێژت لەسەر تەشکی دامێنی کردبایە قبوڵ بوو، چمە سەری چووبا نوێژی دەچوواند، نەخێر کوفر بوو نوێژی چووبا، کاشکا تەرمەکە ودەدیت. چۆن.؟! بەنووکە خەنجەر گێرەکرابوو، وەڵلاهی ئەوەی ئەو خودا نەناسە بەجەلۆی کردبوو، جوولەکەی خەیبەر، گاوری بێ دین وئیمان کافری زەندیق نایکات.

کوڕینە، ئەگەر لێیان بەخۆ نەکەوین.؟! هەرهەمووومان لە پیاوەتی دەخەن، بەدەردی حەمەبۆرو کەلۆس و جەلۆمان دەبەن ئەگەر لێیان بێدەنگبین.؟! لە ڕۆژ بازاڕی قیامەت دا، ڕۆحم بەقوربانی بێ ،پێغەمبەر(د.خ) لەسەر بێ، هەرگیز شەفاعەتمان بۆ ناکات، دەرگای بەهەشت بەڕووماندا پێوەدەدرێ، تووشی عەزابی

دۆزەخ دەبین، ئاخر ئێمەی هیچ و پووچ چۆن.؟! بەرگەی غەزەب و عەزابی ئیلاهی دەگرین، وەڵلاهی ئەگەر لێیان بێدەنگ بین.؟! سەلبی ئیمان دەبین، لەگەڵ سالحۆكەجوو پێكەوە حەشر دەكرێین. دەیگوت:

تەڵلاهی شەرمە بۆ ئێمە، بەخۆمان بڵێین پیاو، ئەوتانێ چوار دێڵە بەبای ناوگەڵ تەڕ، پەردەی شەرم و حەیایان لەڕووی خۆیان دا هەڵماڵیوە، لێمان هەڵگەڕاونەتەوە دایتیانە شاخ، وەكو قەساب زەلام لەت لەت دەكەن، لاشەكەی دەرخواردی دەعباوسیسارکەکەچەڵە دەدەن، خزمینە، هەر كەسێك لە ئێوە دەخوازێ پەروەردگار لە گوناحەكانی خۆش بێ..! بابێتە ڕیزی لەشكر، بۆ لەناو بردنی ئەو تاقمە بێ ڕەوشتەی كە ڕێز لە داب و نەریتی باب و باپیرانمان ناگرن).

: ئاغا بەزمانی لووس و حۆقەبازی ترسی لە دڵی خەڵكەكە ڕواند، خەڵكەكە لە ترسی ڕۆژی حیساب وعەزابی ئاگری جەهەننەم. هزرو هۆشیان لانەمابووپۆشاكی بەریان لێببووە دەرزی لە ڕۆح وجەستەیان دەچەقی، پڕ هەڵمابوون هەڕوگیفیان دەكرد.!

(لەشكریان بۆ دەكەین،ئەو مرتەددانە لەناو دەبەین). دەستەودوعا لەیەزدان دەپاڕانەوە، خودایە فرسەتمان بدەی لەناویان بەرین.

: ئاخروئۆخری پاییز بوو، شڵێوەی تۆزوبا، لەسەر ڕێگای خۆڵەپۆك لەگێژەنی دەدا باریك بەئاسماندا هەڵدەچوو، گەواڵە هەوری بۆر یەكدی گردەبوون بەریان لەخۆر دەگرت. مرۆ سەری لێدەشێوا، كاتی لێدەگۆڕا بە خۆرهەڵات وڕۆژئاوای خۆی نەدەكەوت. لەو ڕۆژەناخۆش و دژوارە دا لە ئاوایی زەردەشت ئاواو گوندەكانی دەوروبەر گەڕەلاوژمیەكی سەیر لە ئارادابوو،پیرو جوامێر،جحێل و هەرزەكار، هەربابابوو تفەنگ، دەمانچە، ساچمە وقرمە وتاپڕی ڕاو، خەنجەر، تەوشوو، تەور، كۆنە سیكارد، شیر، زەرگی دەروێشان، خوترمە، شەنەی ئاسن،

لاپووتە، پیشەقانیان بەدەستەوە گرتبوو، تاك تاکیان بەسواری ئەسپ و ماین بوون، هەندێکیان هێستروبارگین ویەختەیان لەبن دابوو، هی وا هەبوو سواری پشتی گوێدرێژبوو، هەبوو چوار پێی دەست نەکەوتبوو بەپیادەڕۆبوو، ئالأی کەسکیان هەلکردبوو تۆز بەری عاسمانی گرتبوو بەرەو گوندی زەردەشت ئاوا کەوتبونەڕێ دەهاتن. بێجگە لە دیوەخانی زینەلْ ئاغا بەچەندان ورشمالْ و خیوەتیان بۆ هەلدابوون ،

دوای عەسرانێکی درەنگ حەشیمەتی لەشکری غەزا بنەوبارگەیان لەزەردەشت ئاوا ڕاخست مۆلبوون تەگبیر وابوو دوای نوێژی بەیانی پاش ڤاوەلتی کردن ناوی خودای لێبێنن ڕێگەی ئەشکەوتی دێوان بگرنەبەر. برۆن بۆ ڤەتل و عامی یاخی بووان، پێیان وابوو کە بەکوشت و بڕی ئافرەتان، خودایگەورەو میهرەبان لە گوناحەکانیان خۆش دەبێت و بە مسۆگەوری دەرگای (ڕەمیان)یان بۆ والأ دەکرێتەوە، لەگەلْ (٧٢)حۆری ئاوێزان دەبن. ئاغا سەرلەهێوارێ فەرمانی دا هەرچی ئافرەتی لە ئاوایی دا مابوون. دەبێ ئەمشەو بێن بۆ مالّی ئاغا، نان و خواردن بۆ تاشتی لەشکر ئامادە بکەن. بەچەندان جوال و کەندووە ئاردیان کردە هەویرونان، بەدەمیان مەنجەلّی زنجیردار لێوان لێوبوو لە چێشتی شلەساوار، سێچوار کوشتیان کوشتبۆوە، بۆن و بەرامی شلە ساواربەگۆشت لەم نیوەی شەوەدا دەمار دەمار دەڕۆیی هەرچی تورگو ڕێوی ئەم دەوروبەرە بوو. لەتاو بۆن و بەرامی گۆشت بەویقەویق کەوتبوون. سووڤیان دەبۆوە.

: پوورە سێوە سەرپەرشتی چێشت لێنەرەکانی دەکرد، بەلأم لەحەیبەت کیژگەلی ئەشکەوتی دێوان بەخەم دا کەوتبوو، ئۆڤرەی نەدەگرت، دەهات و دەچوو حەجمانی نەبوو. لەبەرە خۆی بلمەبلمی بوو دەیگوت:

(چیبکەم.؟! حەیای سەردەروبن دەرمان دەچێ، ئای لەخۆم سەربەهەشێ، هەرچەندی بیردەکەمەوە نازانم بۆچی زەینم کۆربووە، ئاوها کۆلەوار بوویمە هی وەکو من بۆ مردن باشە).

دەقرقرا، کێچی کەوتبووەکەولی ئارامی لەبەر براببوو، لەقاران لێوی خۆی دەکرۆژتەوە. ئافرەتەکان بەدیار مەنجەڵەکانەوە لار ببوونەوە، کپ خەویان لێکەوتبوو، تەنیا پوورە سێوە بەسەر پێوە بێدار بوو، خەو تخونی چاوی نەدەکەوت، بەئەندێشەی خەیاڵدا چووبوو بیری لە شتێکی هۆتۆ دەکردەوە وابێ ئەم لەشکرە جرِوجامشتەبە پەندیان ببات. هەر بەم خەیاڵەوە بەمەنجەڵەکان داهات یەك یەك دەرخۆنەی لەسەر هەڵدەگرتن. تامی چێشتەکەی دەکرد. ئاخۆ تام و بۆو برِی سوێری چلۆنە، لەو ئانەدا هزر لە بلاچەی دا.! (چێشتێکی زێدە چەورو سوێر، هەندێك(گلێخە)و زەردەچوو بکە چاوی لە خورینی بیخۆن، وەکو بزنی بەدان کەوتە بەخۆراناگەن دەفیرکێنن) لەخۆشیان زەردەخەنەی شادمانی کەوتە سەر لێوی. لەوەوپێش قوونکە فەردەیەك گلێخەی بەپشەقان لە ژێر زەوی هەڵقەناندبوو بۆ بزنان. چوو هێنای بەچەقۆ سەرو قوونی کردپەلکی لێداماڵی وەکو(پیاز)خستیە ناو مەنجەلان. بەلەگەن خوێی تێکرد، هەندێك زەردەچووی کردەچاوی، زارکی هیزە رِۆنی کردەوە مەنجەڵۆکەك دۆنی لێدەرکرد. پێداهات هەر مەنجەڵەك و شەش، حەوت ملاك دۆنی بەسەردا کرد، دواجار بەکەوگیر تێکی دا، تاوەکو تەواو تێکی هەڵشێلا.. لەبەرە خۆی دەگرژییەوە دەیگوت: (مەنگۆزینە لەشکر دەکەن، بۆم راوەستن شەرت بێ بەدەردێکی واتان بەرم، هەر هەموتان خۆ پیس کەن برِیخێنن).

دوابەدوای بانگ و نوێژی بەیانی خواردن تێکرا، ئیدی لێبەخۆکەوتن ملیان لەبەرنا دەتگوت: نۆ شەوو نۆ رِۆژە بەریان لەتەبارە گرتووە تامی زادیان

نەكردووە هێندە برسى بوون. پوورە سێوە ناومناوە دەنگى هەڵدەبڕى دەنگى ئافرەتەكانى دەدا دەيگوت: (بۆيان تێكەن، ڕێگايەكى دوورو هەورازيان لە پێشە نەبادى برسى بن، دەى بخۆن باوكم باشى بخۆن) بەخۆشى بەسەرياندا دەسوڕا، پيازى تيژوكەسكوونى بەسەرياندا دەبەخشيەوە، پتر هانى دەدان.! (بەقوربانتان بم، بتانبينم ئەمڕۆ سەرى خۆتان و سەرى ئێمەش بەرزبكەنەوە، ئەو تيتك براوانە دەرسيان لەشەيتان وەرگرتووە، ئەگينا ژن خۆى چ هەيە تاكو بەربێنگ لە پياوان بگرێ، ئەوەيەكێكە لە نيشانەكانى دنياخرابوون. ئەگەرنائەمەت نەبووە ژن بەڕووى پياواندا هەڵگەڕێتەوە، ژن چييە.؟!خودا دروستى كردووە بۆ بن چۆكى پياوو زاوزێ و هيچى تر).. سپێدە لە ئەنگاوتن دا بوو، خۆر هێشتان لە پەنا كێوە بەرزەكانى سەر ئەشكەوتى دێوان بەدەر نەكەوتبوو، تەپ و تۆزى لەشكرى (دەجال) لە ئاوايى زەردەشت ئاوا بەدەركەوتن ڕۆيشتن (زۆر جاران لە كتێبە كۆن و ئەفسانەكاندا خوێندوومەتەوە گوايە لە كۆتايى ڕۆژانى دنياخرابوون دا، قۆشەنى دەجال گشت ولآتانى دنيا داگيروخاپوور دەكات، نيوەى شارى (بەغدا)ش دەگرن، بەلآم لەشكرى پێ بەزمنگار بەربێنگ لەلەشكرى دەجال دەگرن و تێكوپێكيان دەشكێنن. قۆشەنى ئەو گومڕايانەش لە بێ سەروبەريدا لەلەشكرى دەجال خراپتريان بەسەر دادێ قورمساخانە پێيانووايە كە بۆ ڕاوە (تەمال) دەچن. خۆ ئەگەر بۆ ڕاوەكەروێشكيش بچن. لەبەر ئەم گەرەلاوژميەو زەرزەرى زەرينى نێرەكەرو قەوچەقەوچى ماكەرو لووشمەلووشى هێسترى ماچەى بەتەرەب دەست لە گونان دەمێنن، يەك تەمال چييە.؟! بۆيان ڕاو ناگرێ) لەلايەكى ديكەوە هەرچەندى خۆر بەرزدەبۆوە گڕى خۆرە تاوەكە گەرمتر دەبوو. بەرەبەرى نيوەڕۆ گەرماكەى بە تێن ترو كوشندە تر دەكرد، چێشتەكەى پوورە سێوە كارى لێكردبوون، هەربابا بوو دەستى بە زگى خۆى وەگرتبوو، بەدۆخينى خۆى

ڕانەدەگەیی، خۆی دەگەیانده پەناگەیەك یان لە جۆمێك هەڵدەقوونجا هەتا ئیسراحەتی دەکرد، کە هەڵدەستاوە(صل)ێکی بازنەیی لەشوێنەکە جێدەهێشت، ئەوانەی هێشتانەکێ دووچاری فێرکاندن نەبووبوون، لەبەرایی لەشکر بەنیازی ئەوەی کامە ئافرەتی شۆخ و شەنگە بیکاتە موڵکی خۆی، بۆیە خێراخێرا دەڕۆیشتن.

# (٢٨)

هاوڕێ غوربەت، لەدوێنێ ئێوارەوە خەو نەچووبووە چاوی، لەدەورو خولی ئەسپەشێ دا بوو، ئەسپی تاین هەستی بەگرژی و توڕەیی غوربەت کردبوو، گوێی بۆ مووچکردەوە لە جێوسمکۆڵی دەکرد. دنیایەکی کشومات زیندەوەرو باڵندەکانیش مت و بێدەنگبوون، سوێندت خواردبایە کە دەڤەری ئەشکەوتی کێوان گیانلەبەری تێدا نییە. جەنگاوەرەکان لە سپێدەوە خۆیان لە سەنگەردا قایم کردبوو، کاتێك نیوڕان لەکەلی کەوتبوو، بەرایی لەشکری گەرەلاوژە داخزابوونە ناو گەلی، پێشبڕکێیان بوو کێ زووتر دەگاتە ئەشکەوتی دێوان جوانترین شۆخ و شەنگ بۆخۆی گوڵبژێربکات، دوایی و پاشماوەی لەشکر وەکو(کلۆ)ی دەرمان خوارد گێژو وێژ بەگەلیدا وەربببوون، ئەوانەی تفەنگ بەدەست بوون، ناوەناوە فیشەکەکیان ئەنایە لاپاڵ دەنگی دەداوە ، زۆر بێ موبالات دەچوونە پێش.. هاوڕێ غوربەت لەبەر خۆیەوە گوتی:

(نەخێر، شەڕ دەرکی ماڵی لێگرتین، کارلەکارترازا) دواتر جەنگاوەرەکانی هشیارکردەوە گوتی :(وریای خۆتان بن ئارامتان بێ، کەس لەسەنگەر نێتە دەرەوە، دەستتان بەفیشەك وەگرن، بێ نیشان گرتن تەقەیان لێ مەکەن. لێیان بێدەنگبن بابێنە پێش کەی هاتنە بەر سێرەی تفەنگ. ڤێجالێیان ئاگردەن، دەست مەپارێزن، وابی بەخۆیان ڕانەگەن). هێدی هێدی شەڕ گەرم دەبوو لەزۆر شوێنان دا پووش و پەلاش ئاگری گرتبوو، چڕە دووکەڵ بەئاسماندا هەڵدەچوو، لەمبەر ئەوبەری گەلی لەدوندی چیالێیان هاتبوونە دەست، هەرچۆنی سێرەیان لێدەگرتن گوللەیان بەفیڕۆ نەدەچوو، تادەهات توونوتیژوگەرمتر دەبوو، گوللەبەگوللە

دەکەوت، برێشکە ئاسای بەسەریاندا دەتەقییەوە گیریان خواردبوو نەیاندەتووانی پێ لەبەرپێ بنێن، شۆق و شلۆق ببوون. گێژوهوڕ ببوون، وەکو مێگەلی مەڕومالأت کە گورگ دابرِدابرِیان دەکات وخرِدەبنەوە باری یەکدی تێکدەقژقژین، لەشکری گەرەلاوژە بەهەمان شێوە سەریان لێ شێوا بوو، تێکدەقژقژان خرِدەبوونەوە باریەکدی دەبوونەوە دووبرِ، ئۆقرەیان نەدەگرت پەرتەیان لێدەکرد، هەریەك بەلایەکدا پەرتەوازە دەبوون. بەدەستڕێژدایاندەگرتنەوە بەرتفەنگان، خرِیان دەکرنەوە باریەکدی، بەقوونەشەرِ دیسان بلأوەیان لێدەکرد، لەپاشەکشەدابوون، نەخێر پشتیان دا خەریکی خۆدەربازکردن بوون. کەسیان نەدەبووە برای کەس، هەربابا بوو بەقوونە دزە خۆی قوتاربکات،چوار پێنجەکیان هەڵدێرابوون، بریندارەکان داوای ئاویان دەکرد. بەلأم ڕۆژە ڕەشێکی وابوو کەس ئاوڕی لێیان نەدەداوە زۆر شپرزەو شەپرِێوببوون، لەهەمووی سەیرتر ئەوە بوو.! یەکێك لە ڕەشماڵ نشینەکان گێڕایەوە گوتی:

(لەکاتی تێکشکان و هەلأتندا، کابرایەکی حاجی بەتەمەن گەورەم بینی رایدەکرد، لەگەڵ ڕاکردندا پێی تێکدەئالأ. جاری وابوو بەردەبۆوە، بە هینکەهینك دەستی دەدا بەرخۆی هەڵدەستاوە. گوێم لێبوو لەخوداوەند دەپاڕاوە دەیگوت (خودای گەورەومەزن بەمیهرەبانی خۆت ئەمجارەیان چەپارەم بدەی بەساخ و سەلامەتی بگەڕێمەوە مەنزل. ئەوسا هەرخۆم دەزانم چلۆن حیسابی خۆم لەگەڵ (مەلا) یەکلادەکەمەوە.. لێم پرسی ؟

- باشەحاجی گریمان وابەسەلامەتی گەیشتیەوەماڵ، حیسابی چی لەگەڵ مەلا یەکلادەکەیتەوە.؟!

- شەرت بێ هەربگەمەجێ لەباتی عیزرائیل ئەبم بە قابزی ڕۆحی.

- ئێ باشە، بۆ مەلا لەپای چی.؟!

- تۆنازانی ئەوەی بەسەر ئێمەداهات، مەلا بەئێمەی كرد. بەزمانی لووس فریوی داین لەگەڵ ئاغا كلكیان كردبووە یەك دەیانگوت :

(ئەوانە مورتەددن، دەبێ لەناویان بەین.بەدۆزەخیان بسپێرین، بەگفتی مەلا،لە ڕۆژی حەشروقیامەت، هەریەكەو (٧٢)حەفتاودوو (حۆری)مان دەقەبەڵ دەكەن، بەلاَم ڕاست ناكات. چونكی ئەگەر وابێ حەفاودوو حۆریمان بدەنێ، بێگومان مەلا لەپێش هەمووان دا دەهات لەپێشەنگی لەشكر شەڕی دەكرد. هەنگێ نەك حەفتاودوو حۆری،هەرچی حۆری لە عەردوعاسمان بوو، بەناوی پێشەوای ئایین دەستی بەسەردا دەگرتن لەخۆی حەلاَڵ دەركردن، ئەدی كاكێ،بۆ نانە چەورەی خۆی هەرچی ئاغا گوتبای. دەیگوت: سەددەق. تاكو ئەوها ئێمەی بەپەند برد، قەت لێی خۆش نابم) ئاغاومەلا لەدیوەخان سەریان نابووە بن سەری یەكدی.بەتەمای خەبەرێكی خۆش بوون لەملاوەش پوورە سێوە دەهات و دەچوولەبەر خۆیەوە دەیبڵماند.!

(مەنگۆزانە دەڵێی ماڵوسن سەریان لەبن سەری یەكدی ناوەسلاَو لەئەقڵتان بەتەمای موژدەیەكی خۆشن، دڵنیام هەر ئێستا بەقینگی تەڕو بەچاو بەرە ژێری بۆ باوەخوند دەگەڕێنەوە) بەرەبەری زەردەپەڕی خۆرئاوابوون سەرایی لەشكر بەدەركەوتن، هەندێكیان بەرەو ئاوایی زەردەشت ئاوا دەهاتنەوە، هەندێكیان بەم ئاقارەدا پەرت و بلاَو بۆ گوندەكانی خۆیان دەچوونەوە.. پوورە سێوە بەم دیمەنە زۆر دڵخۆش بوو، لەخۆشیان پێی عاردی نەدەگرت، پوورە سێوە لەدوێنێكەوە تێرنانی نەخواردبوو،، دەنگی هەڵبڕی بانگی (حەیدەر)ی كوڕزای كرد.!

- حەیدەر.. هۆۆ حەیدەر دەومرە لەدەوری سەرت گەڕێم.

- ها داپیرە چییە.؟!

- هە ها ڕۆڵە، تەماشاكە مریشكەكانی خۆمانت دیوە لەكوێ چینە دەكەن.؟!

- بەڵێ داپیرە دەیانبینم.

- زۆر چاکە، دەبڕۆ باروکە(عەلۆدە)کە بگرە بیهێنە باسەری ببڕین.

- بەڵێ داپیرە، هەر ئێستا دەیگرم.

: دیوەخان، بەپیاوی بەزیوو هەلاتوو قەرەبالغ ببۆوە، هەربابا بوو لەباری خۆی دەیژمارد، هەرهەموویان گلەیی و گازاندەیان لە چێشتەکەی بەیانی بوو، هەناوی دارزاندبوون، زگ چوویان پێگرتبوو، لەپەلوپۆی خستبوون، کەسیان بەدۆخینی خۆی ڕانەگەیی بوو، دەیانگوت (ئاغا بڕوات بێ لەبەر حاڵی زگمان حاڵی شەڕکردنمان نەبوو، بەنمەکی تۆ ئەگەر مەبەستیان بووایە، یەکێکمان بەپێوە نەدەماین تۆویان لێمان دەبڕی). ئاغا بەبیستنی ئەم کارەساتە لەژنانی ئاوایی بەگومان کەوت، دەمی بردە بنا گوێی مەلالەبن لێوان پێی گوت :

- شیشێکیان لێداین، ئەمما چتۆ شیش.؟! داخیان کردین.

مەلاسەری بۆ لەقاند لێی پرسی؟

- باشە، تۆ زەنت لەکێیە.؟!

- زەنم بۆ هەموو ئەو ژنانە دەچێ چێشتەکەیان لێنا. بەتایبەتی بۆ ئەم دەڵەقۆڕە.

-کامە دوڵەقۆڕ.؟!

- پوورە سێوە.

- وەڵلا. بڵێم چی.ئەم پیرەژنە نەفرەتییە وێدەچی خاوەن هێزێکی شەیتانی بێ.. بڕوابکە.! ناوێرم تماشای بکەم، چاوی پڕ جنۆکەیە. دەزانی چتۆ زمانی ژەهراوی پێوەیە، کتومت لەزمانی(مار)دەکات، من، دەمێکە لێی بەگومان کەوتووم. بەلام نەدەبوو گوللە بەتاریکیەوە بنێم. ئەگینا لەمێژە هەستم پێکردووە جادووکەری وەك خۆی هەرگیز پەیدا نابێ .

- راستەکەی ئەو پیرەژنە بەدکارە. پیاو لێی دەسڵەمێتەوە ئاگام لێیەتی داناکەسێ، وەکو سەگی پێ سووتا،هەر ئەم ماڵ و ئەو ماڵ دەکات. مسۆگەر شتێکی لەژێر سەری یە. بەلآم جارێ لێیگەرێ. کەسنەزانم بەردێکی لەسەردانێ. بادەنگی لێومنێ.

: خونچە ،لەو ڕۆژەوە کە دابوویانە عەلۆ قاوەچی ئیش و کاری ناو ماڵی ئاغای گرتبووە ئەستۆخونچە، ئافرەتێکی نەزۆك بوو زاوزێی نەدەکرد، خورت و بەرچاو بوو، ئاغا بەدزی مرخی خۆی لێخۆش کردبوو. بەلآم نەیدەزانی کوو دەستەمۆی بکات.

خونچە. هشیار بوو، هەستی بەچاومۆنی ئاغاکردبوو، خونچە، سێبەندی بوو، لەڕووباری دەدا. نەیدەهێشت گۆزینگی تەڕبێ. گەرەکی بوو بەبەردێك سێ کێڵ بپێکێ. یەکیان ئەوەبوو.! گوایە پێش چەندساڵێك بەرلەئێستا، (ڕەزا)ی مامی خونچە پڕکێشی (زولەیخا)ی خوشکی عەلۆقاوەچی هاوسەری بووە لەئەنجامی ئەم تۆمەت پێکردنە، شەوێك لەشەوە تووش و تاریکەکانی زستان دا. چۆن زولەیخایان شوون بزرکرد. ئێستاش هەربێ سەرو شوون بزرە.کەسنازانێ عارد قوتی دا.عاسمان هەڵیکێشا، زیندە بەچاڵکرا.چی بەسەرهات.

:خونچە. ئاوقووق عەلۆنەبوو، عەلۆ هێندە نابووت وپوخولەبوو، هەرلەتەمەنی منداڵیەوە بەعەلۆ قرخن ناوزەدکرابوو، بەلآم هەرچی خونچە بوو، شۆخ و شەنگ و نازداربوو، گیا بۆی دەکەوتە هەلەکەسەما.

وەلێ دەسەلآت چییە.؟! دەسەلآت، دەسەلآتی ئاغا وپیاوسالاری یە، لەباتی خوێنی زولەیخا (چاکێ) سولحیان بەخوێنی خونچە کردبوو، بەزەبری نووکی خەنجەر لەعەلۆقرخنیان مارەکردبووئەگەرنا، خونچە باراشی خۆی لەدۆڵەدانەی هەمووئاشان نەدەکرد، بەم حاڵەشەوە قرخنی تل زەردی سەرکز دڵ پیس و کرمی

بوو، دڵی لەخونچە کرمی کردبوو، بەشەوو ڕۆژ لێی غافل نەدەبوو. زۆرجاران بەهۆی دڵ پیسی و غیرەی عەلۆ، لێیان دەبووە مشتومڕوگاڵە، بەلاّم هەرچی خونچە بوو لەشەرمی ڕووان لەکورتی دەیبڕیەوە. حەزی نەدەکرد خەڵك بەنێوانیان بزانێ. هەرچی هەبوو لە هەناوی خۆی دەپەستا بۆ ڕۆژی خۆی هەڵیدەگرت. بێجگە لەوەش هەر لەکۆنەوە بەرەبابی عەلۆ بەپشتیوانی زینەڵ ئاغا دەیانخوڕی.

زۆر جاران بە بیانووی تخووب بەزاندن و قەرسیل خواردن، لەگەڵ بەرەبابی خونچە دەبووە شەڕوگاڵەیان. تێکبەردەبوون سەرو گوێلاکی یەکدیان لەخوێن دا سوووردەکرد

دووەم ئەوەبوو.! لەسەرینی ئەم لاگیریەی ئاغا لەبنەماڵەی عەلۆ، وەلەداخی ئەوەی بەزۆری زۆردارەکی لە (قرخنی)ی مارەکردبوو، لەهەلێك دەگەڕا(هەتك)ێك بەئاغا بکات.

سێیەم ئەوەبوو.! هەوی دابووەوە بیری لە(سمکۆ) دەکردەوە، چونکی خونچە بەر لەوەی لە بەدەل خوێنی زولەیخا لەعەلۆی مارەبکەن. دڵی بەلاوێکی کۆك دابووخەڵکی گوندی (ئاریاوا) بوو، ئەو کوڕە جحێڵە ناوی (سمکۆ) بوو، سمکۆ زۆر جاران ژوانی لەگەڵ خونچە دەگرت، کەسێ بەتری شەو ڕادەکشا لە ڕێگەی (پلکە پێناوێ) دەهاتە گوندی زەردەشت ئاوا. خۆی بۆ دەهاوێتە نانەدینێ، تاکو بەرە بەری بانگی بەیانی خەریکی دەست بازی و ڕامووسان و ڕازونیازی دڵی خۆیان دەبوون. کوڕێکی دامێن پاکو ڕەوشت بەرز بوو. پڕبەدڵ خونچەی خۆشدەویست. هەرگیز ڕازی دڵی خۆی و خونچەی بۆ کەس نەدەدرکاند. زمانی تەقەت بوو. دواجار شەوێکی ساردوباوبۆران و ڕەهێلە بووسمکۆ، هەستی پێکردبوو خونچە

لوتف و خولقی گفت وگۆو ڕاموسان وحەوسەلەی دەستبازی نەبوو. بۆیە لێی پرسی؟

- خونچەگیان، ئەوە چ خێرتە خۆ نەخۆش نی.؟

- نەخێر، هیچ نییە، کەمێك نەساخم سەرم دێشێ.

دەستی دانا سەر نیوچەوانی پێی گوت:

- خونچەگیان، دەستخەڵەتم مەدە، تۆ نەساخ نی، گشت گیانت ساردە، دەڵێی کرێوەت لێباریوە ئەگەر شتێك لەئارادایە لێم مەشارەوە. بڵێ بزانم چییە. چی ڕوویداوە؟!

: خونچە، بەسەر زمانی دانەهات بڵێ حاڵ و حیکایەت ئەوهایە، لە شەرمان نتقی گیرا بوو، هون هون فرمێسکی بەردەداوە، کۆرەگری لەهەوکیدا مابوو، پاشان هاتەگۆ گوتی :

- سمکۆگیان، حەزناکەم چیتر ئەو ڕێیە بدەیتە بەرخۆت، هی نێوان من و تۆ تەواو بەسەرچوو، چونکی لە پێرێ شەوەوە. من مارەبڕی عەلۆ قرخنی سەرکزم.

- کچێ خونچە وامەڵێ، ئەوە بەڕاستتە، یان گاڵتە دەکەی.؟! سمکۆ گشت گیانی نقوومی ئارەقەبووڕابووە سەرپێ ڕۆیی. ئێستاشی لەگەڵ دا بی پێی نەناوە گوندی زەدەشت ئاوا خونچە هەوێ دار بوو، دەیویست دڵی سمکۆ چاکبکاتەوە، دڵی بەوە خۆش بوو،دوای ئەم هەموو ساڵە هێشتانەکێ ژنی نەهێنابوو.

خونچە ئەمشەو خەونەچووبووە چاوی، خەوی لێزڕابوو، هەرچەندە گێنگڵی بەخۆی دەدا کەلەکەی دەگۆڕێ، نەخێر، دڵی سوار بوو خەو تخوون چاوی نەدەکەوت، بیری تۆڵەکردنەوەی و گەڕانەوە بۆ باوەشی عیشق و ئەوین تەنگی پێ هەڵچنی بوو. پێیوابوو کەشەو لەباریەك دەکشێتەوە قەت ڕۆژی لێنابێتەوە. دواجار لەگەڵ سەدای قووقەقووقی کەڵەشێری پێش بانگی بەیانی هەستاوە،

هەروەك سبەینانی ڕۆژانی پێشوو چووە ماڵی ئاغا. لە (ناندین)ێ خەریکی ئامادەکردنی قاوەڵتی بەیانی و چادێم کردن بوو، هەردوو پیرەژنەکانی ئاغا بەکاوەخۆ لەخەو ڕابوون لەدەوری سفرە دانیشتن، دواتر ئاغا بەکۆخەکۆخ هشیاریکردنەوە.! بەئاگام. خونچە، مەسینەودەست شۆری بۆ برد، ئاوی بەدەستی داکرد دەموچاوی خۆی شووشت، پاشان پرسی؟

- خونچە، قاوەڵتیت ئامادەکردووە.؟

- بەڵێ قوربان لەزوویکەوە ئامادەیە، هەرئێستا بۆت دێنم.

- خونچە، ئەوەی ڕاستی بێ لەوەتەی هاتوویتە ناندین، من ئیسراحەتم کردووە، دەستاوت زۆر بەتام و لەزەت و خۆشە، پیاو چێژی لێوەدەگرێ.

- نۆشی گیانت بێ گۆشتی پێ بگری.

: دواتر دوو ئەستورکی گەرم، سێ هێلکەی برژاو، هەندێك ژاژی و پەنیری دانا سەر سێنی لەگەڵ پیالەیەك چا، بردی لەپێشی دانا.

خەریك بوو بگەڕێتەوە پێی گوت:- خونچە، تۆ ئافرەتێکی ڕەوشت بەرزو ڕووخۆشی، پیاوەکەشت پیاوێکی چاك و دەست پاکە. دڵم لەهەموو خەڵکی ئاوایی گەردی گرتبێت هێشتانەگێ لە ئێوە گەردی نەگرتووە.

- جا من چۆن دێڵم دڵی ئاغام گەرد بگرێ.

- سوپاس خۆم هەستم بە نەرم و نیانی تۆ کردووە. دڵنیام شت لەمن ناشاریتەوە بۆیە داوای یارمەتیت لێدەکەم.

- یارمەتی وەکو چی ئاغا.؟!

- خونچە من گومانم لە چێشتەکەی پێرێ سبەینێ بوو، بێگومان ئەم چێشتە بەدەستی ئەنقەست دەستکاری کرابوو. ئەگەرنا ئەو خەڵکە هەموو بەجارەکی تووشی ژانەزگ و زگ چوون نەدەبوون، خۆمەرگەمووشیان نەخواردبوو بەخۆیان

ڕانەگەن.. ئەگەر لەم بارەیەوە شتێك دەزانی بیلێ جا لەم ڕۆژانە دەچم بۆ شار، هەرچی دەخوازی بۆت دێنم، خۆت و عەلۆشت بۆ بەرگ دەکەمەوە.

- قوربان ئەوەی پۆشیمانە هەمووی هی جەنابتانە.

- خونچە، ئەمەیان جیاو، ئەویان جیا..بەلاّم جارێ لێگەڕێ وەرە ئەم سفرەیە هەلگرە، پاشان حالّیت دەکەم.

: خونچە ئافرەتێکی قوولە مسی چاوشینی قەزوانی ئەبرۆ کەوان، قژمامزی بەژن زراڤ بوو، دەسترۆکەیەکی سووری بەلاری لە نێوچەوانی دەبەستا سۆڤ خەلّۆمتگای لەدین لادەدا، بەئەنقەست کەمێك دەلینگی دەرپێی هەلّمالّی بوو، بەلەك چ بەلەك.؟! ساف وسپی، نەختێك لەهەوراز گۆزینگی. سێ دانە خالّی سەوزی بەدەرزی ئاژن کردبوو، لێی ببووە نەخش. ئاغا لەژێرەوە بەبنی چاو وەکو کتکی برسی لە بەرامبەر گۆشتی تەڕوتازە چاوی کوسکەکوسکی بوو، زمینی لای خۆی نەمابوو. خونچە، بەئەنقەست کۆخی، ئاغا ڕاچلّەکی گوتی:

- ئێ خونچە، پێت نەگوتم کێ بوو.؟! ئەو هەتکەی پێمانکرد.

- بەلّێ قوربان دەزانم، بەلاّم دەترسێم عەلۆ پێبزانێ کە ئەم قسەیە لەزاری منەوە پەرت و بلاّو بێتەوە، عەلۆ، لەهیچ و خۆڕا لەمن بەهەنجەتە.. نەخاسمە بەم دووزمانیەشم بزانێ، بێ قەیدوشەرت سێ بەردەم لەمست دەنێ.

- چلۆن سێ بەردەت لە مست دەنێ. چمە عەلۆ قرخن بووە بەم پیاوە سێ بەردانت لە مست نێ ،حەقی خۆیەتی سێ بەردەت لە مست نێ، چوونکی ماینی حدود و گلّە سەرفرۆشیان نەگوتووە.ئەوەش هەلّەی منە، ئەگەر لەکاتی خۆی پشتگیریم لێنەکردبایە.؟! عەلۆ قرخن ئەم پیاوە چەلەنگەنەبوو، ئەمڕۆ سێ بەردان لە مستی تۆ بنێ. لێی وەرگرتەوە گوتی:

- چیبکەم، لەخۆم سەر بەهەشێ، ناوێرم لە پێستی خۆمدا بجولێمەوە،

دارکاریم دەکات، ناووناتۆرەش سەربار، زمانی لە زمانی سەگ پیسترە، سەرباری ئەم دەردەسەریەش، هێشتانەکێ ئەو خۆی لێم دەگرێ لام لێناکاتەوە، ناچارم مێچکە مێچکەی لەبەر بکەم چییە.؟! عەلۆ لێم زویر نەبێ. مرۆیەکی دڵ ڕەش و ژەنگاوییە، نازانم سەری خۆم بۆ کێندەر هەڵگرم، ئەگینا چیتر لەوزەم دا نەماوە لەگەڵی هەڵناکەم. کەسێکی پشتی خۆم نەماوە بە خۆیم بگرێ. ئەویش دەزانێ کەسم نەماوە لە کۆزێ، بۆیە دوو لنگی بەسەرم داهێناوە.

: ئاغا بە بیستنی ئەم گلەیی و گازاندانە لە خۆشیان دەمی پڕ لیکاو بوو. دواتر گوتی:

- ناخونچە وابیر مەکەوە، تۆ بێکەس نی، ئەوەش بزانەکە سەری دنیا بە پووش نەگیراوە، هەرکەسێك بێت وبۆ خۆی (زل)ەکی لێدەرکێشێ، خۆم چارەسەری ئەم سەرکزەت بۆ دەکەم، خەمی لێ مەخۆ، ئەوە خەمی من بێ، هەرکاتێکی تۆ بخوازی سەر تاپات لە زێڕ هەڵدەکێشم، وەکو شاژن ئاوریشم ڕاخەو ئاوریشم بەخۆت دادە. تۆ بەس ئارامت بێ ، هەموو شتێك بە دڵی تۆ دەبێ.

: خونچە لە دڵی خۆیەوە دەیگوت: خودا موبارەکی نەکات، پاشان گوتی: بابزانین چارەنوس بەچی دەگات.؟

خونچە، لەکاتی خۆی ئەنگوستیلەیەکی زیوی بەدیا ری لە (سمکۆ)وەرگرتبوو.. (نك پێشینان دەستوری عاشقان وابوو، کە کوڕێك و کچێك بەدڵ و بەگیان یەکدیان خۆشویستبایە. دیاریان پێشکەش یەکدی دەکرد، خونچە. دەستماڵەکی بەگورینگۆکەی ئاوریشم نەخشاندبوو. وێنەی دوو کۆتری لێ چنی بوو، دندووکیان لەناو دندووکی یەکدی نابوو، لەیەکەم ژووانی بەیەك گەیشتن پێشکەش بە سمکۆی کردبوو، سمکۆش بۆ یادگاری ئەنگوستیلەی زیوی کردبووە دیاری پێشکەشی خونچەی کردبوو).

: خونچە، خۆی دەخیلی پلکە پێناوێ کرد.!

(دەستم دامێنت پووری، سمکۆ دوورە دەستە دەستم نایگاتێ، هەر ئێستا بەرەو گوندی(ئاریاوا) بکەوە ڕێ، ئەم ئەنگوستیلەیەی بۆ بەرە، پێی بلێ: خاوەنی ئەم ئەنگوستیلەیە زۆر نەخۆشە، دەردی گرانە لە سەرە مەرگە،کە شەوڕاکشا چاوی لە ڕێتە، ئەوەندەی پێ بلێ وهیچی تر، کە گەڕایتەوە بخوازە مالی دونیا !.

: بالێرەوە لەسەر ڕێگای نێوان گوندی زەردەشت ئاواو گوندی ئاریاوا، پلکە پێناو جێ بێلین بەرەو شاخی هەزار بەهەزار و ئەشکەوتی دێوان بەهەورازدا کێلبینەوە.

# (٢٩)

چەند ڕۆژ بوو هۆبەو ڕەشماڵی عێلی (گورجی زادە) هاتبوونە سنووری ئەشکەوتی دێوان، لەدەم ڕووبار بنەوبارگەیان دانابوو ڕەشماڵیان هەڵدابوو، مەڕومالاَتیان سەری لە پووش و پاوان نابووکێخوای عێل، دەمێك بوو بەناودەنگی هاوڕێ غوربەت و هەڤالآنی ئاشنا ببوو، جوانە ئەسپێکی کردبووە دەستەودیاری پێشکەش بەغوربەتی کردبوو. جوانە ئەسپ تازە پشت کرابوو، هێندە خورت بوو سواری بەخۆی نەدەگرت. مچەمەیتەر، سبەینەکێ زوو زین ولغاوی لە جوانووکرد، خۆی هەڵدا سەرپشتی بەهێواشی ئاوزەنگی تێسرەواند. دوو جاران ئەمسەروئەوسەری پێکرد، بەمەبەستی ڕام کردن وڕاهێنانی دەیهێناو دەیبرد، دواجار جلەوی بۆ شلکرد تاوی دا. جوانە ئەسپ گەرم داهات سەری هەلگرت تێی تەقاند، خەریك بوو باڵ بگرێ ، مچە ترسی گەییێ هەرچەندی هەوساری گورج دەکرد جوانو پڕتەکانی دەدا بەر خۆی. مچە. ژنەوت ئەم جوانووە لە توخمی ئەسپی سەر ڕەقە، ئەو توخمە ئەسپانە کە گەرم دادێن سەر هەڵدەگرن، ڕکابەریان لەگەڵ بکەی سەرکێشن ناگەڕێنەوەجوانووتاوی گرتبوو سەرەونشێو چاوی دابووە ڕووبار. مچە، لەدڵی خۆی گوتی (کە گەییە ڕەخ ڕووبار خۆم هەڵدەدەمە ناو ڕووبار) لەم خەیاڵانەدا بوو، بەردێك لەبن دەستی جوانە ئەسپ هەڵزەنی، جوانوو بەسەر سەردا ڕەتی برد. مچە،لەسەر زین بەلاداهات، تووند قەرپوسی زینی گرت. خۆی پێدا شۆڕ کردەوە، بەلاَم جوانوو قوشقی بوو تۆقی. پڕ تەکانی دا. ماوەیەك دەستی بەقەرپوسی زین وەگرتبوو. بەلاَم دواتر دەستی شل بوو چیتر خۆی پێنەگیرا، بەربووەوە هەڵدێرا بنی گەلی، کە بەهاواریەوە

چوون بێخێرببوو، جەستەی تێکشکابوو، دارمبازمیان بۆی هەڵبەست. هێنایانەوە ئەشکەوت، چەند ڕۆژان لە پێستی (بەران)یان گرت، بەڵام بێسوود بوو. چونکی لەناوەوە دا هیزرابوو، برینەکانی کاریگەر بوون. چەند ڕۆژێك لەناوجێ کەوت. لەسەرە مەرگ دابوو، بەرلەوەی گیانی بسپێرێ، ڕووی کردە هاوڕێ غوربەت پێی گوت:

- هاوڕێ، دڵم بەژیانی ئێرە زۆر خۆش بوو، بەڵام مەرگ زوو بەربێنگی گرتم، تازە لەدمست چوو رابوورد، بڕوات بێ لەگەڵ ئەومشدا هێشتانەکێ هەر دڵشادم. چونکی لە شوێنەکی خۆش ڕۆژم لێناوابوو)

: ئەختەر، سەری مچەی خستبووە سەر شلکەی ڕانی. هون هون فرمێسکی بەسەردا دمباراند. مچە چاوی هەڵێنا گوتی:

- ئەختەرگیان مەگری، بەگریان هیچ چێنابێ، من، لەسەر سەفەرم، سەفەرێکی دوورو درێژ. نەبادا ببێتە سەفەرێکی ئەبەدی نەگەڕێمەوە، خێرتەگاتێ گەردنم ئازا کە. لەدوای من ئاگات لەخۆت بێ بەخەم دا مەچوو، مەچووە بن باری خەمان.

دنیا پووچە بەخەمان پێکنایەت، بوون و مردن.! سوننەتی ژیانە. کەس لەمردن رزگاری نابێ، گرنگ ئەومیە مرۆچۆن بەئازادی لەدایك دمبێ. بەهەمان شێوە بەئازادی بمرێ. من ئازادم، بۆیە سووێم لە مردنی خۆم نابێتەوە. ئازیزم تکات لێدەکەم. دمستبەرداری هاوڕێکانت مەبە، ژیانت ژیانی ئەوان مردنت مردنی ئەوان. دنیا پێنج و دوو ڕۆژێکە، بەلەزدێت و دمڕوات. ئەختەرگیان، نەت بیستووە پێشینان گتویانە.! ( کەم بژی، کەڵ بژی ). خۆ هیچ نەبێ، من. تۆ، هاوڕێکانمان لەژێر چەپەلۆکی ئاغا ڕزگارمان بوو، قەیدی چییە. بابمرین

ئەختەر.! ئەی كووا خوشكەكانم، بانگیان بكە بابێنە سەرینم، هاوڕێ غوربەت ئەوە بۆچی داماوی.؟! دامەمینێ، ئاگاداری خۆتبە نەكەویە داوی نامەردان..

: لەم قسانەدابوو زمانی كەوتە لوغەلوغ. نەخێر، لەباوەشی ئەختەر ملی بەلاداهات. چاوی كەوتە سەر یەكدی ماڵئاوایی لێكردن.

: هاوڕێ غوربەت ناردی بەدوای ڕەشماڵ نشینەكان پیاوەكان هاتن، شوشتیان، خەلآتیان بۆی دووری، لەناو دارەبازەیان دانا، بەچوار دەستە هەڵیانگرت خستیانە سەر شانیان. خەریكبوو بەرەو گۆڕستان بەڕێكەون، ئەختەر پێی گوتن(تاوێ هەر ئەوها بەسەر شانتانەوە بێ لە جێوە ڕاوەستن)ڕاوەستان.

: ئەختەر، كەمێك خۆی داچەماندەوە و بەژێر دارەبازەكەدا ڕەت بوو چووە ئەودیوو، دیسان بەهەمان شێوە بەبن دارەبازەكەدا هاتەوە ئەم دیو.

: كێخوای عێلی (گورجی زادە) هاتبوو بەخۆی سەرپەرشتی بەخاكسپاردنی دەكرد، چوونیوچەوانی ئەختەری ماچ كرد گوتی:

(لەوانەیە هەمووتان نەزانن، ئەختەر بۆچی بەبن دارەبازەی هاوسەرەكەیدا. ئەم دیو ئەودیووی كرد. من پێتان ڕادەگەیەنم، ئەگەر لە ڕۆژانی ئایندەدا خودای پەروەردگار، كوڕێك، یان كچێكی بەئەختەر بەخشی، كەس بەناحەق پەنجەی تاوان بۆ ئەختەر درێژنەكات)

- ئیدی پاشان بەرەوگۆڕستان بەڕێ كەوتن بەخاكیان سپارد. پاشان لەدەم ڕووبار دوو ڕەشماڵی شەش ئەستوندەكیان هەڵدا پرسەیان بۆ دانا.

# (٣٠)

پلکە پێناو ئەنگوستیلەی لە خونچە وەرگرت، کردیە قامکی خۆی بەسواری گوێدرێژ ڕێگای گوندی ئاریاوای  گرتەبەر بەلەقەلەق ڕۆیی. لە نزیك گوندی دیتی کیژوکاڵی ئاوایی هاتبوونە سەرکانی. لایدا سڵاوی لێکردن، سڵاویان لێوەرگرتەوە. لەسەر پشتی گوێدرێژ دابەزی. دەست و دەم وچاوی خۆی شووشت، چۆڕێ ئاوی خواردەوە یەکێك لە کیژەکان لێی پرسی؟

- پورێ بەخێر لەکوێوە هاتی. کێوە دەچی؟
- لەزەردەشت ئاوا ڕاهاتووم بەمیوانی دەچمە ئاریاوا.
- بەخێربێی پوورێ، ئەمشەو لای مە وەمێنێ.!
- خودا ئاوەدانی کات من خانەخوێی خۆم هەیە میوانی ئەوم.
- خانەخوێی خۆت کێیە؟
- سمکۆ، دەیناسن.؟!
- کیژەکان تاوێ واق وڕمان.
- یەکێکی دیکە پرسی؟
- باشە پوورێ تۆ چۆن سمکۆ دەناسی؟!
- من نەسمکۆم دیوە نەدەیناسم. بەڵام هەیە لەئێوە چاتر سمکۆ دەناسی. جانازانم ئێوە کیژوکاڵی گوندی چۆن سمکۆتان ناسیوە.؟!
- سمکۆ، کوڕێکی سەنگین و ڕەوشت بەرزە بەڵام نەختێك لووت بەرزە.
- نەخێر هێشتان نەتان ناسیوە.
- قەیدی ناکات نەماننناسیوە، بەڵام پێمان بڵێ بزانین تۆ چ کارت بە سمکۆیە.؟!

- کیژم تۆ هێشتان نەفامی، هەموو قسە هی کردنێ نییە هەلێبڕێژی.

: دواتر هەستاوە سەر پێ، قەڕاسەی گوێدرێژەکەی بەدەستەوە بوو گوتی:

- من، بەتالوکەم دەبێ بڕۆم.

: کیژەکان سەری زمانی خۆیان گەزت. (ئەوە لۆیە سمکۆ بەری بەلای هیچ کامێکمان نییە، وادیارە لە مێژە هێلکەی لە هێلانەدا نایەتەوە).

: پلکە پێناو، بە پرسیار بە مالی سمکۆ کەوت، دوای پشوودان و نان خواردن. سمکۆ لێی پرسی؟

- پوورێ پێت نەگوتم خەلکی کێندەری.!

- پوورێ بەقوربانت بێ، خەلکی زەردەشت ئاوام. نازانم ئاخۆ قەت ڕێت بەگوندی ئێمە کەوتووە یان نا.؟!

- بەلێ پێشان گوندەکی خۆش و دلگیر بوو.

- بەدلت بوو.ها.؟!

- بەلێ پوورێ، زۆر بەدلم بوو.

- باشە ئەگەر وایە کێ دەناسی.؟!

- ناسیاوم هەبوو، بەلام عەیامێکی دوورە لێی بێئاگام، ڕێم بەوێدا نەکەوتووتەوە.

: پلکە پێناو، ئەنگوستیلەکەی لە قامکی خۆی دەرکرد، ڕادەستی سمکۆی کردو گوتی:

_ مادام دەلێی ناسیاوم هەبوو، ئەم ئەنگوستیلەیە هی کێیە؟!

- ئەنگوستیلەی هەرگێڕوەرگێڕ کرد وەبیری هاتەوە، یەکەمجاری بوو چووبووە ژووانی خونچە ئەم ئەنگوستیلەیەی بەدیاری پێشکەش بە خونچەکرد. هەناسەکی ساردی هەلکێشا گوتی:

بەڵێ پووریێ دەزانم هی کێیە، بەڵام ئەو کاتەی ئەو ئەنگوستیلەیەم کردە دیاری، دنیا بەهار بوو ئێستا خەزانە پووریێ.

- نا، کوڕم خێر بڵێ خەزانی چی.؟!

- بەهەرحاڵ پووریێ. پێمبڵێ بزانم خاوەنی ئەم ئەنگوستیلەیە بێ دەردو بەلایە، ئاخۆ چۆنە لە چ حاڵ دایە.؟!

- کوڕم سمکۆ، منیش هەر بۆئەمە هاتووم، خونچە ناردوومی بۆلای تۆ، کوێرایم دایێ، خونچە زۆر نەخۆشە. لەناوجێ کەووتوە دەردی گەلەك گرانە.هەرجارەکی چاوی هەڵدێنێ گۆڵمەك فرمێسکان هەڵدەرێژێ.

خۆی دەخیلی من کرد ڕایسپاردم، دەخوازی چاوی پێت بکەوێ، منیش بەم سەرو پرچی سپی هانام بۆت هێناوە بەڵکو لەسەرە مەرگدا مرازی حاسڵ بێ.

- پووریێ، ئەوەی لە نێوان من و خونچەدا بوو بەسەرچوو، هەروەکو دەڵێن، ((کەنگروماست بەوادەی خۆی))خۆشە بەلأم کەوەختە بەسەرچوو ئەوتام وچێژەنادات، لەدواچی.؟! لەدوای ساڵێ سەلام و عەلێك، من، بە چ هەقێك مولکی یەکێکی دیکە داگیربکەم.؟! نا پووریێ ڕێگا بەخۆم نادەم، تۆ بڵێ:

- ئایا ڕاستە من لە بێستانی یەکێکی دیکە کاڵەك بڕنم.؟!

- کوڕم تۆ بەم شێوەیە بیرمەکەوە، لەوەپێش بۆ دڵ و دنیات بوو، بەلأم ئەوە بۆ قیامەتە. وەرە لەکەلی شەیتان وەرە خوارێ، ڕێزلەم پرچە سپیەی دایکی خۆت بگرە، بانائومێدوبە دڵشکاوی نەگەڕێمەوە.!

- زۆری بەبەرداکەوت، قنیاتی پێ هێنا، کە خونچەنەخۆشە و چاوەڕوانی دەکات.

- باشە پووریێ، لەبەرخاتری تۆ شەوێك لەم شەوانە چاوەڕوان بە دێم.

دووشەو بەسەر چوو ئێوارەی شەوی سێیەم دنیا مەیلەو ئەنگۆرە بوو، خۆی پێچاوە، بەرەو گوندی زەردەشت ئاوا بەرێ کەوت، کەگەییە ئاوایی منداڵ هێشتانەکێ خەریکی چاوشارکێ و تەپەرمپەو ڤاوڤاوانێ بوون یارییان دەکرد. سمکۆ، قەستی ماڵی پلکە پێناوی کردبە ئەسپایی بەحەوشەی کەوت،

پلکە پێناو لەخۆشیان شاگەشکەبوو، دەستی گرت بردی لە ژوورێ داینا، بەهەڵەداوان چوو خونچەی ئاگادار کردەوە، بەپەلە گەڕاوە. لەباتی جارێك سەت جار بەخێرهاتنی کرد. دواتر خەریکی(چا) لێنان و قسەی بۆ دەکرد، دەیگوت:

(دەمزانی زمان کورتم ناکەی، دەمگوت کچم خونچە، دڵنیابە سمکۆ گفتی پێداوم هەردێت، چونکە ئەم کوڕە بناسم، تفێکی ڕووکردووە هەڵیناگرێتەوە) لە هیکەوە خونچە وەکو چۆلەکە (باشووکە) سەری لەدوونابێ چۆن خۆی لە بن ساپیتەی خانوو دەکوتێ، ئاوها خۆی کوتایە ژووری ماڵی پلکە پێناو،

: خونچە، چ خونچە، هێندە جوان خۆی ڕازاندبۆوە مەپرسە چاوی بە(گل) دارشتبوو، خەناوکەیەکی قەنەفری کردبووە ملی، گەردانەیەکی چوار ڕیز بە مۆرووی سوور چنی بوو کردبوویە گەردنی، بازن و بەربازنی کردبووە مەچەکی، جووتێك گوارەی چوارگۆی ئاو بەکاریتەی لەگوێی دابوو، خەزێمەکی لە کەپووی کردبوو، کەواو سەرکەوای ئاگربارانی پۆشی بوو،لە ڕاستی دا ناگۆترێ چەندە جوان لەخۆی خەفت بوو، هی وەکو (من و عەزیزی مەلای ڕەش)ی دەهێنایە هەژان. بێ سێ ودوو هامێزی لە سمکۆ وەرێناو توونـد لەباوەشی خۆی گرت. هەڵیدەگوشی لێی جیانەدەبۆوە دەیگوت( سمکۆگیان چرای چاوم، بەقوربان ئەوە لۆ هەندە بێ ڕەحمی، قەت جارێ نەهاتی لێم بپرسی. ئەوە کوو بەبێ من هەڵت کرد.ها.؟!

ئەوە لۆ هەستت لەخۆت بڕیوە نامدوێنی، وادیارە دڵت ڕەنجاوە لێم زویربووی، بەقوربانی دڵت بم. خۆدەزانی گوناحی من نەبوو، لە ژێر نووکی خەنجەر چیم لەدەست دێ. هەموو دەسەلاَتی زەعیفەیەکی وەکو من بریتییە لە هەنسك دان ورۆندك باران. دەبێ سەری ڕەزامەندییان بۆ ڕاهەژێنی، ئەگەر بڵێت نا.؟! لێی بەگومان دەکەون ماف ژیانی پێ بە ڕەوا نابینن)

: خونچە، هێندە کۆڵداربوو زمانی نەدەگەوتە کالاَن، بەلاَم هەرچی سمکۆ بوو لەبیری ئەوەدابوو، ئەم پیرەژنە بەدکارە بەزمانی لووس فریوی دا، تێگەیی هەردووکیان لەبەر فێڵدان، شتێکیان لە بن سەری دایە. بۆیە هیچ بەری بەلای خونچەدا نەبوو،

سمکۆ، گەنجێکی گران وسەنگین و ڕەوشت بەرز بوو، لەو جۆرە پیاوانە نەبوو هەڵپەوهەڵپەرست بێ، شەرمی بەخۆی بوو بچێتە ناو باغ و بێستانی خەڵك. پاشان هاتە گۆ و گوتی:

- خونچە، هۆشت بێنەوە سەرەخۆت بیر لە ڕابردووی من و خۆت مەکەوە، ڕابردوو ڕۆژانێك بوو ڕابرد بەسەرچوو، ئێستا تۆ خێزانداری، ئاو نەڕێژیت باشە، کەرِژا خڕ ناکرێتەوە، من دەزانم گوناح گوناحی تۆنەبوو، گوناحی گەورەکانە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێستاش هەرگیز لێت ڕازی نابم خیانەت لەهاوسەرینی خۆت بکەی، تۆ ڕەوشت بەرزی، چۆن ر ێگا بەخۆت دەدەی خیانەت لە خۆت بکەی. بەهەڵەداچووی. سبەی ڕۆژێ بە چ زمانێك پاکانەی خۆت لای خەڵك دەکەی ها.؟!

- سمکۆ، چیتر لە وێزەم دا نەماوە لەگەڵی هەڵناکەم، ڕۆژنەبووە لە هیچ وخۆڕا بیانووم پێنەگرێ، هەموو ڕۆژێ خوێنی هەناوی خۆم دەخۆمەوە، خۆ کوفر نەبوو بەدەل خوێن بووم.؟!

- ئەوەش هیچ قەیدی ناکات. خۆمن کچە تیم نیم، چمە کچە تیمی بن دەستی عەلۆ قرخنم، بمکاتە کارەکەری ناومالّی ئاغا، دەرپێی ئاغاوئاوەڵکراسی ئاغەژن بشۆم. چونکی بەخۆی بابەلباب چڵکاوخۆر بوون، وادەزانی منیش وەکو خۆی چڵکاوخۆرم.

سمکۆ، گوێبگرە،من بڕیارم داوە ئەگەر هەموو ڕۆح لەبەری دنیا لۆمەم بکەن.؟! بەجێی دێڵم. بۆیە ناردم بێی چاوم پێت بکەوێ، تاوەکو پێت بڵێم.! دنیایەکی پان وبەرینمان لە پێشە، لەکونجێکی ئەم دنیایەدا تا ئەو ڕۆژەی دەمرین سەر پێکوە دەنێین. دەڵێی چی.؟!

- خونچە. ئەم هوڕێنانە چییە؟

خۆ نەخۆش نی.؟! یان پێتوایە کە من هەرزەکارم فریوم بدەی. ئەوە سووکایەتییە، من نامەوێ سووکایەتیت پێ بکەم. ئەوی ئێستا دەیڵێی لە کات و ساتی خۆیدا بتدرکاندبایە لەگین بوو. بەڵام ئێستا ویژدانم ڕێگام پێ نادات بەقسەت بکەم. ئەوە بۆ هەردووکمان نەنگییە. ئەگەر زانیبام بۆ کارێکی ئەوها ناردووتە دوام. قەت نەدەهاتم. بەڵام نەفرەتی خودا لەم پیرەژنە بەدکارە، بەزمانی لووس و ناورانەوە فریوی دام.

- سمکۆ وەکو عارەب دەخیلت بم، ئەوەم لەگەڵ نەکەی. من بەهیوای تۆوە ژیاوم. بڵێ بمرە دەمرم.بەڵام هیوا بڕم نەکەی، خودا لێت قەبووڵ ناکات. نائومێدم نەکەی. تۆ کەی هێندە دڵ ڕەق بووی.؟! تکای خوێنەکەم لێ کردی سمکۆ، دوو قسەی خۆشم گوێ لێنەبوو، کەی ئەوەندە بێ بەزەیی بووی! لەبیرت چوو دەتگوت: خونچەگیان، من بەبێ تو ناژیم. ها.؟!

- خونچە، من و تۆ سەردەمانێك پێکەوە هەژاینەوە یەکدیمان خۆشدەویست، هەر ئەو خۆشەویستییەیە ئێستا بویتە ڕێگر، ڕێگام پێنادات دەستخەرۆت بدەم، تکات لێدەکەم لێم حاڵی بی چیم پێگوتی.

ئێستاش کات وەبەری نەماوە درەنگە دەبێ بگەڕێمەوە، هیوادارم دەست بەماڵ و مێردی خۆتەوە بگری. چیتر ئەم هوڕێنانە نەکەی.

: ئیدی هەستاو ڕۆیی.. خونچەی هیوا بڕکرد. خونچە لە حەژمەتان خیزی ناو دەمی خۆی قووت دەداوە مڕدامابوو، بیری لەحاڵی خۆی و نیاز گلاّوی وەبەنگی ئاغا دەکردەوە. بیری لەناکەس بەچەیی عەلۆ قرخنی هاوسەری دەکردەوە، بیری لە ئامۆژگارییەکانی سمکۆ دەکردەوە.! (سمکۆ ڕاست دەکات. دەبووایە لەکاتی خۆی بەر لەوەی لە عەلۆ سەرکزم ببەستنەوە، پرسی سمکۆم بکردایە). دواجار بیری لە دەستە خوشکانی کردەوە، لەبەرخۆی گوتی: (وان لە ئەشکەوتی دێوان، ئەمەیان بەجێیە. بەلاّم کەی.؟! ئەو دەمەی ڕق و کینەی خۆم دامرکاندەوە). لەم خەیالاّنەدا بوو، لەگەڵ دەنگی مەلاوبانگی بەیانی ڕاچەنی. لەناخەوە ئاهێکی ساردی هەڵکێشا. دواتر هەستاوە هندامی خۆی ڕێکخستەوە هەیپای لێکرد ڕۆیی. هەروەکو سبەینانی پێشوو چووە ناندین، بەرامپیلی لە نێو قەدی بەستا، تەشتەك ئاردی لەکەندو دەرێنا. شێلاّی کردیە هەویر، دواتر ئاگردانی ئاگردا، خەریکی نان کردن بوو،لە کۆتایی دا دوو ئەستوورکە بەکونجی بۆ ئاغا چێکرد. چوار هێلکەی بۆکردە (شلکێنە) و داینا پاشان مەسینەو دەست شۆری بۆئامادە کرد،هەمووی دانا سەرسێنی بۆی برد. ئاغا کە چاوی بەخونچە کەوت چەندە جوان خۆی ڕازاندووتەوە، وەکو قورینگی چۆمی گاەەر بەنازو عیشوە دێت ودەچێ، زۆر بەتاسووقەوە سەیری دەکرد، لەتاوان گڕی گرتبوو دەیویست ئامبازی بێ لەباوەش خۆی بگرێ، بەلاّم دانی بەخۆی گرت،نەبادا بەم

رەفتارەی پێ سەرگران بێ لەدڵە خۆی گوتی: (ئافرەت وەکو ماینی سەرکێش وایە، دەبێ زۆر بەنەرم و نیانی لەگەڵی بجولێیتەوە، بە شێنەیی دەست بەبژویاڵی دا بێنی تا دەستەمۆ دەبێ، کە ڕام بوو.! بەئارەزووی خۆت هەر چۆنێکی تەڕادانێی پێدەکەی سەرکێشی ناکات).

: بەدەم قاوەڵتی کردنەوە گوتی:

- ئێ خونچە، گوتت قرخن لات لێناکاتەوە، وادیارە سەرگرانە بەتۆ. ها.؟!

- بڵێم چی قوربان، لەگینەوابێ، چونکو نێرەوەز هەر هێندە باشە تاکو تێردەخوات، کەتێری خوارد ئیدی دەکەوێتە جووتە هەڵدان.

لەقاقای پێکەنینی دا گوتی:

- کەواتە دەبێ سندم بکرێ.

- قوربان بە سندم کردن هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕدرێ.

- چۆن ناگۆڕدرێ؟

- مادام لەهەمان ئاخوڕ ئالیك دەخوات، لەهەمان کۆڵ ئاو دەخواتەوە بێ هوودەیە، هەروەکو دەڵێن ((خووی شیری هەتا پیری)) باکی بە سندم نییە.

- باشە ئەگەر بخوازی.؟! لەم ئاخوڕوکۆڵە بێبەری دەکەین.

: دواتر فڕێکی لە چایە کەی دا، جگەرەیەکی داگیرساند، یەکدوو مژی لێدا گوتی:

- خونچە، ئایا دەزانی ئاخوڕی ماین بەبێ ئەسپ زۆر ناشیرینە، چونکی ئاخوڕی تەنیا هەر بابایەو دێ ئەسپی خۆی لەسەر دەبەستێتەوە؟

- بەڵێ قوربان، بەلاّم ماینی حدود قابیل بە ئەسپی کەحێلە، هەموو ولاّخێك بەخۆی ناگرێ .

: لەبەر خۆیەوە گوتی (ڕاست دەکات ماینی حدودو کورتانیان نەگوتووە).

دەگژفکران ڕاچوو، نقوومی جوانی و گفت و لفتی شیرنی خونچەبوو،

بیری لە فەوتاندنی عەلۆفرخن دەکردەوە. لەگەڵ درینگە درینگ و زرنگەی (ئاون) و قاوە کوتانی عەلۆقاوەچی ڕاچڵەکی. گوتی:

- بەیانی لەسەر سەفەرم کەهاتمەوە..

: قسەی پێبڕی گوتی:

- سەفەری خێر بێ، هەڵبەتە دەزانن کارەکەری دڵسۆزت چاوەڕوانی دەست و دیاری یە.!

: بەم قسەیە دڵنیابوو لە دەستەمۆ بوونیی خونچە. ئۆخژنی بەدڵ داهات. پێکەنی گوتی:

- دەستە جلێکی نایاب، گوارەکی حەوت گۆی ناو بەکاریتە، خەزێمەکی لیرەی ڕەشادی. باشە.؟!

- گەردانەت لەبیرکرد.!

- با ملوانکەیەکیشی لە سەر بێ باشە.؟

- دەستی کەرەم ناگێڕدرێتەوە قوربان.؟!

بەلاّم لە دڵی خۆیدا دەیگوت: خودا موبارەکی نەکات.

# (٣١)

پوورە سێوە هێندەی سەردەراوبەر دەراوی دێ بوو غارا بوو، سەیری پۆشاك و گوارەو خەزێم وپلپلەی خونچەی دەکرد.

دەیزانی ئەوە هی شان وشەوکەتی عەلۆ قرخن نییە، دەیگوت :

(خونچە بەدەل خوێن بوو هەر بەکراسی بەری لەپاڵ عەلۆیان کرد، ئەگەر زەبروزەنگی ئەو گەمبۆرە نەبووایە قەت و قەت خونچە ڕازی نەدەبوو عەلۆ سەر بە بالیفی ئەو بکات. چونکە پێی سەرگران بوو، ئەوەش هیچ لێگەڕێ، بەلآم تۆ بڕۆ بەدەستی خۆت ئاگر لەماڵەکەیان بەردە، بۆسۆی لێنایەت. ئەدی باشە ئەو بابان کۆرە. ئەم خشڵ وپۆشاکە گرانبەهایانەی لە کێ بوو.؟!) هەبێ و نەبێ ئیشی ئەو قوڕمساخەیە، ئەو دەیوسە ناپەنگێتەوە. بەزمانی لووس لەخشتەی بردووە، داخوا چ قوڕێکیان بۆ عەلۆ گرتووتەوە.؟! گەوادی شاخ هاتی دەیەوێ خۆی پێ گەرم بکاتەوە ئەوەگوتمان ئەو گەلۆرە بەدرەوشتە ناپەنگێتەوە. ئەدی ئەو ماکەرە بۆ لۆی دەلەوچی.؟! خۆ تەنیا خەتای ئەو بێ شەرمەفە نییە. ئەی بۆ دەڵێن (بزن نەکا هێلە هێلێ. تەگە ناکا بێلە بێلێ).؟! قەیدی ناکات با لەناو دوو نانی گەرم بۆی بمێنێ. هەتا ئەو ڕۆژەی بەبنج و بنەوانی دەکەوم، هەنگێ هەرخۆم دەزانم کوو داخیان دەکەم، لە کونە کەپوویان دەینمەوە.

# (٣٢)

دەنگوباسی کیژگەلی یاخیبوو لە ئەشکەوتی دێوان لەسەرتاسەری وولأت دەنگی دابۆوە، کەوتبووە سەر زمان و زاران. ئافرەتان زۆر بەدەم گەرمی لەکووچەو کۆلأنان و پێش دەرگەولەبانیژەو تەنانەت لەناو بازارو بەرێوەش باس هەرباسی ئافرەتانی دەفەری ئەشکەوتی دێوان بوو،بەتایبەتی کەباسی لێهاتوویی و چاپوکی هاورێ غوربەتیان دەکرد،هێندە بەتام باسیان دەکرد نەدیتەو نەناس خۆشیان دەویست.!

- ئەدی خوشکم سەرکردەکەیان ناوی غوربەتە،دەڵێن: شەرواڵەکی قەمەندەۆری رەشی لەبەردایە، کورتەکەکی رەنگ مامزی بەسەردا بەرداوەتەوە، چەفییەکی سوور بەلاری لەسەری خۆی دەپێچی، راست وچەپ خەریتەی فیشەکدانی حەمایل کردووە، خەنجەرێکی دەبانی دەسك قەزوانی لەبەر پژدێنی راکردووە، چەکمەکی سۆری لە پێدایە، ئەسپێکی شێی لەبن دایە، تفەنگێکی برنۆی کردووتە شانی . دەڵێن: بەرمەیدان شەری سەت زەلامت بۆ دەکات.

- راستە خوشکێ، دەڵێن: لەنیوەی شەوێ پارێزی لەدەستگیرانەکەی خۆی گرت، چۆکی دانابووە سەرسنگی، لەجێوەبەخەنجەران هەنجن هەنجی کردبوو ئەوجا دەستی لێهەلگرتبوو

- کچێ بابان کۆر ئەوەش بەجێی خۆی دەڵێن:رەحمان کەلۆس هەبوو ئەشقیا بوو، بەگورگی چیا ناودێرکرابوو. ئاوی بێ لغاوی خواردبۆوە خەڵك لەدەستی بەدادە داد بوون. لەفێڵبازی دا گرەوی لە رێوی دەبردەوە،دەستی لەسینگی خۆی

دابوو،گفتی بەئاغادابوو گوتبووی (بەکەزی خۆیان جەلەیان دەکەم) لەگەڵ سێ چوار کەتەزەلامی دیکە چووبوونە سەریان لەئەشکەوتی دێوان بیانگرن، دەگێڕنەوە دەڵێن: غوربەت و هاوڕێکانی تەڵەیەکی وایان بۆدانابوونەوە، کەلێیان هاتبوونە دەست کەلۆس پێڕانەگەیی بوو تەنانەت تفەنگی لەشان بکاتەوەسەیرلەوەدابووە! گوایە بەبریینداری هەردوو بن باڵی کەلۆسیان گرتووە. هەربۆقەشمەری حوکمیان لێکردووە دەبێ شاییان لەگەڵ بکات هەڵیانپەڕاندووە.

- کیژێ ئەدی لۆ باسی لەشکری گوندییەکان ناکەی دەڵێن:دکرێکی ئەوهایان پێکردن، با.. بەدەواری شڕی ناکات، سەری ئێمەیان بەرز کردۆتەوە. دەبێ یارمەتیان بدەین بەپارەو کەلوپەلی پێویست کۆمەکیان بکەین. پێویستە درێخی نەکەین لەکۆکردنەوەی پیتاك.

- ئەم هەویرە ئاوی زۆر دەوێ، دەبێ خۆمانی بۆ ئامادەبکەین، چونکە هەر پیتاك کۆکردنەوە نییە، کێ.؟! سەرپەرشتی ئەم کارە دەکات، کێ.؟! ئەم پیتاکە ڕادەستی ئافرەتانی یاخی بوو دەکات لەئەشکەوتی دێوان. بۆ ئەم مەبەستە واچاکە لە ڕۆژانی ئایندە چەند کەسانێکی خۆبەخش دەست نیشان بکەین، بەرپرسیارەتی بگرتە ئەستۆ). بەلاّم پیاوەکان بەمقۆمقۆی ئەم قسەلۆکانە لەناخەوە دەیهەژاندن بەبیستنی قەڵس دەبوون،

لەچایەخانەومەیخانەوتیاترۆخانەکاندا.لێیان دەبووە مشومڕو دەمەقاڵێ.!

- کاکە، ئەم قسە هیچو پوچانە چییە. ژن ویاخی بوون، وەللاّهی بەچاوی خۆم بیانبینم بڕواناکەم، قەت نەبووە و نابێ ژن سەری مەیدان لە پیاوان بگرن.

- کاکێ تۆ بڕوادەکەی ناکەی کەیفی خۆتە، وەك دەگێڕنەوە.! گوایە زینەڵ ئاغای گوندی زەردەشت ئاوا هانی گوندییەکانی دابوو لەشکریان

بۆگردبوون چووبوونە سەریان لەئەشکەوتی دێوان، بەلاّم ئافرەتانی یاخیبوو وەکو پڵنك لێیان هاتبوونە دەست، لەشکرەکەیان تێکوپێك شکاندووە.

- تکایە هەر ووسبە، باژنەکانمان لێمان هەڵنەگەڕێنەوە حەیامان دەچێ، ئاخر چۆلەکە خۆی چ هەیە هەتا شۆربای هەبێ.؟!

- کاکێ خۆم خۆمن ئەم قسانەم لەگیرفانی خۆم دەرناکەم. ئەوە قاچاخچییەکان، ئەوە دێوەرەو چەرچییەکان، بڕۆ پرسیاریان لێبکە. بزانە چۆنت وەلاّم دەدەنەوە،دەڵێن: باج لە کاروانچی ودێوەرەو قاچاخچییان وەردەگرن. پووشانە لە ڕەشماڵ نشینەکان وەردەگرن بیستوومە دەڵێن: سەرەك هۆزوعەشیرەتەکان دیاری نایاب و گرانبەها بۆ سەرکردەی یاخیبووان دەنێرن.

- ئێ باشە، پێمانالێی ئەم یاخیبوانە داواکاریان چییە.؟ لە پێناوچی یاخی بوونە.؟!

- گوایە داوای مافی سەربەستی و یەکسانی دەکەن، بۆ دەستەبەرکردنی داواکانیان لەدژی پیاوسالاری دەجەنگن.

- ئاا.. یەکسانی تڕحێو بەدەستی دێنن،

- بەدەستی بێنن یان نەهێنن، ئەوەیان شتێکی ترە.. ئەوەی من بزانم حکومەت داوای لە فەرمانداری ناوچەکە کردووە.! بەزووترین کات لەشکریان بۆ بکات، ئەوەی خۆی بەدەستەوە بدات باشە، لێی خۆش دەبن، ئەگەر نا، ئەوەی لەشەڕ دەستگیر بکرێ ئاژاوەچییە!! بە قسەی حکومەت دەبێ لەناویان بەرن.

# (٣٣)

خونچە، دەیزانی پوورە سێوە لێی بەگومان کەوتووە، هەر ڕووبەڕووی بێتەوە شرت و شۆی دەشکێنێ، بۆیە خۆی لێدەبوارد، جاری وابوو لەو ترسە ڕێگە گۆڕی دەرکرد. ڕۆژێکیان چێشتەنگاوێکی درەنگ، لەناکاو پوورە سێوە لێی بە ژووریێ کەوت.کەچاوی بەپوورەسێوەکەوت، هێندە تووڕەو تۆسنە ئاگری لەچاوی دەباری زەندەقی چوو. پوورە سێوە بەتەوسەوە پێی گوت:

- ئاغا ژنە خونچە چۆنی.؟!

– خانم عەلۆقرخنی مێردت، ئاگری تێبەردەی بۆن سۆی لێنایەت . پێمنالێ: ئەم هەمووخشڵ و هەیتوهوتەت لە کێ بوو.؟!

.. وادیارە شوێنی ئاغاژنە (بەلقیس ونازلی)ت گرتۆتەوە. هەش بەسەر تۆ مێرداری، ئەگەرچی پێی سەرگرانی، بەڵام شوورەییت بێ کەسیش نا گەمالە بۆرەکی بێ خێر، تیتك براێبەکێکی وەکو تۆیە حەیای هەموو ژنان دەبات، کچەتیوە سەرکزنگوێبگرە، دواجار پێت دەڵێم:

لە پڕێکەوە عەلۆ قرخن پەیدابوو.بۆیە قسەی بۆ تەواو نەکرا.

- پوورە سێوە بەخێر بێ ی.!

- خێراندار بی کوڕم.

- ئەی بۆ سەرپێی ڕاوەستاوی،ماڵ ماڵی خۆتە بفەرموو دانیشە.!

- ئاوەدان بی، بیلامانا تۆ لەکوڕی خۆم لە پێشتری، لە دوێنێکەوە قۆڵنجم هەستاوە، هاتم بۆلای خونچە، نەختێك شان و پیلی شێلام..

- ئیدی خۆت دەزانیماڵەکەم چۆڵە، لەترسی پشیلان جووجەڵەکانم ناومتە ژێر سەوەشێر ، بۆیە دەبێ بڕۆمەوە، ڕۆیی.

: خونچە، دەیزانی پوورە سێوە وابەئاسانی بەرۆکی بەرنادات، ڕاستەوخۆش نەیدەوێرا بەڕوویدا هەڵچەرخێتەوەبۆیەهەرچی هەڕەشەوگو ڕەشەی پوورە سێوە بوو لە پاشۆلی نا. بردی لەبەردەمی زینەڵ ئاغای هەڵڕشت. ئاغا لەدڵی خۆیدا گوتی: (پیرەژنێکی بەدکارەئەگەر دەیکوژم.؟ ناکرێ، گوند بەدەری دەکەم، شوورەییە، سووڕگومی دەکەم، ئەمەیان لەو خراپتر، نەخێر لەهەمووی چێتر ئەوەیە، لە ژوورێکی تاکو تەنیا دەرگای لەسەر کلۆم دەم زیندانی بکەم، تاکو کاری خونچە مەیسەر دەکەم. پاشان باهەر لە تەشکی خۆی بدا). بالێرەوە پوورە سێوەو خونچە وزینەڵ ئاغا لە گوندی زەردەشت ئاوا جێ بهێڵین، سەردانی فەرمانداری ناوچە بکەین، بزانین باس و خواس چییە؟

# (٣٤)

فەرمانداری ناوچەکە گوند بەگوند دەگەڕا، زانیاری لەسەر ئافرەتانی یاخی بوو کۆدەکردەوە، مەبەستی بوو لەبنج و بنەوانی ئاریشەکە حاڵی بێ، سەرزەنشتی پیاوانی دەکرد دەیگوت:

(چۆن؟! لەدرۆستی کۆمەڵێك ئافرەتی یاخی بوونایەن. ئەی ئەگەر بەیانی وولاتەکەمان بکەوێتە بەر هێرش و پەلاماری دوژمنان ئەوسا چۆن بەرپەرچیان دەدەنەوە.؟!

: خەڵکەکە سەریان داچەماندبوو ورتەیان لەدەم دەرنەدەهات، درێژەی پێدەدا دەیگوت: (بەیانی دەنێرم (باشچاوەش قەدۆ) بەخۆی و کۆمەڵێك جەندرمە ئامادەبن، هەنگێ بەچاوی خۆتان دەبینن کوو وەك بزنەگەل بەپێشەخۆیان دەدەن بەرەو شار ڕاپێچیان دەکەن. شەرمتان بەخۆ بێ کە پۆلیسێکی ئێمە ڕێی پێتان دەکەوێ چاوتان دەچیتە پشتی سەرتان. هەی دارزێن، ئێمە شەووڕۆژ بۆکێ لە سەر پێ وەستاوین؟! ئەگەر بەهاناتانەوە نێین؟! ژنەکانی خۆتان گوند بەدەرتان دەکەن. وەك ئێستا چۆن تەنگیان پێتان هەڵچنیوە، سەری مەیدانیان لێتان گرتووە.

: ئاغا سینگی ڕەپێشکرد گوتی:

- جەنابی فەرماندار، منیش هەروام پێگوتوون، گتوومە کە پۆلیسەك، یان فەرمانبەرێکی میریی بۆ خەملاندنی خەرمان دێتە گوندی خولق وخۆش بێ بەگەرمی پێشوازی لێبکەن.

ئەگەر بۆڕایی کردنی کاروباری ئێوەمانان نەبێ، خۆ سەگی هار نەبووە دێتە ئەم ناوە پێمگتوون.! کاوڕبێ، گیسك بێ، عەلەشیش بێ، بیکەنە دەستەو دیاری، با منداڵەکانیان پێ کەیف خۆش بن.

ئێستاش باهەموو بزانن.! هەرکاتێك جەنابی باشچاوەش قەدۆ بەخۆی ولەشکرەکەی تەشریفیان هێنا خەرجی و مەساریفی لەشکر دەگرنە ئەستۆ، جەنابی فەرماندار قسەی پێبڕی گوتی:

- خەرجی و مەساریف خەم نییە پەك ناکەوێ، گرنگ ئەوەیە هاوکاری لەشکر بکەن، بۆ ئەوەی هەرچی زووە لەناویان بەرین، ئەگەر لەناویان نەبەین.؟! لە پایتەختەوە سەرکۆنەمان دەکەن، لەلایەك ڕیسوا دەبین، لەلایەکی دیکەوە ئەگەر نان بڕاشمان نەکەن، لەپلەوپایەمان کەم دەکەنەوە، من هەر ئێستا دەگەڕێمەوە بۆ شار لەم ڕۆژانە لەشکر دەنێرم، باهێرشێکیان بۆ بکەن و دەستگیریان بکەن.

: بەسرتە بەگوێی ئاغادا چرپاند.!

- کە ڕۆیشتم، پاشان بەگوێیاندا هەڵبێنە نەبادا خۆیان لەگێلی بدەن پشتی خۆیان بکەنەوە، من بۆ سەردان و میوانداری دێمەوە بۆ لاتان،

- بەڵێ قوربان، ئەوە خەمی منە، خۆم دەزانم چۆن لەداریان دەپێچم.

: ئاغا بەم قسانەی فەرماندار ترسی گەیشتبووێ چکو ئەو دەستی لە ژنەکانی شووشت بوو، مرخی خۆی لە خونچە خۆشکردبوو، خەریکی پیلان گێڕان بوو، گەرەکی بوو بەر لەوەی کارەسات ڕووبدات عەلۆ قرخن لە نێوببات، خونچە بکاتە هاوسەری خۆی، بەڵام چۆن لەناوی بات،نازانێ. دەگژفکران ڕادەچوو، بیری لێدەکردەوە، هەرچەندی دەیکردودەکۆشا

،نەخێر، گرێ کوێرەیەك بووبۆی نەدەکراوە، لەحەیبەتان لێوی خۆی دەکرۆژتەوە، شەو بەدرەنگ داکەوتبوو هێشتان خەوی لێنەکەوتبوو. گەوزی

بەخۆی دەدا کەلەکە گۆڕی دەکرد،دواتر بەخۆی نەیزانی کەی خەوی لێکەوت، خەوی جرناوفرنای دەدیت، خەونی بە (بەلقیس و نازلی)دەدی، خەونی بەخونچەوە دەبینی، دواجار خەونی بە (هەیاسە شەل)ەوە بینی، بەئاگاهات لە خۆشیان پێی عاردی نەدەگرت.

# (٣٥)

هەیاسە شەل ئەشقیا بوو، بەنوێژی نیومڕۆ دەرگای لە ئاغاوقولە کێخوایان دەگرت، سەرانەی لێدەستاندن. هاوشانی ڕەحمان کەلۆس بوو. سواری ئەسپەکی ڕەشی قەترانی بێ نیشان دەبوو. شەو ڕۆژ شەش خەریتەی لەخۆی دەبەستا، بۆ هەرکوێیەك ڕۆیشتبا دووچەتەی بەدواوە بوو.. لەو خەونەیدا هەیاسە شەلی بینی زۆر ترسا. لەترسان لەخەودا ڕاچەنی. چاوی بەملاوئەولادا گێڕا، نەخێر، خەون بوو، جگەرمیەکی داگیرساند دوو، سێ مژی لێدا بێنی هاتەوەبەر، لەخۆی پرسی تۆ بڵێی: دەبێ ئێستا لەکوێ بێ.؟! چۆنی بدۆزمەوە.؟! ئەو چەتانە وەکو (مار)ی بێ(لان)وان، هەرساتەو لە شوێنەك وجێگۆڕی دەکەن. بەڵام ماڵی چەتەو ئەشقیا. هەر شاخ و ئەشکەوت و شوێنی سەخت بووە. خۆر بکەوێتەوە بە شوێنی دا دەچم هەر دەبێ بیدۆزمەوە.

: دەنگو باسی دەست بەسەرو زیندانی کردنی پوورە سێوە لە ماڵی زینەڵ ئاغا دەنگی دابۆوەمقۆمقۆی ئەوەش لە گۆڕێ بوو. گوایە لەم ڕۆژانەدا باشچاوەش قەدۆ، بەخۆی بە کۆمەڵێك پۆلیسی سوارە هەڵدەکوتنە سەر بنکەو بارەگای ئافرەتانی یاخی بوولە ئەشکەوتی دێوان.

: هاوڕێ غوربەت بەبیستنی زیندانی کردنی پوورە سێوە نیگەران و خەفەتخانبوولەقاران ئاگر لە چاوی دەباری، هەرچەندی دەیکردودەکۆشا، خەو نەدەچووە چاوی بیری دەکردەوە کوو ڕزگاری بکات. مەبەستی بوو بەرلەوەی لەگەڵ (باشچاوەش قەدۆ) ئاڵنگاری یەکدی بن پوورە سێوە قوتاربکات. بۆ ئەم مەبەستە ڕاوێژی نازێی کرد،نازێ.! لەو ڕۆژەوە هاتووتە ئەشکەوتی دێوان بوومتە

جەنگاوەرێکی ئازاو بەجەرگ. لەسوارچاکیشدا سوارچاکە. بەسەر پشتی ئەسپەوە لەبای غاردان نیشانەی بۆ دادەنێن، دەیپێکی هەڵیدەگری. هەردووکیان خەریکی گفت وگۆبوون. خەریکبوون بەداڕشتنی پیلانێك پوورە سێوەی پێ ڕزگار بکەن. هێوارەی ڕۆژی ئاینده دنیا ئەنگۆرە ببوو، نازێ و عەیشان و دڵبەر بەسواری ئەسپ، ئەسپێکیشیان قەتار کێش کرد، هێدی هێدی بەرەو دەشتایی شۆڕبوونەوە.. شەوبەنیوە بوو گەیشتبوونە نزیك گوندی زەردەشت ئاوا. ئاخرو ئۆخری پاییز بوو، شەوانی پاییز ساردی کەس لە سەربانان نەبوو، خەڵك لە ژوورەوە دەخەوتن.

: خانووبەرەی ماڵی ئاغا کەوتبووە پەڕگەی ئاوایی ڕوو لە گوندی بوو، لای پشتەوە لێژو نشێو بوو. هێشتا مابوو بگەنە ئاوایی سەنگرانەوە هەرسێکیان دابەزین. هەوساری ئەسپەکانیان دا دەست دڵبەر.. (تۆ لێرە لای ئەسپەکان وەمێنێ. وریای خۆت بە هەتا دەگەڕێنەوە). دواتر هەردووکیان بەپەنادزە خۆیان گەیاندە بن دیواری خانووی ماڵی ئاغا، تاوێ هەستیان لەخۆیان بڕی هیچ لە ئارادا نەبوو، بە قوونە دزە خۆیان گەیاندە دەرگای حەوشە دەرگاکە ڕپێشکرابوو، نازێ گوتی:

- باله ڕێسمەی بەرین.؟

- نەخێر، وانابێ.. وەرە پشتی خۆتم بۆ دانێوە من ئاودیو دەبم، بەلآم هشیار بە کە زانیت تووشی گرفت بووم، تۆ کارێکی وابکە سەریان لێ بشێوێنە..

: پشتی خۆی بۆ داچەماندەوە بەسەر پشتی کەوت،گوتی:

- عەیشان دیوارەکە بەرزە کەمێك خۆت ڕاستکەوە. هەتا دەستم بگاتە سەرتیلەی دیوار.!

- باشە دەی.

: خۆی هەڵدایە سەر دیوار. هێدی هێدی بەسەر دیوارەکەدا خشی تاگەییە ئاستی پێبلقە، بەهێواشی بەسەر پێبلقەداکاندا چووە خوارێ، لەقوژبنێکی حەوشەدا خۆی مات کرد، هەستی لەخۆی بڕی، تاکو بێنی وەبەر هاتەوە، ئەنجا هەر لەجێوە چاوی بەهەموو کون و قوژبن وکەلەبەری حەوشەدا داگێڕا پاشان هەستاوە سەرپێ. بەدڵنیایی بەلای (نانەین)دا خشی لە کولانکەی شمشێرەی دەرگا سەیری ژوورەوەی کرد. چراکە کز کرابووبوولێڵ بوو، چاوی گێڕا. لەبەرەخۆی گوتی:

(بێگومان ئەمەیان پوورە سێوەیە، بەلأم نازانم ئەوەی دیکە کێیە؟ لەتەکی ڕاکشاوە.) بەئەسپایی دەرگەی لە گرێژەن برد، تفەنگی لە شان کردەوە ئامادەباشی خۆی وەگرت. بەشێنەیی چووە ژوورێ. لەبان سەری پوورە سێوە ڕاوەستا دیقەتی دایێ.! ئا.. خۆیەتی. ڕوونشتەوە سەر چنچکان بەنەرمی ڕایهەژاند.. (پوورە سێوە .. پوورە سێوە ). هشیاری کردەوە. دەیزانی پوورە سێوە زۆر بەزمان وزارگەرمە بواری قسەکردنی پێنەدا گوتی: (پوورە سێوە منم نازێ هەستە بەخۆکەوە.! پوورە سێوە لەجێوە نیوەڕاست بۆوە، دەستی کردە ملی نەماچێك نەدووان، نازێش دەستی ماچ کرد، پوورە سێوە هەست وسۆزی غەریبی هەستابوو گریان هەوکی گرتبوو قسەی بۆ نەدەکرا، نازێ پێی گوت:

(پوورێ، عەیشان و دڵبەر واڵە دەرەوە لە چاوەڕوانی ئێمەدان، هەستەوە هەتا کەس پێی نەزانیوە بابڕۆین. هاوڕێ غوربەت گوتی(دەبێ شەو وەبەریەوە مابێ بگەنەوە ئەشکەوتی دێوان) پوورە سێوە لەناو پێخەف دەرکەوت هندامی خۆی ڕێکخستەوە، سەرپشتی لێ بەستا، دواتر بە هێواشی (حەیدەر)ی کوڕەزای بەئاگا هێنا پێی گوت(هەستە لەدەوری سەرت گەڕێم دەنگت لێوەنێ، نەبادا پێبزانن دەڕۆین باشە.!

: نازێ دەستی حەیدەری گرت، پوورە سێوە بەدوای ئەواندا بەسەر پێبڵقاندا هەڵگەڕان. نازێ هەردوو دەستی حەیدەری گرت بەدیوارەکەدا شۆڕی کردەوە، لەخوارەوە عەیشان لێی وەرگرت. بەڵام هەرچی پوورە سێوە بوو کەلەشی گەرەو قورس بوو، عەیشان پێنەدەوەستا وەریبگرێ، نازێ دابەزیە خوارەوە، بە پوورە سێوەی گوت: (پوورێ،دەستت لە سووچی دیوارەکە گیرکە بە هێواشی خۆت شۆڕکەوە مەترسە ناهێلین ئازارت پێ بگات ئیدی بە هەرحاڵی هەبوو پوورە سێوەیان دابەزاندە خوارەوە. پوورە سێوە ئاهێکی ساردی هەڵکێشا گوتی :

(ئاخ خ.. پیریی و سەت عەیب) پاشان نازێ دەستی حەیدەری گرت، پوورە سێوە بەدواوەی بوو، عەیشان تفەنگی لەدوڕ دەستی دابوو دوابەدوای ئەوان سەیادی لێدەکردن، لەم پەنا دیوار بۆئەو بن دیوار دزەیان دەکرد، لەئاست ماڵی غوربەت، (کسۆک)ێك مراندی پوورە سێوە گوتی: (ئەوە گەماڵە بۆری ماڵی باوکی غوربەتە. نازانم. گەماڵەبۆر گوێی لەناوی غوربەت بوو، یان نازێ و عەیشان بۆنی غوربەتیان لێدەهات. بۆنی غوربەتی کردبوو، یانیش هەروەکو دەڵێن(سەگ بەئافرەت ناوەڕێ). هەر ئەو مڕاندنە بوو مڕاندی چیتر نەحەپی. دەستی کرد بە کڵك بادان ونووسکەنووسك، تائەوپەڕی ئاوایی قەرەبەقەرەیان دەڕۆیی. کەلەگوندی دەرچوون گەماڵەبۆر لەجێوە چەقی بووهێشتا هەر کڵکی بادەدا. هێشتا مابوو بگەنەوە لای دڵبەر چرکەی لەتفەنگی دەستی هێنا سواری کرد، نازێ پێی حەسیا، وەکو هۆزار بۆی خوێند. دڵبەری دڵنیاکردەوە، ئەنجا دڵبەر بەفیکە فیك دەستی بەبزویاڵی ئەسپەکان دا هێنا هێوری کردنەوە، پاشان،پوورە سێوەیان سواری ئەسپێك کرد نازێ حەیدەری لە پشتەخۆی سوارکرد.. عەیشان و دڵبەر سواربوون بەڕێ کەوتن. هێشتانەکێ گەزنگی نەدابوو گەیشتنەوە ئەشکەوت ئەمشەو خەو تخونی چاوی هاوڕێ غوربەت نەکەوتبوو. لە چاوەڕوانی ئەوان

دابوو. کەی دەگەنەوە جێ تاکو پێشوازی لە پوورە سێوە بکات. کەلەدوورِا بەدەرکەوتن غوربەت هەیپای لێکرد بەغاردان چوو هەوساری ئەسپی بن پوورە سێوەی گرت.

بن پیلی پوورە سێوەی گرت بەهێواشی دایبەزاند، پڕی دا دەستی دەستی ماچ کرد پوورە سێوەش ماچی کردو دەیگوت(پوورە سێوە بەلاگێڕت بێ) دواتر هامێزی لە حەیدەر وەرێنا دایبەزاند، توونو لە باوەشی گرتبوو ماچی دەکرد. دەیگوت:

(نازێ ، عەیشان وەرن سەیری کەن. حەیدەر چەندجوان بووە جوان!! لێرە بەدواوەکەس بانگی نەکات بلێ حەیدەر، بە(حەیدەرکۆ) بانگی بکەن، دواتر بە دەستێك دەستی پوورە سێوەی گرتبوو بەدەستەکەی دیکەی دەستی حەیدەرکۆی گرتبوو بردنی بۆ ژووری ئەشکەوت.

# (٣٦)

خونچە لەگەڵ بانگ وسەلأی بەیانی لەخەو ڕابوو، وەك هەموو بەیانییانی پێشوو بەدەرگای دیوەخان دا چووە حەوشەی ماڵی ئاغا. لەناندین خەریکی ئامادەکردنی نان وپێخۆری بەیانی بوو، کەس بەئاگانەبوو، چوو لە دەلاقەوە سەیری پوورە سێوە بکات، پووریٚ لەسەر جێگا نەبوو، دەستی بۆدەرگە برد پاڵی پێوەنا دەرگا کەوتە سەر پشت شمشێرەی ڕەپێش نەکرابوو، ئەملاوئەولای پشکنی نەخێر نەبوو، چوو تەماشای دەرگای حەوشەی کرد. شمشێرەی تەواو ڕەپێش کرابوو، ژووری هەردوو پیرەژنەکانی بەسەرکردەوە خەوتبوون. گەڕاوە تاویٚ لەپێش دەرگای ناندین ڕاوەستا، لەبەرخۆیەوە گوتی(چی بکەم. پیرەژنە بەد فەساڵ ملی بشکیٚ. چووزانم چی بەسەر هاتووە) پاشان سەری خۆی ڕاهەژاند چۆوە ناندین خۆر وەبانان کەوتبوو. کەس لەناو پێخەفدا نەمابوو قاپێك شلکێنە و دوو ئەستوورگی گەرم و پیالە چایەکی دانا سەر (خوانچە) بردی لەپێش دەمی ئاغا داینا، دوای قاوەڵتی کردن بەئاغای گوت:

- پوورە سێوەو کوڕەزاکەی هەڵاتوون،تەماشای دەرگای حەوشەم کرد دەستی لێنەدراوە کوو هەڵاتوون،بۆ کویٚ چوونە نازانم،

: ئاغا گومانی لە عەلۆ قرخنی مێردی خونچەبوو،پرسی؟

- کووا عەلۆ لە کوێیە؟

- وا لەدیوەخان خەریکی برژاندنی قاوەیە.

- برۆ بانگی بکەنا نا پێی بڵێ: بابچێ بزانێ ئەم پیرەژنە دەڵەقۆڕە لە ماڵەئەگەر لە ماڵ نەبوو با هەموو ماڵەکانی ئاوایی بگەڕێ. پەلکێشی بکات بیهێنیتەوە بۆ ئێرە دەبێ سندمی بکەم.

: نەخێر، عەلۆ قرخن بەسۆراخی نەکەوت. بەهەڵەداوان بایداوە پێی پێوەنا بەلۆقەلۆق وهینکە بڕلەبەردەمی ئاغا گیرسایەوە و گوتی:

- قوربان، نەك هەر لەماڵ نەبوو،ماڵ بەماڵی ئاواییم پشکنی نەخۆی نەکوڕەزاکەی کەس بە سۆراخیان نازانێ.

: لەقاران لە تریقەی پێکەنینی دا گوتی:

(لەوانەیە شەیتان کڵاوی سەخرە جنی دابیتێ، خۆی لێمان شوون بزر کردووە، یانیش فریشتەکان لە هامێزیان گرتووە بردوویانە بۆ ئاسمان) دەموچاوی گرژبوو، نیوچەوانی لۆچی تێکەوت. لەدڵی خۆیدا گوتی (ڕۆیی بەجەهەننەم، ئاکارلەکار نەترازاوە، واچاکە بەشوێن هەیاسە شەل دا بچم. باڕیسم لێنەبێتەوە بەخوری) دەنگی عەلۆی دا.!

- عەلۆ، برۆ ئەو ماینەم بۆ زین و لغاو بکەو بیهێنە.!

: تفەنگی کردە شانی، پێی لە ڕکێبی زین نا خۆی هەڵدا سەرزین وپشتی ماینەبۆر. بەرەو چیا مەکۆی ڕێگرو ئەشقیایان تێیتەقاند، هەیاسە شەل وەکو هەڵۆ کامە شوێن بەرزو سەختە ڕێی تێناچێ بەرۆژ ئەوە مەکانیەتی. سەر لە هێوارانیش بەخۆی وسولەیمان گورگ خنکێن و حەمەکیوی،

دووچەتەی بەناوو دەنگبوون، یاغریاغر بەنشێودا شۆڕدەبوونەوە، سەردەراوو ڕێگەیان لە کاروانچی و قاچاخچییان دەگرت ڕووتیان دەکردن، هەیاسەشەل، دەستی دانا سەرچاوی سەیری کرد دیتی سوارێك بەبنی گەلیدا بۆلای ئەوان دێت، بانگی هەردووکیانی کرد، ئەنگوستی بۆ بنی گەلی درێژکرد.

- ئەو سوارەتان دیوە.؟! بەرەو ئێرە دێت، لەوانەیەنابەڵەدبێ، لەوانەشە ئاشنا بێ.! گورگ خنکێن گوتی:

- بڵێم چی، لەوانەیە تازە ئەشقیا بێ، هاتووە سەری مەیدانمان لێبگرێ خۆی تاقی بکاتەوە.حەمەکیوی لێی وەرگرتەوە گوتی:

- نا ئەگەر تازە ئەشقیا بێ.؟! هاتووە خۆی دەخالەت بکات، چونکی ئەگەر بەنیازی مەیدانخوازی بێ، تاسا ناکات ئەوها ڕاستەوخۆ ڕووبەڕوومان بێتەوە. هەیاسە شەل گوتی:

- هەرکامیان بێ گرنگ نییە. بابۆی داکشێین.

: لەبنی گەلی هەڵوەستەکی کرد، بەسەر پشتی مایین چاوی گێڕا، ڕچەڕێیەکی باریك. وەکو بزنەڕێ بەنێو ڕەوەزو شاخ وداروەدەوەندا بەهەورازدا کشاوە، لەبەرخۆیەوە گوتی:

(سوێند دەخۆم کە هێشتانەکێ شەیتان ڕێی بێرەدا نەکەوتووە).

: هێدی هێدی بەهەورازدا کێڵبۆوە نیوەی ڕێی نەبڕی بوو، لەگەڵ دەنگی قرمژنی باقەنەجەمەی تفەنگ و کێی کورە زەلام.؟! ڕاچەنی، ماینە بۆر لە جێوە چەقی. لوولەی تفەنگی گەیاندە قەبرغەی، بەدەنگێکی گڕ تێی ڕاخوڕی.! لە جێوە نەبزوی. ئەگینا کوژراوی،هەیاسەشەل، ڕووبەڕووی بوو پێی گوت:

- ئاغا ئەگەر بەنیازی ڕاووشکار هاتووی. ئێرە شوێنی ڕاووشکار نییە، ئەگەر بەخەیاڵی ئەوەش هاتووی بەجێگەو ڕێگەی ئێمە بکەوی ولەلای کاربەدەستانی میری خۆت شیرین و خۆشەویست بکەی، ئەوەسووڕ بزانە.! کە بەم خۆشەویستیە ڕاناگەی، چونکی هەر ئێستا دەتکەمە خۆراکی دڕندەوچەقەڵ ودالآش چاوت هەڵدەکۆڵن، جا ڕاست و ڕەوان پێمان بڵێ: چی تۆی گەیاندەئەم جەنگە ڵستانە.؟!

- کاك هەیاس، نەڕاوچیم، نە پێویستم بە خۆشەویستی پیاوانی میری یە،

بەلاّم پێویستم بە ناودارەکی نازاو بەجەرگ و ماقووڵی وەك جەنابتە، بۆیە بەهەڵەداوان هانام بۆت هێناوە.

- مادام وایە فەرموودابەزە پشوو بدە، پاشان دووقسەی لێدەکەین.

: دابەزی هەوساری ماینەکەی لەبنەدارێك گرێدا. دواتر هەرچواریان روونشتن.سەروجگەرەی پێدان،هێشتا جگەرەی بەکۆتا نەهاتبوو، بەکۆخەکۆخ قورگی خۆی خاوێن کردەوە گوتی:

- پیاو کەلێی دەقەومی 'سەرهەڵدەگرێ، بەلاّم بۆلای کێ سەرهەڵدەگرێ.؟!

بێگومان بۆلای عەگیدو پیاوماقولاّن سەرهەڵدەگرێ، چونکی پیاوی عەگید کە تفی رووکرد، ئەگەر سوور بزانێ سەری تیادا دەچێ. هەڵێناگرێتەوە بۆیە قەت نابێ هانا وەبەر بۆرە پیاوان ببات،چونکی بێ مەیدانن،بۆیە دەڵێن (ئەگەر زبڵ بەسەری خۆت دادەکەی برۆ سەر گوفەکی گەورە مالاّن) واتا ئەگەر پیاو لەکاتی ناوەخت لەدەرگای پیاوی ماقووڵ بدات، بێگومان نا ئومێد نابێ، منیش هەر بەم نیازەوە سەری خۆم هەڵگرتووە هاتووم هاوارم هێناوەتە بەر جەنابت. هەیاسەشەل دنەی نەدا چیتر بدوێ پێی گوت:

- ئێمە ئەگەر چی بەچەتەو رێگر ناسراوین ناوبانگمان دەرکردووە، بەلاّم بەحەقیقەت وانییە، ئەگەر یەکێك خۆی دەخالەتی ئێمە بکات سەرمان تیادا بچێ بەلامانەوە گرنگ نییە،

- بەڵێ کاك هەیاس گومانم نیە دڵنیام،

درێژەی پێدا گوتی:

سەبارەت بەنافرەتانی یاخی بوو لە ئەشکەوتی دێوان، لەوانەیە زانیبت. کەلەرۆژانی رابردوودا فەرمانداری ناوچەکەمان بەخۆی هاتبوو، لەبنج و بنەوانی کێشەکەمان بگات، بەلاّم من بەگومانم لەقسەکانی فەرماندار، پێموایە کە خراپیان

تێگەیاندووە، گوایە من سەبەبکارم، لەبەر ئەوە بوو هاتووم داوای یارمەتیت لێدەکەم.!

- یارمەتی وەکو چی؟

- سبەی شەو دوای ماڵنووستنان بەخۆت ویاوەرەکانت وەرن، هەریەکەولەلایەکی گوندی زەردەشت ئاوا دوورو نزیك، ڕوو لە دیوەخان سێ، چوار دەستڕێژ بەسەر ئاوایی دا حەواڵە بکەن، ئێمەش بووکانە وەلآمتان دەدەینەوە و هیچی تر، پاشان بگەڕێنەوە دواتر کیسەیەك پارەی لە مستی هەیاسەشەل ناو گوتی:

- ئەوە بۆ خەرجی خۆتان، پاشان دەفاتی دەستڕێژەکان فیشەکتان بۆ دەنێرم.

: هەیاسەشەل لەقاقای پێکەنینی دا گوتی:

- پێموابوو هاتبووە داوای سەری فەرماندار دەکات.ئاغا، داواکاریەکەی تۆ بەر ئەم ماندووبوون و زەحمەتیە ناکەوێ.. کەتۆ داوتە بەرخۆت، دڵنیابە، سبەی شەو دنیات بۆ دەکەمە ئاگرباران. بەمەرجێك لەشار دەنگ بداتەوە، باشە.؟!

- زۆر سوپاس منەتبارم.

: بەگفت دانی هەیاسەشەل، دڵی داکەوت. لێی سواربوو گەڕایەوە.

# (٣٧)

خۆر تازە پرشنگی بەسەربانەکاندا پرژاندبوو، لەخەو ڕابوون دوای ڤاوەڵتی کردن پوورەسێوە گوتی:

- ڕۆڵە غوربەتخان، دەنگۆ وابوو لەم ڕۆژانەدا(( باشچاوەش قەدۆ)) بەخۆی وبەکۆمەڵێك جەندرمە دێنە سەرمان، تۆ، ئەو تەرەسە ناناسی وەك من دەیناسم. دایك خۆگێیەکی ئەوهایە لەسەر دایکی خۆی بازنادات. هەرمن دەزانم چەند چیرەدرێژە. دین وئیمانی پارەوژنە. پارەی بۆ هەڵدە تازی پێ جل بکە. پوولەکی وەك خۆی نییەبەپارە دایکی خۆی، بگرە حەلالی بن چۆکی خۆی دەفرۆشی. شەرمی بەخۆی نییە. لەگەڵ ئەوەشدا ڤەحپەبابەکی بەسام و هەیبەتە هەرگیز چاو داناگری. زاڵم و لەخودا نەترسە ناپەنگێتەوە، نێر نییە قسەلەقسەی بکات، شێخ و مەلاو ئاغاوکێخواوسەرکاروکرمانج نازانێ وەك پێمگوتی (پارەوژن). تەنها لەدەست ئەم دووانە وەکو (ماکەر) دەلەوچی. دەستوەکەری بۆ ناکرێ. کچم غوربەت، تۆ شارەزاییت لەم جۆرە نیشانە نییە، هەرچی چەتەی وابەم کێوانەوەن. سەرانە دەدەنە ئەم نامەردەنەم باشچاوەش قەدۆیە بەخورتی سەرانەیان لێدەستێنێ، ئەگەر چەتەیەك بغەزری سەرانەی نەداتێ، هەر بەچەتەکانی دیکە بەکوشتنی دەدات. ئەو بێناموسە لەمێژە، ئەسڵەن لەو ڕۆژەوە کە تۆ (کەلۆس)ت لەناوبرد ناوبانگی تۆی بیستووە. هەرمن دەزانم چەند غەرەزی لێت هەڵگرتووەچونکی ئەو خێروبێرو دەستکەوتەی لە کەلۆسی دەست دەکەوت لە کەسێکی دیکە دەستی ناکەوێ، بۆیە لەمێژە چاوەڕوانی ڕۆژەکی ئەوهابوو

سەبارەت بەتۆنێستاش هەروەکو دەڵێن ((پێش باران کەپەنگ)). جاتۆ تەگبیری حاڵی خۆت بکە.ئاا... چاکبوو وەبیرم هاتەوە. بائەوەشت پێبڵێم.!

ئەو ماڵۆسە زینەڵ ئاغا بەئاشکرا دەستی لەگەڵ (خونچە) تێکەڵ کردووە. دڵنیام کاکەوبرالەی خۆیان کردووە. لەبەردان بەهەرفرت و فێڵەکی هەبێ عەلۆ قرخن لەناوبەرن. پاشان خونچە بکاتە کەیبانووی ماڵ. بۆیە دەزانم چونکی هەر لەهەنووکەوە خونچەی پۆشتە کردووە مەپرسە! لەزێڕی هەڵکێشاوە دەڵێی ئاغە ژنەئەوێ ڕۆژێ هەڕەشەم لێکرد، ئەو چاو مۆنە چاوی خۆی بەرداوە. دەزانم هەر لەپای ئەمە بوو ئەو گەمبۆرە زیندانی کردم).

: هاوڕێ غوربەت، گوێی بۆ قسەکانی پوورەسێوە هەڵخستبوو، لەدەرونەوە گرنگی بە ئامۆژگاریەکانی دەدا، بیری دەرکردەوە چۆن.؟! بەسەری دا زاڵ بێت.

گوندە لە زووێکەوە دەستی ئەنفالچییەکانی گەیشتووتێ وێران کراوە، هەرکەسەو لە شوێنی خۆی دامابوو بیری لە ئاکامی کارەساتەکە دەکردەوە دۆش دامابوون، ئەم کاتە هشیاربوونەوە کە لە سێ لای گوندەوە تەقە دەستی پێکرد، دەتگوت: برێشکەیە بەسەر گوندی دا دەتەقێتەوە گوللەی هەردوولا لەئاسمانەوە پێکدەگەوتن بلاچەی دەدا، کردبوویانە ئاگرباران و پشێویەکی هۆتۆ، سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوەدەستەی هەیاسە شەل، لوولەی تفەنگیان ئاراستەی دیوەخان کردبوو، دایانگرتبووە بەر دەستڕێژان. ئاغا. بەپێی پیلانی بۆی دارشتبوو، لەم قوژبن بۆ ئەم قوژبن تەقەی دەکرد، ناوەناوە دەنگی عەلۆی دەدا دەیگوت: (وریای خۆت بە دزەت لێنەکەن)تەقە بەردەوام بوو، عەلۆ خۆی دابووە قولینچکی دیواری دیوەخان پشتی لەئاغابوو، نامەردە لوولەی بۆ سووڕاند سێرەی لێگرت لێی ئاگردا، عەلۆ لە جێوە وەك (گا) قۆڕاندی وبەلاداکەوت، هەر ئەم قۆڕاندنە بوو قۆڕاندی ئەلفازی نەگەڕا، ناوشانی هەڵتەکاندبوو، دەستبەجێ گیانی سپاردخونچە. گوێی لە دەنگی عەلۆ بووکە قۆڕاندی یەکتاو بەڕاکردن چووەسەری. فوارەی خوێن جۆگەڵەی بەستبوو لەبەری دەڕۆیی.

دەمانچەی دەستی لە گۆڕێ کەوتبوو. هەڵیگرتەوە لەبن باخەڵی ئاەدواتر دەستی کرد بە شین وگریان ودادو فیغان، قژی خۆی دەڕنییەوەبەرەبەرە دەنگی تەقە ڕوو لە کەمی بوونەخێر، بەیەکجاری هاتە بڕان. خەڵك بەهەڵەداوان لە ماڵان دەرکەوتن بەڕاکردن لەپێش دیوەخان بەدیار لاشەی عەلۆ گیرسانەوە. عەلۆ لە سەرچاوکەوتبوو خوێنی لەبەردەڕۆیی لەحەیبەتان تێکدە قژقژان، پەکوو، پەکوویان بوولەچۆکی خۆیان دەدا، ببووە سەگ وەڕین وهەراوزنا لەئاوایی زرەدەشت ئاوا. کەس بەکەس نەبوو.

: خونچە؟بەهەلیزانی خۆی گەیاندە تەویلە وزینی لە ماینەبۆر کرد لێی سواربوو بەرەو گوندی(ئاریاوە) بۆلای سمکۆ.کلکی بەماین هەلگرتبوو. بۆی دەرچوو.

: سپێدە زوو لاشەی عەلۆیان بەخاك سپارد. پاشان ئەملاخونچە، ئەولا خونچە، نەخێر شوون بزر بوو بەممزندەی هەمووان پێیانوابوو کە خونچە لەحەیبەت عەلۆ، سەری خۆی هەلگرتووە، بەری خۆی داوەتە ئەشکەوتی دێوان رۆییوە.

: بەتەنیا پلکە پێناو شۆخی بەقسەی ئەم خەلکە دەهات. چونکە ئەوسوور دەیزانی ئاگری عیشق بۆ کێندەر سەری پێ هەلگرتووە.

: هەرچی ئاغابوو لەحەیبەت خونچە لەچۆکی خۆی دەدا لەبەرە خۆی دەیگوت(چۆن فریوی دام‌بێ خەتا ئەم پیاوەم کوشت). هەرلەبەخۆیەوە منگەمنگی بوو. خەلکەکە پێیانوابوو کە ئاغا پەرۆشی عەلۆیە. چیتر خۆی بۆ نەگیرا گوتی:

(خزمینە، ئەو دەلیسانە شوولیان لێ هەلکێشاوە، ئاگرێ چیتر دەستەوئەژنۆ هەلکورمێین، هەر ئێستا دەرۆم ئاگاداری فەرماندار دەکەمەوە، من لە خوێنی عەلۆ خۆشنابم). دەلحاز لێ سواربوو رێی شاری گرتەبەر).

# (٣٩)

هێشتانەکێ مابوو بکاتە گوندی ئاریاواگیرسایەوە. لەسەر پشتی ماین دابەزی، ڕووی ماینی بەلای گوندی زەردەشت ئاوا وەرچەرخاند هەوساری لەملی ئالاند. دووشەپە دەستی خێوانده سەر پاشەڵی بەری هەڵدا (هێی) لێکرد.! ماینی تایین وەکو مەلی تیژباڵ تەقڵەکووت تێی تەقاند ڕۆیی.

: کەگەییە گوندی ئاریاوا بەیانی دابوو، پیرەژنەکان نێڵەنێڵی ئاگریان پڕبەگەرووی سۆبەی قشپل لە ناوەڕاست حەوشەدا بەئاسمان دا هەڵدەچوو. هەندێکیان خەریکی نان کردن بوون. بۆنی نانی گەرمی گەنم دەماردەمار دەڕۆیی، تێکەڵ بە شنەبای سەحەر دەبوولەوەپێش شارەزابوو، بەئەسپایی پاڵی بەدەرگای حەوشەی ماڵی (سمکۆ)وەنا بەشێنەیی چووە حەوشە، دایکی سمکۆ، خەریکی چایەو قاوەڵتی بوو سلاوی لێکرد، ڕابووە سەرپێ بەگەرمی سلاوی لێوەرگرتەوە فەرمووی لێکرد،دانیشت، پێکەوە قاوەڵتیان کرد،هێشتا دەستیان لێ نەکێشابۆوە، سمکۆ لە خەوڕابوو. بەپێش ناندین دا خەریك بوو تێبپەڕی بچی دەست و دەموچاوی بشوات، دایکی بانگی کرد.! (ڕۆڵە سمکۆ، میوانمان هاتووە. وەرە بەخێرهاتنی لێبکە میوان ئازیزە.

سمکۆ، کە ئاوڕی داوە چاوی بە خونچەکەوت لەجێوەچەقی. تەزییەك لەبنی پێی لە برووسکەی دا وەکو دووکەڵ لە کوونە لووتی دەرچوو، دنیای لێ تاریك داهات، ڕەنگی رووی هەڵبزرکا نتقی گیرا،چاوی لەمۆڵەقداما. خونچە،هیچ خۆی لەگوورە نەبرد، یەك پێ لەبەری هەستاوە، دایکی پێی گوت:

- کوڕم ئەوە لۆ شەرم دایگرتی، شەرمێ مەکە وەرە پێش بەخێرهاتنی بکە، نەبادا پاشان گلەییمان لێبکات بڵێ: بێ ڕێزوحورمەتن ڕێزلەمیوان ناگرن. خونچە، خۆی تێهەڵقورتاند گوتی:

(قەیدی چییە، هێشتان جحێڵە شەرمی نەشکاوە، بەتایبەتی لە ڕووی ئافرەتی بێگانەدا شەرمێ دەکات. ئەگەر بەخێرهاتنیشم نەکات لەدڵم نابێتە گرێ)

: سمکۆ، لەحەژمەتان هەموو گیانی شەلاّلی ئارەقەبوو وەکو مێژووك دەلەرزی لەشەرمی دایکی، ناچار بەخێرهاتنی لەمیوان کرد، دوای تاشتی بەیانی هەردووکیان دۆش دامابوون. نەیاندەزانی چۆن دەستی پێبکەن.!

: دایکی سمکۆ،پیاڵەو چادانی لە گۆڕێ هەڵگرت ناندینەکەیان ڕوولەخۆرئاوابوو، سەرلەسبەینان سێبەربوو،بە گێسکی دارگەز ئەو ناوەی ماری بەمەسینەیەك ئاو عاردەکەی ڕشاند لبادێکی لەسەر ڕاخست گوتی:

(هەستن وەرنە دەرەوە سێبەرەکەی فێنك و خۆشە لێرە دانیشن)

منیش تا دۆلاّبیان بەرنەداوە، دەچم دوو جەڕە ئاوی فێنك بۆ خواردنەوە دێنم،ئاوی شەوێ مان نەماوە).

: گوریسی لەقوڵپی جەڕەکان هەڵکێشا، بەشێنەیی لە پشتەخۆی هەڵدا ڕۆیی بۆ سەر بیری ئاو. چاوەچاویان بوو کەلەکۆسپەی دەرگا ئاودیوبوو سمکۆ، خۆی هێناوبرد خەریك بوو گرێ کۆرەکە بکاتەوە، بەلاّم خونچە چیتر خۆی پێنەگیرا، مەکربازانە لە سەلای گریانی دا، بەبێدەنگی دەگریا، سمکۆ، بەهەر حاڵی هەبوو هێوری کردەوە دواندی.!

- پێمبڵێ بزانم چیت لێقەوماوە باتێبگەم.؟!

- تازەبەتازە لێم دەپێچیتەوە،

- دەبڵێ بابزانم، خۆمن دەستی خۆم بۆن نەکردووە، چووزانم چیت لێ قەوماوە.!

: خونچە لەسیری هەتا پیوازی هوردووباریك شەڕی شەوا بۆری و بەکوشتدانی عەلۆی بۆگێڕاوە، باسی ئاغای بۆکرد گوتی:

(ئەو بێناموسە نیازی خراپە. مرخی خۆی لێم خۆشکردییە، خەریکە ئابرووم بات، من لەم ترسە ڕام کردووە خۆم لە چنگی قورتارکرد..

: سمکۆ، لەوە پێش چرپەیەکی لەناپاکی خونچە بیستبوو، بۆیە گریانی بەم سەردوولکانە نەدەهات، خونچە پێداچوو گوتی:

سمکۆگیان، خۆم هاوێتە سەر بەختی تۆ، دەستم دامێنت بێ، وەکو جاری پێشوو نائومێدم نەکەی، هەنگێ هەنجەتت عەلۆ بوو عەلۆ لە نێوچوو، وەك عارەب دەخیلت بم دڵم مەشکێنە بەرگەی دڵشکان ناگرم، لەسێبەری خۆت داڵدەم بدە بمحەوێنەوە، ئەگەر تۆ نەمحەوێنیتەوە.؟! ئەو ماڵووسە دەستبەردارم نابێ، لەتۆ بەملاوە کەس ناوێرێ داڵدەم بدات. لەهەرکوێیەك بم وازم لێناهێنێ دەمدۆزێتەوە. بەقوربان، خودا لێت هەڵناگرێ باسەرگەردان نەبم.!

: سمکۆ، مڕدامابوو، زلە پووشکەی لەعەردی وەردەدا، بەئەندێشەی خەیاڵ دا کەوتبوو لەدڵی خۆیدا دەیگوت. (وای لەم ئیشە ناهەموارو نابەجێیە).

: توونە بن پیلی گرت ڕایتەکاند پێی گوت .

(وەختی پووشکە لەعاردی وەردان نییە، تازووە هەستە بەخۆکەوە بادەستی یەکدی بگرین بەلایەکدا سەرهەڵگرین.!

: سمکۆ لەقاران ڕەنگی وەك زەعفەران زەرد هەڵگەڕابوو، نیوچەوانی لۆچی کردبوو. خونچە نیگای بڕیبووە دورچاوی سمکۆ لەناخەوە هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا، گوتی:

- خونچە، من جاری پێشوو لەماڵی پلکە پێناو پێمگوتی: ئەوەی هەنووکە دەیڵێی دەبووایە بەرلەوەی لە عەلۆت ببەستنەوە وات بگوتبا لەگین بوو ڕێی تێدەچوو. لەبیرتە.؟! چەندجار پێمگوتی، تکام لێکردی، خونچەگیان باسەرهەڵگرین، پێ سەرگران بووی. دەتگوت (نەخێر، سەری باب وبراوکەس و کارم شۆڕناکەم) هەنووکە پێتوایەکە ئەم داخوازیەی ئێستات سەربەرزییە، دەبێ بزانی کارێکە لەناو گۆڕدا سەربەمردووەکانت شۆڕدەکەی نا، خونچە، من هەرگیز ئامادەنیم لەلەگەنی عەلۆفرخن وئاغای بەدڕەوشت بخۆم. قەت چاومڕوانی ئەوەم لێمەکە لەژێر سێبەری خۆمدا داڵدەت بدەم. ئەوە لەمن ناوەشێتەوە ئێستاش بۆ هەر شوێنێکی تۆ گەرەکتە بۆی بچی، من ئامادەم یارمەتیت دەدەم، لەگەڵتا دێم تا شوێنی مەبەست.! دواتر ڕابووە سەرپێ گوتی: تاکو دەچم دوو وڵاخ ئامادە دەکەم تۆ بەخۆکەوە تانەو شوێنەی بۆی دەچی لەگەڵت دێم،

: پێڵاوی بەسەر پێی وەکرد، پشتی لەپاشکرد هەنگاوی هەڵگرت بڕوات، خونچە دەمانچەی بەرباخەڵی دەرێناو سواری کرد لێی ئاگردا. سووڕاندی بەسەر پشدا بەربووەوە.

: خونچە، لەجێوە تاسابوو، چاوی ڕشکەوپێشکەی دەکرد تاوێ چاوی خۆی نووقاند، پاشان چاوی هەڵێنا سمکۆ خوێنی لەبەر دەڕۆیی، چۆکی دا لەتەنیشت لاشەی سمکۆ درێژبوو خۆی لەگەڵ جووت کرد، هێشتا گیانی نەسپاردبوو، دەستی بەدەمووچاو کاکۆلی دادەهێنا، دەیگوت: (تەماشای ئەم خوێنە سووروئاڵە چەند جوانە، ئەوەچ خوێنێکە هێندە پاکوخاوێنە، دەبنوو، منیش دەگەڵت دەنووم، بەقوربان ئاخرەکەی هەربووە قسەی من، پێمگوتی: باپێکەوە سەرهەڵگرین، ئێستا خۆشی بێ ترشی بێ پێکەوە بۆ وڵاتی پەریان سەرهەڵدەگرین، ووڵاتی پەریان هێندە دوورە سمکۆگیان کەس دەستی نامانگاتێ، وەکو شەوانی جێ ژووان

لەناندین، لەبیرتەچۆن ئاوێزانی یەکدی دەبووین، هەربەیادی ئەو شەوانەوە شەوانی جێ ژووان وڕامووسان، هەر ئێستێ تاوێکی تر پێکەوە سەفەردەکەین..

: لەم هۆڕێنانەدابوو سمکۆ گیانی سپارد. دواجار دەستی چەپی نایە ژێرسەری سمکۆ بەدەستەکەی دیکەی لوولەی دەمانچەی نایە ناودەمی خۆی چاوی هاوێتە سەریەکدی، بەهێواشی پەلەپیتکەی ڕاگووشی، دواتر پەنجەی بۆشلکرد لە هارژنی دا، مێشکی پرژاند. هەلابەهەلای کرد.

: ئیدی خەڵك وڕووژانە ماڵی سمکۆ، بووە شین وگریەو ڕۆرۆ، دواتر بەبنج و بنەوانی کارەساتەکەوتن گڕی ئاگری عیشق بوو بە خۆڵەمێش و لەجێوە دامرکاوە، لەسەرگردێکی بڵند بەخاکیان سپاردن، لەو ڕۆژەوە ئەو گردە بوو بە گردی (عاشقان) بوویتە جێ نەزەرگەی کورەجحێڵ و کیژوکاڵان بۆ مراز حاسڵ بوون لە ڕۆژانی هەینیدا لە دەوری ئارامگاکانیان ئەڵقەی زیکر دەبەستن.

# (٤٠)

لەگەڵ زەردەپەڕی خۆرئاوابوون گەیی یە شار. وڵاخەکەی بردەخان ئاووئالیکی بۆ دابین کرد، ئەنجا قەستی لۆقنتەی کرد نانی ئێوارەی خوارد پاشان چوو لە میوانخانەی (پاشا) دابەزی. ئەم میوانخانەیە هەرچی بەناو ئاغاوبەگلەرو قوولە کێخوابوو بەمیوانی ڕوویان تێدەکرد، گوایە شوێنی حەوانەوەی پیاو ماقووڵانە، ئەوانەی بەسەفەر دەهاتن بۆ شار. تاکو سێ بەتری شەو ڕادەکشا قوماریان دەکرد. درەنگی شەوان دەستیان لەقومار دەکێشایەوە. دواتر دەکەوتنە گفتوگۆو باسو خواسی دنیا، یەکێکیان گوتی:

- ئەمڕۆبستوومە دەیانگوت: ئەو کۆمەڵە ئافرەتەی گوایە بوونەتە ئەشقیا لەئەشکەوتی دێوان یاخی بوونە. دەسەڵاتی تەواویان بەسەرناوچەکەدا گرتووە دەڵێن: لەشەوی ڕابردوو پەلاماری گوندی زەردەشت ئاوایان داوە دایتیانە بەر دەستڕێژان. یەکێك لە پیاوەکانی ناو ماڵی ئاغایان کووشتووە. لەقسان بۆ کوشتنی زینەڵ ئاغا چووبون. بەڵام بەر چنگیان نەکەوتووە یەکێکی دیکە لێی وەگرتەوە گوتی:

- داخوا زینەڵ ئاغا. چ ڕووتەڵەیەکە، ناوی ئاغای لەخۆناوە ئەمجارەیان قوتاربوو کێوەدەچی قوڕی بەسەر جارێکی دیکە هەر دەیکوژن.

: زینەڵ ئاغا هەستی لەخۆی بڕی بوو، گوێ قوڵاغی قسەکانیان بوو لە حەژمەتان کەفەزگ ببوو. لەدڵەوە بەگومان کەوتبوو.!

(تۆ بڵێی دوێنێ شەوی ڕابردوو ئەو ئافرەتە بەستۆکانەبن دەستی خۆیان بەپێش دەستی هەیاسە شەل خستبێت وزەبری خۆیان لێمان وەشاندبێ.نا،

هەرگیز بڕواناکەم ئەو کەلێنە کەرخی هەیاسەشەل و یاوەرەکانیەتی با.. بۆنا، ئەی هەر ئەو دەلیسانە نەبوون لەناو ماڵی من ئەو پیرەژنە بەدکارە، پوورەسێوەیان دزی. کەسیش پێنەحەسیا) کابرا هێشتا بەردەوام بوو لە قسەکردن.! بیستم دەڵێن هەردوو ژنە گچکەکەی ئاغا، لێی هەڵگەڕاونەتەوە تفەنگیان کردووتە شان بوونەتە ئەشقیا، وان لە ئەشکەوتی دێوان.

- باشە ژنەکانی خۆی بۆ لێی هەڵگەڕاونەتەوە.؟!

- من چووزانم دەڵێن ئاغا تەمەنی پیرەمەرێکی کەترەی وەبەر ماوە،خاوەنی چوار ژنانە لەقسان چاو لەدەرو مۆزەمۆزیش دەکات.

- جوانە،بزنە گەلی ڕاگرتووە. هەرهەموویان لەقاقای پێکەنینیاندا.

- وەڵڵاَبرا. من قەت بەم جۆرە پیاوەناڵێم پیاو. پیاوێك ژنی بن چۆکی خۆی لێی هەڵگەڕێتەوە. دەست داتە تفەنگ، چۆن چاوو ڕووی مەجلیسی پیاوانی دەبێ؟!.

: ئاغا لەحەژمەتان باریکە ژانێك برووسك ئاسای دایە هەناوی چیوەی نەمابوو بەندی جگەری بپسێنێ. دەستی بەهەناوی خۆی وەگرت هەستاوە سەرپێ. بەهێواشی بۆ ژووری خەوتن خشی، خۆی هاوێتە سەرچوارپایەو لەسەر چاو لێکەوت.

: هێشتا مابوو بۆ بانگی نوێژی بەیانی لەخەونیدا لەجێی جۆخینان بوو، دیتی هاوڕێ غوربەت سواری ئەسپەشێ بووە ڕاست وچەپ دوو ڕێز خەریتەی لەخۆی بەستاوە. تفەنگێکی برنۆی کردووتە شانی نووگی گوولە ناخوات. کۆمەڵێك چەکداری ئەسپ سوار دەورەیان داوە، قامچییەکی بەدەستەوە گرتووە، هەرچەندجاری قامچی دەخێواندە لاقوونی یەك ڕاوییە ئاوی پێ هەڵدەگرت. ناوەناوە لغاوی ئەسپەشێی توونە دەکردەئەسپی تایین هەڵدەستاوە سەر پاشیان،

هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە گەرەکی بوو بەچەپۆکان بیتوڵخێنێتەوە، لەترسان بەپشدا کەوتبووە سەر عاردی، وەکو پشیلە چنگی قژکردبۆوە دەیمیاواند ودەگەوزی نەبادا بکەوێتە بەر چەپۆکی ئەسپەشێ. دەگەڵ گەوزدان زرپەی لێوەهات لەسەر چوارپایە کەوتە خوارەوە بەئاگاهات. داتڵەکابوو،وەکو شەنگەبی ناو ڕووبار گشت گیانی دەلەرزی. لەبەرەخۆی بڵماندی:!

(پەکوو. چ خەونێکی ناخۆش بوو یارەبی خودایە جوانەگایەك نەزربێ ئەم خەونە بەخێر بگێڕی)

: چێشتەنگاو خۆی گەیاندە فەرمانداری ناوچە،هووردو باریك لەسیری هەتا پیوازی، هەرچی هەبوو کارەساتی پێرێ شەوی بۆ گێڕاوە گوتی:

(جەنابی فەرماندار، پێرێ شەو پتر لە بیست ئەسپ سواری چەکدار، بەنیازبوون لەهەموولایەکی گوندی بەمەبەستی تالأنکردن گەمارۆمان بدەن. لێیان هاتینە دەست،لەدەستوەکەریەکی دلێرانەی خەڵکی گوندی زەردەشت ئاوا بەرپەرچیان دانەوە. نەمانهێشت پێ باوێنە ناو گوندی. دووره تەقەقەبوو نەشیان بێنە پێش، عەلۆی نۆکەر هێندە لەمن بەدوور نەبوو. تەقەی لێیان دەکرد. هەر هێندە ئاگاداربووم هاواری لێ هەستا گوتی: (ئاغا من کوژرام تۆ ئاگاداری خۆت بە) داخی گرانم کە چوومە سەری گیانی سپاردبوو، لەحەژمەتان بەرچاوم تاریك بوو، هۆشم لانەما. دەستم بەچاوی خۆمەوە نا دامگرتن. خۆیان ڕانەگرت هەڵمقەناندن. پشتیان دا هەلأتن فەرماندە لێی پرسی؟

- باشە ئەوانەی هاتبوونە سەرتان دەستەی کێ بوون؟

- قوربان، ئافرەتانی یاخی بوو بوون، دەستەی غوربەتبوون،

- ئاا.. دەستەی غوربەت، وادیارە شووڵیان لێ هەڵکێشاوە.ها.؟!

- بەڵێ.قوربان. ئێمە گوتمان زەعیفەن بالەگەڵیان لەسەرخۆبین، تاکو بەهۆش

دێنەوە پاشان دەگەڕێنەو سەرماڵ وحاڵی خۆیان. بەلاّم نەخێر، لەتامیان بردەدەر، هەر بۆیە بەپەلە هاتم بۆلای جەنابتان. بەڵکو فۆشەنیان بۆبکەن دەستگیریان بکەن، دواتر سەریان بتراشن بەتایبەتی غوربەت، چونکی ئەم شەڕو ئاشووب و کوشت و بڕە هەمووی لەسەر سمتی ئەوە. ئەگەر ئەم دێڵە سەگە حاجی حەمەبۆری نەکوشتبایە.؟! ئێمە خەڵکی زەردەشت ئاوا هیچ پەکوبەلاّمان نەبوو. بیگرن سەری بتراشن. ئەوجایەك مەنجەڵ ماستی بەسەر دابکەن. هەردوودەستی لەپشتەوە شەتەك بدەن. پشتاوپشت سواری نێرەکەرێکی بکەن. بەکووچەو کۆلاّن وشەقامی شاردا بیگێڕن. باخەڵك تفو نەعلەتی لێبکەن. ئەدی قوربان، ئەگەر بەم شێوەیە ڕیسوا نەکرێ؟! هەرچی ژنو کچەعازەبی ئەم ولاّتەیە لەمێردیان هەڵدەگەڕێنەوە. فەرماندار حیسابی خۆی کردبوو. لەخۆشیان بزەی سمێڵی دەهات، پێی گوت:

- ئاغا خاترجەم بە لەم ڕۆژانە هەموو شتێك بەکۆتادێ، بەخواست و دڵی تۆ دەبی. ئەوە خەمی تۆ نییە خەمی ئێمەیە، ئێمە بەکاری خۆمانی دەزانین، پەکناکەوێ. تۆ بگەڕێوە بڕۆ بۆ ئاوایی. پاشان خۆم دێم بۆ لاتان. هەروەکو پێمگوتی: پاشان دووقسانی لێدەکەین.باشە.!!

- بەڵێ قوربان. هەرکاتێك تەشریفتان هێنا، بچووکی خۆت لەخزمەتی جەنابتان ئامادەیە، ئیدی دووعابوونی خواست دەرچووە دەرەوە. بەسواری ولاّخ چەورەی لێکرد بەرەو گوندی زەردەشت ئاوا تێی تەقاند ڕۆیی.

# (٤١)

باشچاوەش قەدۆ، پەنجا هەیتەی سواری بەدواوە بوو بەرەو گوندی زەردەشت ئاوا بەڕێ کەوتن. تۆز بەری عاسمانی گرتبوو، قۆناغ بەقۆناغ پێداچوون، دواقۆناغ گوندی زەردەشت ئاوا بوو زینەڵ ئاغا دوو شەکە نێری لەعاردی دابوو کووشتبیانەوە کردبوویانە بەربەسێری، ئاغا وەکو قەرەواش بەخۆی لەخزمەت دابوو دەهاتوودەچوو بەردەستی دەکردن،دوای نان خواردن ئەنجاچوو شان بەشانی باشچاوەش قەدۆ ڕوونیشت، دەستی پێکرد.

- قوربان دەبێ زۆر وریای خۆتان بن، ئەو غوربەتە بەفرت و فێڵە، فێڵبازێکی ئەوهایە بەزیندوویی ڕێوی کەوڵ دەکات. دەرسی لەشەیتان وەرگرتووە قەت تێناکەوێ، وەك هەڵۆ نیشتبووە سەر ڕەحمان کەلۆس، خۆت کەلۆست دەناسی لە فێڵبازیدا دەرسی بەشەیتان دەدا، ئەوجا بواری پێنەدابوو تەنانەت تفەنگی لەشانی کاتەوە، چەتوونێکە بای لەهەموو چەتەکان بڕیوە، چمە هەرچی چەتەی لەم کێوانەیە دەیوێرنێ.؟! نەخێر نایوێرنێ، هیچ کامێکیان تاساناکەن بەرێرەویش بەئاقاری ئەواندا ڕابوورن، باڵندە بەعاسمانی ئەشکەوتی دێوان دا بفڕی فڕینانەی لیوەردەگرن، هەرهەموو تفەنگ بەدەستن، کامە ئەسپی چاك ومایینی ڕەسەنە والەئەشکەوتی دێوان تەوردراوە، بیستوومە دەڵێن: وەکو لەشکری نیزامی گرووپ کرووپ دابەشبوونە، هەرگرووپەوشوێن وکاری تایبەت بەخۆی هەیە، سەنگەری سەخت و قایمیان دروستکردووە کاتێ کە گوندییەکان لەشکریان بۆ کردن، سوێند دەخۆن دەگێڕنەوە دەڵێن: (کەسمان بەچاوی خۆمان نەدیت، هەرگوللەبوو لەهەموو لایەك وەکو تەزرە بەسەرماندا دەباری، نەماندەزانی

لوولەی تفەنگمان ئاراستەی کام لابکەین. کەسێکمان لێدیار نەبوو، شەڕ لەگەڵ چیابوو، ناچار پشتمان دا حێرتە حێرتە گەڕاینەوە).
: باشچاوەش قەدۆ، گاڵتەی بەم قسەلۆکانە دەهات. بۆیە هەرئەوەندەی گوت.!
(شەو درەنگە ماندووم بابیکەیەنە شەو، سبەینێ بەچاوی خۆت دەبینی ئەو غوربەتەی کەتۆ باسی دەکەی، بەقەرپوسی زینەوە بۆت ڕستی دەکەم. ئەسپ و ماین و تفاقی هەرچی هەیانە لای خۆت گلدەوە، بەخاوەنیان بکەبپاشان خۆم لێیان دەپێچمەوە). ئیدی هەستان کردیانە شەو.

# (٤٢)

هاوڕێ غوربەت بانگهێشتی سەردەستەی گرووپەکانی کرد لەگەڵیاندا کۆبووە گوتی:

(هەڵبەتە بیستوتانە کە باشچاوەش قەدۆ. بەخۆی وپەنجا چەکدار هاتووە والەگوندی زەردەشت ئاوا قۆناغی گرتووە، بێگومان ناودەنگی ئەو مرۆیەو بیستووە. چەند زاڵم وچیڕەدرێژە، هەرچی چەتەی بەم کێوانەوەن کە گوێیان لەناوی ئەم پیاوە دەبێ، لەترسان چوڕەمیزە دەگرن. هەموو ئەو چەتانە سەرانەی بۆ دەنێرن، ئەگەرنا، بەپشتیوانی هێزی دەوڵەت ئەم کێوانەیان بەسەردا دەڕمێنێ، یان بەدەستی یەکدی لەناویان دەبات. بەڵام ئەوەی من بزانم ئەو بەدەستی خۆی نییە دەست لەدەستی چەتەو ئەشقیا هەڵدەدات، بەخۆی چاك دەزانێ هەموو کونێك وەکویەك نییەئەو بەناسانی دەستی تێڕابکات، بیستوومە دەڵێن: دین و ئیمانی پارەو ئافرەتە، گوێی لە زرەی پارەبێ گوێ بەردەداتەوە، دیلی ئافرەتە، چۆن داڵدەی چەتەکانی داوەئەگەر ئێمەش دەمی چەور بکەین.؟!

بێگومان داڵدەی ئێمەش دەدات، بەڵام سەبارەت بەئێمە زەحمەتە تەنها بەدەم چەوکردن وازمان لێبێنێ چونکی جگی مێرە، بێگومان زێدەڕۆیی دەکات.

پاشان پەیمان هاتەگۆ گوتی:

- هەرچی پیاوە پێیوایە کە خوداوەند مرۆڤی (مێینە)ی بۆیە دروستکردووە وەکو کۆیلە لەخزمەت پیاودابێ، بۆ دامرکاندنەوەی حەزونارەزووەکانی و هیچی تر.! دڵبەر لێی وەرگرتەوە گوتی:

- چێوەی کێشەکە ئەم نایەکسانی و گومڕایی و هەست ونەستی پیاوانە، ئەگەرنا. ئێمە چدەکەین لەم شاخ وکێوانە. لە ئێستا گونجاوترنییە، باهەموومان بەڵێن تازە بکەینەوەنەك باشچاوەش قەدۆو پەنجا هەیتەی چەکدار، ئەگەر هێزی سوپای نیزامی لەشکرمان بۆبکەن، بەرەنگاریان دەبینەوە تا ئەوکاتەی ئەشکەوتی دێوان دەبێتە گۆمی خوێن. هاوڕێ غوربەت گوتی:

- سەخڵەت مەبن، نەخشە و پیلانێکی وام بۆیان داڕشتووە، لە ڕەحمان کەلۆس خرابتریان بەسەردێنین دواتر هاوڕێ غوربەت دەستی خۆی ڕاگرت گوتی: بەلێن بێ تا دوا تنۆکەی خوێن بەرگری لە ماف و کەرامەتی خۆمان بکەم پاشان هەر هەموویان دەستیان دانا سەردەستی غوربەت، بەدەستە جەمعی بەڵێنیان بۆ یەکدی تازەکردەوە. دواجار غوربەت گوتی: (بڕۆنەوە بۆلای جەنگاوەروکان لەسەنگەر پێیان بڵێن: ئامادەباشی خۆیان وەگرن، بۆ هەرلێقەمانێکی کتوپڕ ورەیان بەرز بێ، تەفروتونایان دەکەین) غوربەت، هەرچەندی دەیکردو دەکۆشا خەو لەچاوی زڕابوو خەوی لێنەدەکەوت، خەمی ئەوەی بوو.!چۆن تاکو ئێستا دەستێکی لەزینەڵ ئاغا نەوەشاندووە. دەیگوت (ئەگەر ئەو گەمبۆرە نەبووایە.؟! باوکم قەت ڕازی نەدەبوو بمداتە ئەو گەماڵە بۆرەی گۆڕبەگۆڕە، چونکی باوکم خۆشی بەچەهرەی ئەو پیرە سەگە نەدەهات، لەناچاری بوو،چوونکە بۆ هەر گوندەکی دیکە بارگەی تێکنابایە، زینەڵ ئاغایەکی دیکە دەسەلأتدارە.. ئێستاش نۆبەتی باشچاوەش قەدۆیە، شەرت بێ لە شەڕوبەلأی باشچاوەش قەدۆ دەستم بەربێ، دەبێ کارێکی ئەوهای پێبکەم، سوورانەی کچانی گوندی لەقوڕگی بێنمەوە، دەبێ بۆ شاران تڕۆی بکەم خاکی زەردەشت ئاوای لێ ببێتە حەسرەت).

: پوورە سێوە بێدار بوو، ئاگادار بوو غوربەت لە چ حاڵدایە، هەر لەجێوە لەناو پێخەف نیوەڕاست بۆوە گوتی:

- کیژم غوربەت، شەو درەنگە تاوێ چاوی خۆت گەرم بکە باگیانت ئاسوودە بێ، نەبادا بەیانی ئەم سەگسارە پەلامارمان بدات،

- باشە پووریێ هەوڵدەدەم چاوم گەرم کەم، بەڵام دڵنیابە نەخشەو پیلانم بۆی کێشاوە، هەرگیز ناتوانێ زەفەرمان پێ ببات پۆزی دەشکێنم، وابێ جارێکی دیکە تاسانەکات ڕووبکاتەوە ئەم ناوە،

- کیژم ئەو تەرەسە پیاوێکی تووشو بەگێچەڵە. حەزناکەم داوی خۆت لەداوی ئەو بێ مروەتە گرێ بدەی، شتێك بەماڵی دنیا پێکبێ هەرزانە، ماڵی دنیا چڵکی دەستە، دەمی چەورکەباوەکو ئاژەڵ لچ بێ، کەلچ بوو، خۆی سکتر دەبێ.!

- نا پۆرێ ناتوانم دەمی چەور بکەم فێردەبێ کە فێربوو وازمان لێناهێنێ بەدوایدا دێتەوە، هەراسانمان دەکات، خۆ ئێمە چەتەو ڕێگرنین سەرانەی بدەینێ، خەمت نەبێ پووریێ هەر خۆم دەزانم کوو پەڵبەستی دەکەم دوای ئەم قسانە چراکەی کز کرد گوتی:

(پووریێ بابیکەینە شەو، سبەینێ تێت دەگەینم چمان بۆ دەکەی)

# (٤٣)

بۆنی بەربەسێری دەماردەمار دەڕۆیی. مەلابۆنی چەوری کردبوو، دەیزانی بۆ هۆدانەوەی قسان بەبێ ئەو، نان ناخوات بانگهێشتی دەکات. بەپەلە دوو (ڕکات) نوێژی بەیانی کرد، هیچ نەبوو، سێ چوار (ڕکات) نوێژی بۆ ڕەحمەتی باوکی کرد، پەنجا ساڵ بەر لەو ڕۆژە سەری نابووەوە، هیچ نەبوو. بۆنی بەربەسێری بەسەریدا زاڵ بوو، چیتر خۆی پێ نەگیرا. هەستا ڕۆیی چوو بەدیار مەقەرەی ئاگرو مەسینەی قاوە چوار چمکی لەدیوەخان دانیشت، هێدی هێدی قاوەی فڕدەکرد، چاوەڕوان بوو کەی فەرمووی لێدەکەن. سۆزگ بوو هەتا ئاغاو جەنابی قەدۆ بەکاوەخۆ لەخەوە ڕابوون. ئیدی هەرسێکیان قاوەڵتیان کرد، هەریەکەو دوو پیاڵە چای خەستیان لەسەرکرد. پاشان باشچاوەش قەدۆ بەنەرمە کۆخە قوڕگی خۆی خاوێن کردەوە گوتی:

- مامۆستا، کاری دەوڵەت بەگشتی فەرمانە، ئەگەربە پێی فەرمان نەجوڵێیتەوە بەخراپە بەسەرتدا دەشکێتەوە، لەوانەیە خەڵك وا تێبگەن کە من بە خوایشتی خۆم هاتووم دەچمە گژ ئەو زەعیفانەی وان لە ئەشکەوتی دێوان. بڕواتان بێ لەوەتەی ئەم کارەم پێ سپێردراوە شەوی ڕابردوو بەتایبەتی هەرچەندی بیری لێدەکەمەوە،

لەشەرمان بەخۆدادەچمەوە، بەلامەوە شەرمە لەپاشەملە بڵێن: باشچاوەش قەدۆ لەگەڵ ژنان تێکەوتووەئەوە چەندی بەچەند، ئەسڵەن نەنگییە بۆ من، بەلأم دەڵێی چی فەرمانە، فەرمانی دەوڵەت دەبێ جێ بەجێ بکرێ، ئێستا چوونکی ئەوانەزەعیفەن بەهەڵەدا کەوتوون، ئەگەر خۆ بواردنیش بێ لەفەرمانی

دەوڵەت. حەزدەکەم بەرلەوەی کارلەکار بترازێ، ئاگاداریان بکەینەوە.بەوەی کە بێ قەیدوشەرت بگەڕێنەوە بۆ سەر ماڵ و عەیالی خۆیان، وەچەکەکانیان بە ئێمە بسپێرن. بەو مەرجەی هەرکەسێك پەنجەی بۆیان درێژبکات پەنجەی ببڕنەوە.. بۆ ئەم مەبەستە پێویستمان بە دوو ئافرەتی لەخۆگەڕاوەیە بچن بۆ ئەشکەوتی دێوان بەزمانی من ئەو سەرلێشێوانە ئاگادار بکەنەوە. تێیانگەیەنن کە من سستیم کردووە لە جێبەجێکردنی فەرمانی میریی بەوەی کە نەدەبوایە ئاگاداریان بکەمەوە، دەبووایە قەتل وعامیان بکەم جا لەم ڕوانگەوە حەزدەکەم دایك مەلاژن و یەکێکی دیکە، ئێوە دەست نیشانی بکەن.بابەم کارە هەڵسن بۆئەم ڕاسپاردەیە.

: سەیری ئەم سێبەگاییەکەن.! هەرچی باشچاوەش قەدۆ بوو، مرخی خۆی لە هاوڕێ غوربەت خۆشکردبوو، لەلایەکی دیکەوە بیستبووی غوربەت چ سەروەت و سامانێکی کۆکردۆتەوە. گەرەکی بوو بەبەردێك دووکێلان بپەرێنێ، بەچاوو ڕاو ئاشبەتاڵیان پێبکات. دەست بەسەر ماڵ و سەروەتیان دابگری. هاوڕێ غوربەتیش بکاتە کەیبانووی ماڵ وە لەدڵی خۆی لێکی دابۆوە ئەگەر ڕازی نەبوون پەلاماریان بدات، ئەوسا هەرخۆی دەزانی چیان بەسەر دێنێ، بۆیە بەئەنقەست ئەم پرسە خەسووانەی بە مەلا کرد، تاکو پاشە ملە کەس بەخراپە ئەلفازی نەگەڕێ بلێ لەل.

: بەڵام هەرچی هاوڕێ غوربەت بوو. دەیزانی باشچاوەش قەدۆ بەهەوەنتە دەستبەردار نابێ، نەخشەوپیلانی بۆ کێشابوو، گوتبووی یان کاڵ دێنێ یان پەمۆ بەڵام هەرچی مەلا بوو بیری لەقسەیەکی وادەکردەوە وابێ بە دڵی هەردووکیان بێ. لەوەڵامدا گوتی:

- جەنابی قەدۆ ئاغا، قەیدی چییە بادایك مەلاژن و یەکێکی دیکە بچن بۆ ئەشکەوتی دێوان. هەرچی فەرموودەی جەنابتانە پێیان ڕابگەیەنن. بەڵام ئەوەش

بزانە کە ئەو سەلیتانە ئاوی بێ لغاویان خواردووتەوە، پێموایە کە هەرگیز نایەنەژێربار، فێری بەرەڵڵای بوونە، تازە لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان دانانیشن، چونکی دەرسیان لەشەیتان وەرگرتووە، زەحمەتە گوێ لە ئامۆژگاری بگرن، بەڵام ئامۆژگاری کارێکی ڕەوایە. قەیدی چییە. بنێرە بابچن ئامۆژگاریان بکەن.

: بەڵام هەرچی زینەڵ ئاغا بوو بەئەندێشەی خەیاڵدا چووبوو. دەستی لەبنی هەنبانەی دامابوو، بەتەمای خونچە بوو، خونچەش بووبەخەون بۆیە لەدڵی خۆیدا دەیگوت(ئەگەر بەلقیس و نازڵی). لەگەڵ عامێ بۆم بێنەوە خراپ نییە.

: لەم خەیاڵانەدابوو. باشچاوەش قەدۆ لێی پرسی؟

- کێ، لەگەڵ دایک مەلاژن بنێرین بۆ ئەشکەوتی دێوان.؟!

- ئێستا دەنێرم بە شوێن دایکی غوربەت. بالەگەڵ دایک مەلاژن پێکەوە بڕۆن بۆ ئەشکەوتی دێوان لەسیری هەتا پیازی هەرچی هەیە پێیان ڕابگەیەنن، بۆیە دایکی غوربەت دەنێرم. چونکە سەری هێران وبنی گەولان بەتەنها غوربەت خۆیەتی. کەچی لەم بڕوایەدام کە هەرگیز بەزمیی بەکرووزانەوەی دایکی نایەت چونکە زۆر کەللە ڕەقە...

: باشچاوەش قەدۆ، تووڕەبوو قسەی پێ بڕی گوتی:

(کەللە ڕەق و مەللە ڕەق نازانم. لێی ناپاڕێمەوە، ئەگەر شاخ بێ.؟! دەیتاوێنمەوە شەقڵی دەشکێنم بەڵام دەڵێم مێینەیە بابەویژدان لەگەڵی بجوڵێمەوە بەڵکوو دێتە ڕایێ..هەر ئێستا دوو وڵاخی بەرزمیان بۆ ئامادەکەن تاکوو زووە بابەڕێ کەون. هەموو دووقسەیە، ئا.. یان نا.؟! هیچی تر بابگەڕێنەوە)

کە پوورە سێوەو غوربەت قاوەڵتییان کرد .. دواتر غوربەت گوتی:

- پۆرێ لەوانەیە ئەمرۆ سبەی باشچاوەش قەدۆ هەڵدەکوتیتە سەرمان، جاهەرکاتێ زانیمان بەرەو ئێرەهات، تۆ، برۆ بەرایی لێبگرە هەرچۆنی خۆت دەزانی بیدوێنی بیدوێنە، پێی بڵێ:

غوربەت دەیەوێ بتبینی، داوای گفتوگۆ دەکات دەبێ دەستخەرۆی دەی، فریوی بدە،بەزمانی خۆش هەڵیخەڵەتێنە، من دەزانم(ئەو) ئاواتەخوازە چاوی بەمن بکەوێ.بۆیە سوورِ دەزانم سارد دەبێتەوە دێتە ژێربار، کە ڕازی بوو شوێنی گفتوگۆی بۆ دیاری بکە، هانی بدە بەڵکو ڕژدەبێ. پێی بڵێ:

تەنیا من لەگەڵ غوربەت دێم، چونکی غوربەت حەزناکات کەس تێمان بگات. کە هات لەوەبەدوا خەمی منە، خۆم دەزانم چۆن لەگەڵی یەکلادەکەمەوە.

- باشە کچم، پەکناکەوێ من دەچمە بەرایی هێوریشی دەکەمەوە وایلێدەکەم بێ، بەلاّم تۆ ناترسێی لەوەی کە کابرایەکی فێڵبازە، نەبادا فێڵی بن فێلاّنت لێبکات.؟!

- نا پوورێ، تەڵەم بۆی ئامادە کردووە، هەر هێندە زەحمەتە تاکو دەگاتە شوێنی مەبەست. هەنگی خۆم دەزانم، چۆن.،؟! دەیخەمە ناو تەڵە. ئەو بەبۆنی کەباب دێ چووزانێ کەرداخکردنە.

# (٤٤)

ڕۆژی پاشی خۆر بەئاسمانەوە بوو، لەسەنگەرەکانی پێشەوە ئافرەتانی یاخی بوو چاوەدێری ڕێگاوبانیان دەکرد، دیقەتیان دا. دووسوار بەبنی گەلیدا بەلەقەلەق دەهاتن لەسەر پشتی وڵاخ دەهەژانەوە. درەخشان گوتی:

- عەیشان، چاوبدەنە گەلی، دووسوار بەرەو ئێرەوە بەڕێوەن، پێموایە هەردووکیان ئافرەتن، لەوانەیە هاتوون پەیوەندیمان پێوەبکەن ها.؟!

: عەیشان تاوێ سێرەی لێگرتن گوتی:

- مسۆگەر هەردوکیان ئافرەتن زۆر شل و خاوو لەسەرەخۆن بەسەرپشتی وڵاخەکان دەهەژێنەوە، بۆیە وڵاخەکان بەخوایشتی خۆیان ڕێدەکەن. سەیرکە!چۆن ناوەناوە دەسەنگرێنەوە لموز لە پووش وپەلاشی دەم ڕێگا هەڵدەدەن (پەراغ)ەکەی لێدەگرن دەیخۆن. ئەوە نیشانەی کەنەفت و بێ هێزی سوارەکانە. بۆیە پێموانییە ئەوانە بەم نیازە وەهاتبن بێنە ڕیزی جەنگاوەران لە ئەشکەوتی دێوان .

- کەواتە بابۆیان شۆڕبینەوە بەراییان لێبگرین بزانین کێن.؟ چکارەن.؟!

لەناوەڕاستی گەلی خۆیان بۆ مەلاس دان لێیان بێدەنگبوون تاکو بەلەقەلەق نزیکبونەوە. عەیشان گوتی:

- کچێ بابان کۆر یەکیان پوورە (ئەستێ)ی دایکی غوربەتە، ئەوەی دیکە پوورە(زارا)ی هاوسەری مەلای گوندی زەردەشت ئاوایە.. نەکەی بیانترسێنی ئەوانە میوانی ئازیزن، لەوانەیە وەکوڕاسپاردە بۆ کاری پێویست هاتوون، هەستە بابەپیریانەوە بچین پێشوازییان لێبکەین.

: لەهیکرِا لەپێشیان ڤیتبوونەوە، ولآخەکان سەنگرانەوە.

هەردووکیان لە سەرپشتی ولآخ ڕاچڵەکین ترسان، لەترسان دەمیان بووە تەڵەی تەقی. عەیشان زوو دەمامکی ڕووی کردەوە خۆی ئاشکراکرد، بێنیان ومبەرهاتەوە، لەسەرپشتی ولآخ دایانبەزاندن. هەرچواریان یەکدیان لەباوەشگرت تاوێ پێکەوە هەژانەوە. پاشان دانیشتن دوای حەسانەوەو پشودان. هەواڵ پرسینی کەسوکارو خەڵکی گوندی پوورە ئەستی گوتی:

- کچم عەیشان، ئێمە بەپەلەین. هەندێك ڕاسپاردەی سەرزارەکیمان پێ سپێردراوە، دەبێ بەغوربەتی ڕابگەیەنین دەبێ هەر ئەمڕۆش بگەڕێنەوە.

- باشە پوورێ، هەر ئێستا بەڕێدەکەوین.

هەردووکیان سواری ولآخەکان کردنەوە، هەوساری ولآخەکانیان بەدەستەوە گرت، یاغر یاغر بەهەورازدا کێلبونەوە. نیوڕان لەکەلی کەوتبوو، هاوڕێ غوربەت لەژووری ئەشکەوت خەریکی فراڤین بوو، کاتێ گوێی لەدەنگی درەخشان بوو.! (هاوڕێ غوربەت.. هۆۆ هاوڕێ غوربەت، وەرە دەرەوە بزانە کێ و کێ هاتوونەتە سەردانت).

: غوربەت بەهەشتاوی هاتەدەرەوە کە چاوی بەدایکی کەوت، لەخۆشیان خەریك بوو باڵ بگرێ، بەغاردان بەپیریانەوە چوو، لەسەرپشتی ولآخ هامێزی لەدایکی وەرێنا عەیشانیش بەهەمان شێوە هامێزی لە پوورە (زارا) وەرێنا دایانبەزاندن. غوربەت خۆی بەباوەشی دایکی ڤرساندبوو دەگریا، پوورەسێوە لێی هاتە دەنگ پێ گوت: (غوربەت، من پێموابوو کەبەخەنجەران گێرەت لەسەربکەن ناڵێی ئۆف. ئەم گریانەی تۆ وورەی جەنگاوەران دادەبەزێنێ.. هۆشت بێنەوە سەرەخۆت. ئێستا کاتی گریان نییە، ئەوە پوورە زارا دەمێکە بەدیارتانەوە ڕاوەستاوە چاوەڕوانی تۆیە.میوانی تۆیە،چمە ئەوها پێشوازی لەمیوان دەکەی.!

: غوربەت بەنێو لەپ ئەشکی لەدەموچاوی خۆی سترپەوە و چوو دەستی پوورە زارای ماچ کرد و بەخێرهاتنی کرد، دواتر فەرمووی لێکردن گوتی(بابچینە ژووری ئەشکەوت) ژەمبووردەبوون. بەدرەنگەوە نانی نێوڕۆیان خوارد. دواتر پوورە زارا گوتی:

- کیژی خۆم غوربەت، من و دایکت بەقسەی باشچاوەش قەدۆو ئاغا هاتووین، باشچاوش قەدۆ،پەنجا پۆلیسی سوارەی لەگەڵ دایە، وا لەزەردەشت ئاوا قۆناغی گرتووە، بەقسەی خۆی ئەو بەفەرمانی دەوڵەت هاتووە، بۆیە هاتووە قەتڵو عامتان بکات، گوتی پێیان بڵێن: من ویژدانم ڕێگام پێنادات قەتڵو عامیان بکەم. لەلایەکی دیکەوە زۆرم شەرم بەخۆمە بڵێن، باشچاوش قەدۆ لەگەڵ ژنان بەشەڕدا کەوتووە، ئەوەلە شەقلو هەیبەتی من ناوەشێتەوە، گوتی: بالەسەر شەرەڤ من چەك دانێن ئاشبەتاڵی لێبکەن. هەرکەسە بچێتەوە سەرماڵو حاڵی خۆی بەمەرجێك.؟! کەس نەتوانی لە گوڵ گرانتریان پێبڵێ. بەلاّم هەرچی سەروەت وسامانی بەکاری چەتەیی وڕێگری لەدێوەرەو ڕێبوارو ڕەشماڵ نشینانیان ستاندووە هەر هەمووی دەبێتەموڵکی دەوڵەت ودەچێتەخەزێنەی میریی. دواتر دایکی غوربەت گوتی:

- کچم غوربەت، ئاغا گوتی پێیان بڵێ: ئەوە لەشکری بێسەروبەری گوندییان نییە، دوو دەست ڕێژیان لێبکەن پەرتەی لێبکەن، هەر بزانم خۆبادەن یان پێگیری بکەن. چ لەسبەێنێ زووتر نییە، بەکەزی خۆیان دوو دوو جەلەیان دەکەم. دواتر بۆشار ڕاپێچیان دەکەم دەبێ لەزیندان ڕەزیل و سەفیل بن ئەوسا پەشیمانی دادیان نادات.

: پوورە زارا لێی وەرگرتەوە گوتی:

- کیژم بەتەمای چی.؟! لەگەلی شەیتان وەرە خوارەوە خۆت مەکە سەری سەبەبان، ئەم هەموو نازدارە بەکوشت دەدەی. شەڕی دەوڵەت بەنێوە ناکرێ، کیژم خۆت مەکە نێچیرویەخسیری بن دەستی ئەو نامەردە فیرسیچمە،وەکو (زێلۆ) پێت وەدەنوسێ تاخوێنی بەدەنت چك نەکات وازت لێناهێنی.

: هاوڕێ غوربەت، دارۆچکەی لەعاردی وەردەدا، بەم قسانە قوشقی نەبوو، ئارام و لەسەرەخۆ بوو. دواتر ڕابووە سەرپێ گوتی:

- پوورە زارا، دایەگیان، سوپاسی هەست و سۆزو پەرۆشی و ماندوو بونتان دەکەم. کە گەڕانەوە بەزمانی من بە باشچاوەش قەدۆ بڵێن:

شەڕی ئێمە لەگەڵ دەوڵەت نییە، بەنیازیش نین ڕۆژێ لە ڕۆژان بەرانبەر دەوڵەت بجەنگین. ئەگەر کاربەدەستانی وەکو باشچاوەش قەدۆ، لەتوانایان دابێ نێڵن کەس غەدرمان لێبکات، وەکو مرۆڤ بەحورمەتەوە بژین، واز لەکاری تووندو تیژی بێنن، ئێمە چدەکەین لەم چیاوچۆڵەوانییە، چمە ژیان هێندە خۆشە لەچیاوچۆڵان تاکو دەستمان لێبەرنەبێ، خۆمن بڕوام بەگفتەکانی هەیە، بەلاّم پێش وەخت حەزدەکەم چاوم پێی بکەوێ، دوو قۆڵی دانیشین تاکو بەچاکی لێکدی حاڵی بین. نەبادا لە دوا ڕۆژ دووچاری گیروگرفت بین، پێی بڵێن: سبەینێ بانەو تەشریف بێنێ، من لەگەڵ پوورەسێوە لەناوەڕاستی گەلی دا بەبێ چەك لەچاوەڕوانی دا دەبین، هەرکاتێك هاتن باچەکدارەکان لەزارکی گەلی ئارام بگرن. پاشان بەخۆی و یەکێك لەو پیاوانەی کەخۆی پشتی پێی قایمە و جێ بڕوایەتی، کەرەمکەن پێشوازیان لێدەکەم، وەئەگەر بەگومانەو تا ساناکات بێ سبەینێ تاکو ئەوان دێن، من پوورە سێوە دەنێرم با لەزارکی گەلی چاوەڕوان بی هەروەکو گوتم، ئەگەر هەر بەگومانە، بە پوورە سێوەئاگادارم بکاتەوە، سێ،چوار، لەهاوڕیانم وەك بارمتە بۆی دەنێرم بالای پۆلیسەکان دەست بەسەر بن. بزانین کار بەچی دەگات.

دایە، پوورە زارێ، ئێوەش بێ خەم بن، مرۆ چی لەچارەی دا نووسرابێ هەرئەوەیە، ئێشتاش کات وەبەری نەماوە درەنگە، نەبادی بکەونە بەر تاریکی بەخۆکەون بگەرێنەوە. هیوادارم بەم زووانە بەیەکدی شادبینەوەپاشان دوو جەنگاوەری بەگەڵدان تالەگەلی دەربازبوون، پوورەئەستی و پوورە زارایان بەرێکرد.

: ئێمەش با لێرەوە پوورەزاراو پوورە ئەستێ بەرێوە بەجێیان بێڵین. بچینەوە بۆ سەروسۆراخی دانیشتوانی گوندی زەردەشت ئاوا بزانین باس وخواس چییە.؟!

# (٤٥)

کوڕەکانی حەمەبۆر لەنێوان خۆیاندا مشومڕو گاڵەیان بوو، هەر یەکێك لەوان مرخی خۆی لە غوربەت خۆشکردبوو. چو نکی پێیان وابوو کە غوربەت لەترسی هەڕەشەوگوڕەشەی باشچاوەش قەدۆ نتەی بەرداوە لەم ڕۆژانەدا هەڵتەك هەڵتەك دێنەوە بن دەستیان. کوڕی لەژنە گەورەی حەمەبۆر دەیگوت: (من لەباتی خوێنی باوکم لەخۆمی مارە دەکەم) هەرچی کوڕی لەژنی ناوەنجی بوو دەیگوت:

(نەخێر، من خوێن گری باوکمم دەبێ بۆ من بێ).

: کوڕی لەژنە گچکەی حەمەبۆر دەیگوت:

(لەبەشەماڵ غەدرتان لێکردم، چاوپۆشیم لێکرد، بۆیە لە هەردووکتان موستەحەقترم. دەبێ غوربەت بۆ من بێ، هەرکامەتان پێگیری بکەن حیسابم بۆی کردووە) لەقسان دوێنێ شەو چەندجار ئاڵنگاری یەکدی ببوون. ڕیش چەرموو چوونەتە نێوانیان. ئەگەرنا، بەخەنجەران گێرمیان لەسەر پشتی یەکدی دەکرد. لەلایەکی دیکەوە زڕبراکەی درەخشان. سمێڵە خنجکەی بوو دەیگوت (هەر بگاتەوە بەر دەستم ژن بەژنی پێدەکەم). لەخۆشیان دەهات و دەچوو تەزبیحی بادەدا.

: سەعەگێل، خۆشی، خۆشی ئەوە بوو لەسەر قسەی سالە کۆری باوکی. (پەیمان) لەخۆی مارەدەکات دەیکاتە کەیبانووی ماڵ.

: بەڵام ئەوانەی ژنەکانیان لەدەست چووبووبەدەست زارۆك و مەڕوماڵات و پەلەور گیریان خواردبوو، خۆیان تاس و لووس دابوو مەپرسە، دەیانگوت (هەر ئەمجارە بێنەوە سەرماڵ و حاڵی خۆیان شەرت لەگوڵ گرانتریان پێناڵێین).

: هەر هەموو لەو خەیاڵەدابوون، كە گوایەكیژگەلی ئەشكەوتی دێوان خۆیان لەبەر زەبروزەنگی باشچاوەش قەدۆ ناگرن، ئەمڕۆ سبەی ناچار دەبن چاوبەردەنەوە حیزەكە، حیزەكە دەگەڕێنەوە سەر ئاخوڕی گۆڕین ، بەكورتیەكەی پیاوانی گوندی زەردەشت ئاوا وەكو دوا هێوارەی مانگی ڕەمەزان، هەر هەموویان چاوەڕوانی دیتنی مانگ بن، خۆش خۆشی ئەوەیان بوو سبەینێ جەژن و شادی یە.

: بەڵام هەرچی ژنەكان بوون. لەقاران بەغەزەب دا كەوتبوون ئاگر لەچاویان دەباری. دوو، دوو، سێ، سێ یەكدی گر دەبوون پستەپستیان بوو. دەیانگوت. (ئەگەرهیچمان بۆنەكرێ،خۆ لەدەستمان دێ باشچاوەش قەدۆو ئەو تەرەسەی لەمەڕخۆمان ژەهرخواردوویان بكەین. بەڵام جارێ بائارام بگرین بزانین كاربەچی دەگات).

: مەلا سڵاوی نوێژی شێوانی دایەوە. لەناوایی بووە غەڵبەغەڵب و دەنگە دەنگ،چییە.؟! (پوورە ئەستی و پوورە زارا هاتنەوە).

: باشچاوەش قەدۆ، لەسەر ئاووئاگر بوو. دەیویست هەرچی زووە تامی زاری غوربەت بزانێ.

لەگەڵ ئاغا شان بەشان لەسەر سەكۆی دیوەخان ڕاوەستابوون چاوەڕوان بوون كەی دەگەنەوە جێ.

: سەعەگێل فانۆسەكی بەدەستەوە بوو لەپشتەوەی هەردووكیان ڕاوەستابوو، بەڵام هیچ ڕۆشنایی و شەوقی نەبوو، خەڵكەكەش لە پێش سەكۆكە ڕاوەستابوون هەستیان لەخۆیان بڕی بوو چاوەڕوان بوون.

: پوورە زاراو پوورە ئەستی هاتن لە پێش سەكۆی دیوەخان دابەزین.

باشچاوەش قەدۆ، بەزمانی سیاسەتبازانە ماندوو نەبوونی لێكردن گوتی:

(داوای لێبوردن دەکەم، زەحمەتم دابەر ئێوە، نەدەبوو ڕوو لەئێوە بنێم بۆئەم سەفەرە، بەڵام چونکی ئەوانە زەعیفەن لەگەڵ ئێوە چاکتر حاڵی دەبن، بەڵکە بەقسەی ئێوە دەگەڕێنەوە سەر ماڵ و عەیالی خۆیان لەم دەردەسەرییە ڕزگاریان دەبێ. ئێوەش نابێ دڵگیر بن چونکی ئەم ماندووبوون وزەحمەتیەی درابەر ئێوە. لەپێناو بەرژەوندی گشتی بوو. سوپاستان دەکەم. کەگەڕامەوە بۆ شار دوو دیاری بەنرخ بۆ هەردووکتان دەنێرم).

: پاشان پوورە زارا هاتە گۆ: لەسیری هەتا پیوازی هوردوباریك قسەکانی هاوڕێ غوربەتی پێ ڕاگەیاندن.

: باشچاوەش قەدۆ، لەدڵە خۆی پێشنیازەکانی غوربەتی تەتەڵەکرد. بەخەیاڵی خۆی پێیوابوو کە غوربەت لەترسی (ئەو) هەڵژنراوە، بۆیە داوای گفتوگۆ دەکات. تاکو دڵنیابێ لەوەی کە گیانی پارێزراوە. چونکی (ئەو) بکوژی حەمەبۆرو کەلۆس و هیدیکەشە. لەخۆی دەترسێ نەبادا بەدەست کەسوکاری کوژراوەکان تووشی گێچەڵ بێ. بێگومان بیری کردووتەوە. لەدوای ئەم هەموو کوشت وبڕو خوێن ڕشتنە، بۆی نالوێ چیتر لەگوند ژیان بەسەرببات. مسۆگەر نیازی شارە، بیری لەوەش کردووتەوە کە یەکێك داڵدەی بدات هاوشانی خۆی بێت. بەڵام بۆچی گتوویەتی (ئەگەر تاسا ناکات بەتەنیا بێ. یان ئەگەر بەگومانە بارمتەی بۆ دەنێرم). تۆ بڵێی لەبەر فێڵدا نەبێ.؟! نەخێر بڕواناکەم لەبەرفێڵدا بێ چونکی سووڕ دەزانم لەژیانی ئەم شاخ و داخە بێزار بووە، لەکردەوەکانی پەشیمان بوویتەوە، تێکەوتووە لەهەلێك دەگەڕێ یەکێك گفتی بداتێ داڵدەی بدات خۆی ڕزگار بکات. بۆیە دەزانم لە نیاز پاکییەتی بێگومان وەڕس بووە، بەڵام نەك خوێنی حەمەبۆر، خوێنی دەیانی وەکو حەمەبۆری لەئەستۆبێ داڵدەی دەدەم لەهامێزە خۆمی دەگرم، غوربەت شایەن بەگەلۆرو قالوران نییە، ماینی

حدودە،حەیف و مەخابن شەغرەی لێبارکەن دەزانم تەنگاوبووە.. ئەمشەوم لێبەکۆتا هاتبا، سبەینێ وەکو فریاد ڕەس توونند مەچەکی دەگرم تاهەتایە لەخۆمی جیاناکەمەوە.

بەم و ڕێنانەوە کاتێك پێلووەکانی کەوتنە سەریەکدی خەوی لێکەوت.

## (٤٦)

هێشتانەکێ تاریك ورِوونی بەیانی بوو، غوربەت بانگی پوورەسێوەی کرد، نان وپەنیریان کردە بەرچایەو خەریکی وتووێژبوون. هاورِێ غوربەت گوتی:

- پوورەسێوە، دنیا وەکو دارستانێکە پرِبێ لە درِندەی کێوی، بەهێز بێ هێز تێکەشکێنێت ودەرِوا ئاوری لێناداتەوە، واتا مرۆلە ژیانیدا یان دەبێ راوچی بێ یان نێچیر، ئەگەر نێچیر بوو.؟! دەبێ ملکەچی راوچی بێ، بەلاّم ئەگەر راوچی بوو.؟! تووشی بەتووشی درِندەی بێئاوەزی وەك باشچاوەش قەدۆ دەبێ، دەبێ بەفرت و فێلّ تێکی بشکێنی.

- مەبەستت چیە تێناگەم.؟!

- پوورێ، ئەم شەو جەنگاوەرەکان لەنێوەندی گەلی دا چادرێکیان هەلّداوە، لەچواردەوری چادرەکە چوار قۆرتیان هەلّقەناندووە نیو بەژنە زەلام قولّیان کردووە، خۆیان تێدا حەشار دەدەن. ئێستا دەبێ برِۆین بچین لەژێر چادر چاوەرِوان بین.. پاشان تێتدەگەیەنم چتۆ تەلّەم بۆ باشچاوەش قەدۆ دانایەتەوە.

: دواتر سواری ئەسپ بوون، هێواش هێواش بە نشێودا شۆرِبوونەوە بۆ شوێنی مەبەست هەندەی پێنەچوو (نازێ و پەیمان و خەجۆوعەیشان) گەیشتنەلایان، دوابەدوای ئەوان دلّبەر بەخۆی و (١٠) جەنگاوەر ئەوانیش گەیشتنە جێ. دەستەی دلّبەر بەجێگەی خۆیان دەزانی خۆیان قایم کرد، لەیل، بەتەنیا چووە سەر دۆندی شاخێکی بەرز بەسەر رِێگاوباندا زالّ بوو. دەسترۆکەکی سووری بەدەستەوە بووبۆ ئەوەی هەرکاتێك باشچاوەش قەدۆو جەندرمەکان بەدەرکەوتن دەسترۆکەکەی هەلّشەقێنێ ئاگاداریان بکاتەوە لە مەتەرێز خۆیان مەلاّس بدەن.

: ئای لەم ڕۆژە، چ ڕۆژێکی کش ومات بوو، مرۆ تیادا سامگرتی دەبوو، تۆ وای بێنە بەرچاوی خۆت.! گەلییەکی دوورو درێژو قووڵ، ئەگەرلە بستۆی چیاوە بەقووڵایی گەلیدا بڕوانی، تەنها چادرەك لەنێوەندی گەلیدا بەدی دەکەی.

ئەم چادرە چارەنووسی سەدان ئافرەتی پێوە بەندە، لەژێر ئەم چادرەدا قارەمانێك ئارامی گرتووە، جێ هیواو متمانەی کیژگەل و ئافرەتانی یاخی بووە، بەلام تۆبڵێ: چ قارەمانێکە.! لەپێناو ژیانێکی بەکەرامەت وبەختەوەری هاوسەنگەرەکانی، گیانی خۆی خستووتە سەرلەپی دەست هەڕەشە لەمەرگ دەکات، دەبێ ئەو دایکە چ دایکێك بێ لایەلایەی بۆ کردبێ.؟! یان ئاوازی چ گۆرانییەکی بەسۆزو خەمناکی بەگوێیدا چرپاندبێ.؟! سەیری کەن،چەندە جوان هەردوو دەستی لەپشتڕا تێکئالاندووە، وەکو سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕی ئازادیخواز لەپێش چادری چارەنووس دێت و دەچێ. نیگای بڕیوەتە بستۆی چیاو چاوەڕوانی دەسترۆکەی دەستی لەیل دەکات. ئاخۆ کەی دەسترۆکەی بۆ هەڵدەتەکێنێ! واتا وریای خۆتان بن قۆشەنی دوژمن بەرەو ئێرە بەڕێوەن.

: باشچاوەش قەدۆ زوو لەخەو هەڵستابوو، بە(جیزان)ڕیشی خۆی تراشی بوو، خۆی تاسو لووس دابو. وەك ئەو کەسەی کە بۆ ئاهەنگی بووك گواستنەوە بچێ ئەسپیان بۆ زین و لغاوکرد لێ سواربوو، دواتر فەرمانی بەجەندرمەکانی دا. سواربن، پەنجا ئەسپ سوار بەدووقەتار بەناوەڕاستی ئاوایی زەردەشت ئاوادا ڕێچکەیان بەست، چرقە چرقی ناڵ و فرمە فرم وحیلە حیلی ئەسپان لەلایەك، حەپە حەپی سەگەل و ڕاکە ڕاکەی منداڵە هور تکان لەلایەکی دیکەوە بەدوایانەوە بوون، ناوەناوە خۆیان لەقەرەی ئەسپێك دەدا سێ، چوار (داوەموو)یان لەکلکی دەپچڕاند، خۆشی خۆشی ئەوەیان بوو.! پاشان لەدەم

گۆمەئاوو چلپاوی بیری ئاو(زەرگەتە)ی پێ ڕاو دەکەن. لەئاوایی بەدەرکەوتن ڕوویان دابووە لەئەشکەوتی دێوان، تۆز بەری عاسمانی گرتبوو.

:غوربەت، یەکبێن تەماشای دۆندی چیای دەکرد، چاوەڕوانی دەست و دەسترۆکەی لەیل بوو، چێشتەنگاوێکی قایم بوو دیتی لەدوورەوە گەردەلوولەك بەئاسماندا هەڵدەچوو، بەدیقەت تر دیقەتی لێگرت.! سەلەفەك سوار بەڕێوەن. دەسترۆکەی سووری لەلوولەی تفە نگ ئاڵاند قۆنداغەی گرت و بەرزی کردەوەو بەملاوبەولادا ڕایدەهەژاند، وەکو ئاڵا لەدۆندی چیا دەشەکاوە، هاوڕێ غوربەتی پێ ئاگادار کردەوە.. واهاتن. غوربەت گوتی:

(پووری وەرە سواربە برۆ لەدەرکی گەلی ڕاوەستە چاوەڕوان بە. کە نزیك بوونەوە پێشیان لێبگرە بزانە گفت و لفتی باشچاوەش قەدۆ چییە.؟!

داوای بارمتە دەکات، ئەگەر داوای بارمتەی کرد بەپەلە وەرەوە چارەی دەکەم. پوورە سێوە سواربوو ڕۆیی بۆ بەرایی لەشکر، نازێ و هەرسێ جەنگاوەرەکەی دیکە بەپێی نەخشەو پلان لەپەنا گابەردێك ئارامیان گرتبوو، هەرکاتێ دەنگی دان هەر چواریان لەبەردەمی ئامادەبن. پێی گوتن ووشەی( نهێنی)تان لە بەبیرنەچێتەوە، گوێ قولاغ بن هەرکە لەزاری منەوە گوێبیستی نهێنی یەکەبوون وەکو شێر لەلانەوە بۆی دەرچنە دەرەوە، یەکێکتان پەلاماری یاوەرەکەی بدات. ئەگەر دەستی نەدا.؟! ساردی کاتەوە، سێیەکەی دیکەتان هەڵکوتنە بن چادر، بەلام باشچاوەش قەدۆم بەزیندوویی لێتان دەوێ، جا حیسابی خۆتان بکەن چۆن.؟! لەچاوتروکانێکدا لێی دێنە دەست و پەلبەستی دەکەن،دەبڕۆن لەشوێنی خۆتان هەستیار بن) خۆیان هەڵدا ناو قۆرتەکان، بەپووش و پەلاش وگەلای دار سەری قۆرتەکانی داپۆشی ئیدی لەپێش چادر هێمن و ئارام دەهات و دەچوو چاوەڕوان

بوو، لەدەروونەوە لەبەر پەروەردگار دەپاڕایەوە (خودای گەورەو میهرەبان بەفریامان بکەوە فرسەتمان بدەی بەسەریاندا زاڵ بین).

: پوورە سێوە چەند ساڵ لەوەپێش هێشتان لە هەڕەتی جوانی دا بوو چاوی بە باشچاوەش قەدۆ کەوتبوو، بەدوای هەڵاتواندا هاتبووە گوندی زەردەشت ئاوا بیانگری قۆڵبەستیان بکات بیانباتەوە بۆ خزمەتی سەربازی، کاتی نیوەڕۆ بوو لەسەرکانی بەرماڵان ڕووبەڕووبوون لە بنی پێی هەتا تۆقەرەی سەری بەوردی دیقەتی دابووێ زمانی بەلالغاوەی دادێنا، پوورەسێوە دەیناسی چتۆ سپڵەوحەرامزادەیە بەچاوی کرپار سەیری ئافرەتان دەکات، لەو ساوە لێی بەقین داچووبوو، ڕقی لە چەهرەی دەبۆوە ترسی ئەوەی لێ نیشتبوو ئەگەر نەکەوێتە داو، بێگومان ژیانیان لێتاڵ دەکات. لەم خەیاڵانەدابوو لەگەڵ غەڵبەغەڵب وگاڵتەو فشقیاتی جەندرمەکان خەیاڵی پچڕا. هەستاوە سەرپێ ڕاما.!سوار ئەسپێکی ڕەشی بێ نیشان لەبەرایی دابوو ناسیەوە. (هەوە.. خۆیەتی). پێکەنینی هات لەبەرەخۆی گوتی:

(ئەو تەڕپیرە کووخۆی تاس و لووس داوە، وادەزانێ بەزاوابەندی دەچێتە سەر ماڵی غوربەت دەیکاتە موڵکی خۆی، ئای لەخۆت غەریبێ) پوورەسێوە بەپیریانەوە چوو ماندوونەبوونی لێیان کرد پاشان گوتی :

- قەدۆئاغا، لەبەمانییەوە ئاوی پێم داهات، چاوم خێل بوو هێندە چاوەڕێم کردی، هێشتانەکێ تاریك و ڕوونی بوو غوربەتخان پێی گوتم

(بڕۆ بۆ پێشوازی بەزمانی من بەخێرهاتنی بکە) باشچاوەش قەدۆ لەسەر پشتی ئەسپ دابەزی. بەجەندرمەکانی گوت (لێرە دابەزن پشوو بدەن) هەوساری ئەسپەکەی دادەستی پۆلێسێك، پاشان دەستی هاوێتە سەرشانی پوورە سێوە پێ بەپێ دوورکەوتنەوە.

- ئێ پوورێ. پێمبلێ بزانم غوربەت چی پێگوتی.؟! بەنیازی چییە.؟! تۆ بلێی دەگەڵمان بسازێ.؟!

- غوربەتخان، چی بەپوورە زاراو دایکی گوتبوو هەرئەوشی بەمن گوتووە، ئەوەی من بزانم حەزبەخوێن ڕشتن ناکات، بۆیە داوای وتووێژ دەکات، من هەر بۆئەوە هاتووم پێشوازیتان لێبکەم، بەلأم ئەگەر تاساناکەی.؟! یان لەخۆت ڕانابینی بەتەنیا بچی گفتوگۆی لەگەڵ بکەی داوای بارمتە دەکەی، تۆ لێرە ئارام بگرە هەر ئێستێ سوار دەبم تەقلەکوت بۆلای غوربەت دەگەڕێمەوە، سێ، چوار بارمتە لەگەڵ خۆم دێنم، بالای جەندرمەکان بمێننەوە ناحەق نی، چونکی ئەگەر مرۆ، هەرمرۆیەك کەترس بەسەریدا زاڵ بوو، لنگی دەلەرزی هەنگاوی بۆ هەڵناگیرێ، ترس وایلێدەکات لە بەرامبەرەکەی چۆك بدات، ئەو هەیبەت و سامەی جارانی نامینێ.

لەگەڵ ئەم قسانە نیگای چەقاندبووە دوڕ چاوی باشچاوەش قەدۆ چاوی لەبەر نەدەتروکاند.

: بەم قسانە شادەماری باشچاوەش قەدۆی گرت. لەحەیبەت قسەکانی پوورەسێوە مڕدامابوو، بەخەنجەران هەنجن هەنجنت کردبایە.؟! خوێنی لێنەدەهات. لەدڵی خۆیدا دەیگوت (بریا پیرەژن نەبای، دەمزانی لەگەڵ ئەم قسە(باتمان)یانەت چۆن.؟! شەویلاکم تێکدەشکاندی. بەلأم دەڵێی چی.؟! سەگ بەسەگایەتی خۆی بەئافرت ناوەڕێ. ئەگەرنا، لەپای ئەم قسانە دەبووایە زمانت لەکونی گوێچکەتەوە دەرکێشم). بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا بەسەرەخۆی نەهێنا بەپێکەنینەوە گوتی:

- پوورێ، قسەکانت بۆنی گەفو هەڕەشەیان لێدێ، ئەگەر تۆنەبای.؟! لەمێژبوو لەخوێنی خۆیدا گەوزاندبووم. چمەئافرەت خۆی چ هەیە تاکو من لێی بترسم

داوای بارمتەی لێبکەم، ئەوە ئیهانە پێکردنە، من لەوەتەی دەستم داری گرتووەنێرنەبووە ئیهانەی من بکات ئەو کەسەی ئیهانەی من دەکات هێشتا لەپشتی باوکی نەخولقاوە. پوورەسێوە، خۆی لەگورەنەبرد، زانی شادەماری گرتووە، تەواو قووشقی بووە، پێی گوت:

- خۆ چ قسەی خراپم بەجەنابت نەگوتووە، تالە خوێنی خۆم دابمگەوزێنی. هەنووکەش دووپاتی دەکەمەوە، ئەگەر مرۆترسی بکاتێ لنگی دەلەرزی نتەی بەردەدات، چبزانم.؟! من چبزانم جەنابت بە گۆلمەئاوێك دەکەویتە باسکەمەلە، ئێستا من و تۆ هەرچەندی بەبەریەکدی دا بکەوین هیچ بەهیچە، هەمووی دووقسەیە، ئەگەر ترس غەلەبەی لێکردی.؟! داوای بارمتەدەکەی پەکناکەوێ، ئەگەرنا، فەرموو بابڕۆین بۆلای غوربەتخان، والە ژێرچادر چاوەڕوانە، ئیدی بۆخۆت سەرپشك بە.؟

: باشچاوەش قەدۆ وەلامی نەداوە بەپۆلیسەکانی گوت (ئێوە لێرە ئارام بگرن. وریای خۆتان بن تاکو من و (قولی) بەدەنگی ئەم ئافرەتانەوە دەچین. زەعیفەن ناکرێ گوێ لەداخوازیەکانیان نەگرین، بزانین کار بەچی دەگات، پاشان دەگەڕێینەوە.

# (٤٧)

باشچاوەش قەدۆ چەكی لەخۆی داماڵی بەڵام (قولی) یاوەری چەكی هەر بەشانیەوە بوو، هەرسێكیان سواربوون بێورتە یاغریاغر بەرەو چادر بەرێ كەوتن. خۆر بەناوچەوانی ئاسمانەوەبوو، نیگات بەهەرچی بنەداروبەردی ئەشكەوتنی دێوان دا گێرابا گیانلەبەرێكت بەدی نەدەكرد، هەستت بەجولەوخشپە نەدەكرد، تەنها گوێت لە چرقەچرقی ژێر سم ونالی سێ وڵاخی بەرزە دەبوو، ناوەناوە لەهیكەوە (خەمەگرو)ەك بەپێشیاندا ڕەت دەبوو، بەمە وڵاخەكان دەسەنگرانەوە، دەیانفرماند،دیسان تێهەڵدەچوونەوە لەلایەكی دیكەوە هەرچی لووتكە شاخ وبن گەوەڕو تاشە بەردبوو هەرهەمووی ببوونە چاو، چاویان لێرسكابوو، سێرەی نیگایان لەم سێ سوارە گرتبوو.

: غوربەتخان، بەتاقی تەنیا لەبەردەم دەرگی چادر دەهات ودەچوو چاوەڕوان بوو، ڕێگاكە بەپێچ وپەنابوو، كاتێ ئەوانی دیت لەهەنشكایی بەدەركەوتن غوربەت، یاغریاغر بەپیریانەوە چوو پوورەسێوە گوتی: (ئەوە غوربەتخانە هاتووتە پێشوازیتان)

: باشچاوەش قەدۆ، لەسەر پشتی ئەسپ بەحەپەساوی تێی ڕاما، وەكو كەڕولاڵ نتقی گیرابوو، غوربەت پێ حەسیا، بەتەوسەوە بۆی خەنییەوە گوتی (دڵنیانەبووم دێی، گوتم تاسا ناكات بێ ئەگینا جوانەگایەكم لەبەرپێت دەكوشتەوە. فەرموو دابەزن كەرەمكەن بۆ ژێر چادر. نیوڕان لەكەلی كەوتووە لەچاوەڕوانی بەرێزتان دا ژەمبووردە بووین بانانەكەمان بخۆین. كەی بێنت وەبەرهاتەوە ئەوسا دەست پێ دەكەین).

هەرسێکیان دابەزین ولاخەکانیان لەبنە دارگرێدا.

: چەند ڕۆژێك لەوەپێش بزنە کێویەك لەشاخ هەڵدێرابوو دڵبەر بەدوای قارەقاریەوە چووبوو. دەبینی هەردوو دەستی شکاوە لەپەلوپۆ کەوتووە. هێنابوویانەوە هەردوو دەستیان بۆی گرتبۆوە بەلام چکو گردە بڕشکابوو، ئومێدی چاکبوونەوەی نەبوو، لەحەزمەت ئێشوئازار هیچی نەدەخوارد دەبنێسا، ناچار ڕۆژێکیان سەریان بڕی بوو.. پوورە سێوە پێستەکەی خوێی لێدابوو خۆشی کردبوو، دابوویە پێش خۆرەتاو دەیگوت: (کە هیشك بۆوە پێشکەشی هاوڕێ غوربەتی دەکەم بیکاتە سەرزین جوانە). ڕانێکیان لە گۆشتەکەی گلدابۆوە، هەر لە دۆنی خۆی دا سووریان کردبۆوە، هێنابووی بۆ بن چادر. بۆ خوانچەی میوان گەرمیان کردبۆوە. تالەبەرکشانەوە لێیان خوارد، باشچاوەش قەدۆ گوتی:

- خواردنێکی زەریف وبەتام و چێژولەزەت بوو، دەستی کابان خۆش بێ.!

پوورەسێوە باگۆی داوە( نۆشی گیانت بێ گۆشتی پێ بگری. ئەوە کوشتەی دەستی غوربەت خانە. هەفتەی جارێ دووان بزنە کێوی بێ، شووربێ. بۆمان ڕاودەکات. وەنەبێ بێ گۆشت بین مەڕومالاتمان لەبەردەستدا هەیە، بەلام گۆشتی مامزو ئاژەلە کێوی بەلەزەت ترە، تام گۆڕی خۆی لە خۆیدا خۆشە) پشتی هەنگێ باشچاوەش قەدۆ بەنەرمە کۆخین قوڕگی خۆی خاوێن کردەوە گوتی:

- غوربەت خۆت دەزانی من بەفەرمانی دەوڵەت هاتووم فەرمانم پێ کراوە ئەگەر خۆتان نەدەنە دەست، قەتل وعامتان بکەم. لەبەرئەوەی ئێوە لەلایەن میری بەبکوژوچەتەو ڕێگر ناسراون. وە دەوڵەت ڕێگەی بە من نەداوە دانیشم گوێ لەداخوازیەکانتان بگرم، بەلام چونکی ئێوە زەعیفەن ویژدانم ڕێگام پێنادات ڕەشە کوژتان بکەم. ئێستاش تاکار لەکار ..

: هاوڕێ غوربەت قسەی پێ بری گوتی:

- ئێمە چەتەو ڕێگرنین دژ بە دەوڵەتیش نین تا بەچەتەو ڕێگر ناوزەندمان بکەن.لەپای ئەوەی کاربەدەستانی دەوڵەت ڕێز لەداخوازیەکانمان بگرن پیاوان تەمبێ بکەن چیتر غەدرمان لێنەکەن. بەدزو جەردە تاوانبارمان دەکەن.

- غوربەت، ئەم سەردولکانەی تۆ هەمووی نرخی پولێکی قەڵپیان نییە، ئەوەی ئەنگۆ کردووتانەو دەیکەن، بنەبڕی زاوزێ دەکەن، ژن و مێردایەتی لەئارادا نامێنێ، ئەوە هەڵگەڕانەوەیە لە ئایین، پێ لێنانە لە داب ونەریت وخوو ڕەوشتی باب وباپیران، خەڵك تفوونەفرەتتان بۆ دەنێرن، دەوڵەت ئەوەتان لێخۆش نابێ، هۆشت بینەوە سەرەخۆت هەست لەخۆت ڕاگرە.! تۆ بکوژی، میریی بەپێی یاسای دەوڵەت سزات دەدات نازانم بەتەمای چی؟! خۆ هەتا هەتایە لەشاخ نامینێتەوە, ژن وچیاو ئەشقیاو چەتەگەرییان نەگوتووە. خۆت دەزانی ئەم کێوانە پڕی چەتەوڕێگرە لەدرندەی گۆشت خۆر خراپترن شەوێ لەشەوان خۆتیش نازانی چۆن.؟! پرکێشت دەبن. ئابڕووت دەچێ بەدەستیانەوە ئێستا کارلەکار نەترازاوە، ئەم هەلە لە دەست خۆتان مەدەن، بنێرە بابێنە خوارێ چەکەکانیان دانێن بابچنەوە سەرماڵ وحاڵی خۆیان، ئەوە ژیان نیە ئێوەی تێدان. بەتایبەتی سەبارەت بەتۆ، هیچ ماقووڵ نیە، ئەسڵەن ڕاست نیە جوانێکی وەك تۆ، هەموو تەمەن وجوانی وشۆخ وشەنگی خۆی لەچیاوچۆڵان بەسەرببات وتام وچێژ لە ژیانی بەهەشتی هاوسەریدا وەرنەگرێ. تۆ بەهەڵەداچووی ڕەنجەڕۆی. وەرە شەیتان بەنەفرەتکە، بیر لەپاشەڕۆژو چارەنووسی خۆت وهاوڕێکانت بکەوە. بائەو تەمەنەی ماوتانە وەکو خانمان بژین نەك وەکو چەتەو ڕێگر. غوربەت، چاوگرتی نەبوو، پێکەنینی بەم قسانەی باشچاوەش دەهات، بەنەنقەست خۆی دەیزانی بۆ کێندەر بەرەو هەڵدێری دەبات، بۆیە بەنەرمی دەیدواند.!

- سەرم سوورماوە ئەگەر لەشاخ دەمێنمەوە، مسۆگەر ڕۆژێ لەڕۆژان بەدەستی ئەم هەموو گورگ وچەتانە ئابرووم دەچێ، ئەگەر دەگەڕێمەوە بۆگوندی زەردەشت ئاوا. دەکوژرێم. چ پەڕو باڵیشم نیە بفرم. نازانم چار چییە.؟! - غوربەت، تۆ زەعیفەی بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم ئەوەی من بزانم تەنها شار بۆتۆ باشەـدەشێ تیادا بحەوێتەوەـبەلام دیسان هەر زەحمەتە بۆتۆ، چونکی تەنیا کچێکی شۆخ وشەنگ لەشاران هەزار بەندوبالۆرەی بۆ هەڵدەبەستن.

- مەبەستت چییە تێت ناگەم.؟!

- مەبەستم ئەوەیە دەبێ یەکێك هەبێ لەشاردالدەت بدات

- جامن کێم هەیە دالدەم بدات. ئەگەر کەسێکم هەبووایە ڕۆژم بەم ڕۆژە نەدەگەیی. باشچاوەش قەدۆ، بەم نەرم ونیانیەی غوربەت فرە دڵخۆش بوو، پێیوابوو کە تەواو نەرمی کردووە. جوولەیەکی کرد، لەجێوەخۆی هێناوبرد دەستی بەسمێلی داهێنا. نیگای برییە دوڕ چاوی غوربەت گوتی:

- غوربەت، من چۆن دێڵم لەم شاخ وداخە گورگان خواردی بی، لەگەڵ خۆم ئەتبەم بۆ شار، خانووەکی شارستانی سەربەخۆت بۆ دەرازێنەمەوە، لەکەلی شەیتان وەرە خوارێ، جیت داوە لەتفەنگ وشەڕوشاخ، دەچین بۆ شار، ئەوسا تێدەگەی ژیان چۆنە ومانای چییە، ئەوەش بزانە کەتۆ لەژێر سێبەری مندا کەس جورئەت ناکات پێت بلێ لەسەرچاوت دوو برۆ یە.

- باشە ئەگەر بەم پێشنیارەی جەنابت سەرگرانبم. چۆن.؟!

- حەزناکەم پێگیری بکەی. چونکی هەنگێ ناچار دەبم بەپێی فەرمانی دەوڵەت لەگەڵتان بجولێمەوە، بێگومان خراپ بەسەرتان دەشکێتەوە.

- چۆن.؟!

- دەبێ ڕەشەکوژی دەست پێبکەم.

- گوناحتەگاتێ لەپای چی ڕەشەكوژمان دەكەی.؟!

- كە تۆ ناسازێی.؟! ناچارم دەكەی. گوناحی من نییە، گوناحی خۆتە.

- باشە بۆ گوناحی منە.؟! دەبێ گوناحی ئێمەی ئافرەت چی بێ .؟

- گوناحتان ئەوەیە، قەدەر عەیامێكە ناوی بێ لغاوتان خواردووتەوە. وابەئاسانی ناگەڕێنەوە لەسەر سنگ وئاخوڕی خۆتان داناوەڕێنەوە.

- ئێمە زەعیفەین لەباتی ئەوەی بەچاوی سۆزوخۆشەویستی دەستی یارمەتی وهاوكاریمان بۆ درێژ بكەی، كەچی گێچەڵمان پێدەكەی. نازانم بۆچی هێندە ڕەقەكاری لەگەڵمان ناسازێی.؟!

: قولی یاوەری، تفەنگی كردبووە شانی لەپێش ئەو قۆرتەی نازێ خۆی تێدا حەشار دابوو. دەهاتودەچوو، بەئەندێشەی خەیاڵ دا چووبوو. بیری لەشۆخ وشەنگی غوربەت دەكردەوە، دەترسا نەبادا ئەو زاڵمە بەچاوو ڕاو تەنگی پێ هەڵچنی دەستەمۆی بكات، لەدڵی خۆیدا دەیگوت (تۆ بڵێی ئەم شێرە كچە بەگەف وگوڕەشەی (ئەو) هیچوپوچە نتەی بەربدات دەستی بەخۆیدا شۆڕ بكاتەوە، كابرایەكی ڤیڕسیچمەیە هەرهەندە گڕناگەی لەشتێك گرتئیدی چەنەی لەسەر هەڵناگری. بەلاَم خەیاڵی خاوە، لەخودام گەرەكە غوربەت بۆی نەڕووخێ. هەر ببێتە شەڕیان بەقوربانی یەك گوللەی دەكەم، ساردی دەكەمەوە، لەكاتی شەڕدا كێ بەكێیە).

: باشچاوەش قەدۆ، دیقەتی لەشۆخ وشەنگی غوربەت گرتبوو. لەدڵەوە دەیگوت (چ نازدارێكە، سەدحەیف مەخابن لەپێش خۆرەتاو وشەو نخوونی و ترس ڕەش دا هەڵگەڕاوە) دواتر تێهەڵچۆوە گوتی:

- غوربەت ئەوەش بزانە كەمن ئەوەندەی بۆتۆ سازاوم لەژیانم دا بۆكەس نەسازاوم ئێستەش ئەگەر مەرامت بێ ئاسانە.!

- چۆن ئاسانە؟!

دەستی بۆ سمێڵی بردو گوتی:

- ئەم مووە لەپیاوان نەهاتبێ ئەگەر تائەو ڕۆژەی سەردەنێمەوە لەسەردەستی خۆمت دانەنێم، بەڵێن بێ سەرتاپات لەزێڕ هەڵدەکێشم بەس گفتم پێ بدە بەسەرداری خۆتم قبووڵ بکە. خەمی هیچت لەبەردا نەبێ. لەهاوڕێکانیشت خۆش دەبم. دەڵێی چی.؟!

- باشە جەناب، تۆ ئێستا ژنی خۆت تێرنان و پۆشتەکردووە تاکو من لەزێڕ هەڵکێشی.؟!

: ئەم پرسیارە لەهێسکی کاری کرد، زۆر پێ قەڵس و پەستبوو. لەدڵی خۆیدا گوتی (نەخێرئاسن ساردەکووتە، بەخۆشی نایەتە ڕێ، بالێی توونددکەم)

دەمانچەی بەڕووتی لەبەرباخەڵی حەشاردابوو، خەریك بوو دەستی بۆ ببات، غوربەت پێ حەسیا بواری نەدا دەستی بگاتە دەمانچە. دەستی گەیاندە مشتووی خەنجەر لەکاڵان دەرکێشاولەسەر قرقرتۆکی داناو دووجاران وەکو هۆزار خوێندی و پێی گوت: نامەرد نەجوڵێی، هەر جووڵەکی بکەی،

قرقرتۆکت هەڵدەدڕم، بێ شەرمەف چاوی سپی بوو دەستی بەخۆیدا شۆڕکردەوە.

: قولی یاوەری، هێشتانەکێ لەم هۆڕێنانەدابوو چۆن باشچاوەش قەدۆ لەنێوبەرێ.؟ بەمەبەستی ئەوەی هەتاهەتایە غوربەت لەباوەش خۆی بگرێ.

: بەلاّم نازێ وهاوڕێکانی کە گوێیان لە چریکەی هۆزار ئاسای (نهێنی) نێوان غوربەت و خۆیان بوو، هەر چواریان وەکو پڵنگ دەرپەڕین، بواریان بەقولی یاوەری قەدۆ نەدا تفەنگ لەشانی داگری، خەجۆ، لوولەی تفەنگی گەیاندە ناوشانی، پێی گوت (دەستت بۆ تفەنگ نەبەی ها، ئەگینا مێشکت دەپرژێنم .!)

نازێ، قۆنداخەی تفەنگی ئاراستەی پشتەسەری قولی كرد دایوەشاندێ، وەكو (گا) قۆڕاندی خوێن فرچقاندی دەماودەم بەربۆوە، چەكەكەیان لێكردەوە لەهۆش خۆی چووبوو.

: هاوڕێ غوربەت هێشتانەكێ نووكی خەنجەری لەسەر قرقرتۆكی هەڵنەگرتبوو، پەیمان وعەیشان تاویان دا ژێر چادر، پێكەوە لوولەی تفەنگیان دانا سەرتەختی نێوچەوانی باشچاوەش، غوربەت بە عەیشانی گوت! دەمانچەی بەڕووتی لەبەرباخەڵی دایە لێی وەگرە.! عەیشان دەستی لەباخەڵی ڕاكرددەمانچەكەی دەرهێنا ڕادەستی غوربەتی كرد گوتی (فەرموو هاوڕێ، ئەوە دەمانچەی باشچاوەش قەدۆیە بۆ یادگاری لات بێ) .پاشان هەردووباڵیان لە پشتەوە تێكپەڕاند بەكندرِ هەردوو دەستیان شەتەك دا،

: لەیل لەبستۆی چیا، سێرەی چاوی گرتبووە چادر چاوەڕوان بوو كاتێك دیتی.! هاوڕێ غوربەت دەسترۆكەی سووری بۆ هەڵدەشەقێنێ. لەم لاوە دەستەی دڵبەر، بۆ پۆلیسەكان خۆیان لەبۆسەنابوو، لەیل هەر لەجێوە لەدۆندی چیا، فیشەكەكی كارخانەی لێخوڕیە بەر خانەی تفەنگ و پەلەپیتكەی ڕاگووشی وپلی لێبزاوت لە هاڕژنی دا، دەستەی دڵبەر لێیان بەخۆكەوتن، هەندێكیان بەمەبەستی تاراندنی ولاخەكانیان لوولەی تفەنگیان ناڕاستەی ولاخەكان كردبوو تەقەیان دەكرد، ولاخ تێك قژقژان، نەخێر پەرتەیان پێكردن هەریەكەو بەلایەكدا پەرتەوازە بوون بۆی دەرچوون، جەنگاوەرەكانی دیكە، بەمەبەستی تۆقاندنی پۆلیسەكان لوولەی تفەنگیان تێكردبوون بووكانە گوللە بارانیان دەكردن، شپرزەیان كردبوون، پۆلیسەكان بەپاشەكشەوقوونەدزە بەرگریان لەخۆیان دەكرد، هەبوو بەئەسپی خۆی ڕاگەیی بوو، هەبوو پیادەبوو پێی پێوەنابوو، هەڵیان قەناندن لەمەودای تفەنگ دەرچووبوون. دڵبەر فەرمانی پێدان.! چیتر

تەقەنەکەن چوار ئەسپی پۆلیسەکان هەرمتە ببوون، هەرچواریان گرتنەوە، دووانیان، دوو تفەنگیان بەقەدی زینەوە مابوو.. چاویان لێبوو پۆلیسەکان یەکدی گربوونەوە، لەنێوان خۆیان مشتومڕیان بوو، پاشان بوون بەسێ دەستە وبەسەر سێ قۆڵدا دابەش بوون، چەومریان کرد لەسێ لاوە هێرشیان کرد، دڵبەر گوتی:

شەڕ دەرگای لێگرتین، ئەمجارەیان دەست مەپارێزن بە سۆدەرەیان بەن،دوو دوو پەرت بن خۆتان دامەزرێنن، دواتر بەئاوازی گوت:

ئاواز، تۆ سواری ئەسپە قولە بەو ئەو شین بۆزە بەدوای خۆتدا قەتارکێش کە، بەم دۆڵەدا لێخوڕە ئەم قۆتە بەرزێهێت دیوە.؟!

لەیل پیادەیە، داگشاوەتە خوارێ واڵە پەنا ئەو قۆتە سەنگەری گرتووە. بیگەیێ، پاشان هەردووکتان پێکەوە دۆڵاودۆڵ بۆیان داکشێن پشتیان لێبگرن سەروەشێنیان بکەن. دواتر ڕووی کردە (بێری)و پێگوت:- (ئەم ئەسپە ڕەنگ مامزیە لەم بنە دارێهێ ببەستەوە بۆمن، خۆشت سواری ئەو ئەسپە ڕەشە بەو یەکتاو برۆ بۆلای غوربەت، بزانە دەنگ وباس چییەوبەچوستی بگەڕێوە بۆ ئێرە) پاش عەسرێکی درەنگ بوو لەهەردوولا تەقە دەستی پێکردەوە، شەڕ بەرەبەرە گەرم دەبوو هاشەو ورشەی گوللە لەدۆڵ و چیاکان دەنگی دەداوە، تا دەهات شەڕ گەرمتر دەبوو، دڵبەر خۆی هەڵدا سەرپشتی ئەسپ بە دزە لێکردن پشتی لێ ستاندن دایگرتن.

: لەیل وئاواز لێك جیابوونەوە. هەریەکەو لە قۆلێکەوە دایانگرتن، تەنگیان پێ هەڵچنی بوون . عەریف ڕەزا، شوێنی باشچاوەش قەدۆی گرتەوە. کەزانی تەواو پشتیان لێستاندوون، بیری لەدەرباز بوون کردەوە.! (واچاکە تاخۆر بەدەرەوەیە خۆمان قوتار بکەین).

فەرمانی پاشەکشەی دا بەپۆلیسەکان ئیدی بەقوونە شەڕ کەوتنە پاشەکشە و خۆ قوتار کردن. جەنگاوەرەکان کە دیتیان والە حاڵەتی پاشەکشەدان. بەخەستی تەقەیان لێدەکردن، شپرزەیان کردبوون لەشپرزەییان دووانیان هەڵدێرابوون.

یەکێکیان گردمبڕ قاچی ڕاستەی شکابوو. ئەوەکەی دیکە لەگەڵ هەڵدێران سەری لەگابەردێك دابوو، کەچوونە سەری لەلوغ لوغەی گیان سپاردن دابوو. دڵبەر. کەزانی تەواو شکان پشتیان دا. چیتر تەقەی لێنەکردن. ڕێی هەڵاتنی بۆ خۆش کردن. هەڵتەك هەڵتەك بەرەو ئاوایی زەردەشت ئاوا لەتەشکی خۆیان دا گەڕانەوە.

: پاشان دەستەی دڵبەر یەکدی گربوونەوە. دڵبەر داوای لێکردن. داریان هێنا، دوو دارەبازەیان چێکرد لەناو دارەبازە درێژیان کردن بەچوار دەستە بڵندیان کردن لەسەر پشتی ولاخ توونـد شەتەکیان دان.

دەمەدەمی زەردەپەڕی خۆرئاوابوون بوو. هێواش هێواش بەرەو ئەشکەوتی دێوان گەڕانەوە.

: ئەوەی کەسەری بەگابەرد کەوتبوو. هەر بەرێگاوە گیانی سپاردبوو، ئەوەی کە قاچی شکابوو، هەرچەندجاری ئەسپ لەترەی دەبرد، یاساتمەی دەکرد لەحەژمەت ژانی برینی قاچی وەکو(گا) دەیقۆڕاند.

: قولی بەخۆهاتبۆوە، پەڕۆکێکی سپییان لەسەری ئاڵاندبوو بەجلوبەرگی پۆلیسی وبەسەرو مەندیلی سپی، کت وەت (ئیمام تابوور) بەخۆی بوو، بەدەستی بەستراوە بەتاقی تەنیا لە قولغەیەکیان پەستابوو. دوو ئێشکگر بەدیاریەوە ڕاوەستابوون.

: باشچاوەش قەدۆ، بەدەستی بەستراوە سندەیان کردبووە پێی، لە ژوورێکی تەنیا هەڵقوونجابوو، سەری بەسەر سنگی دا شۆڕکردبۆوە.

: هاوڕێ غوربەت، دەیزانی پوورە سێوە دەستی بەیتاری هەیە بەبەری داگەوت تکای لێکرد. بەڵکو قاچی بۆ بگرێتەوە. پوورەسێوە، ئەگەرچی لەبەردڵی گران بوو، بەڵام چونکی غوربەتی هێندە خۆشدەویست. حەزی نەکرد قسەی لە قسەی بکات. نەبادا لەبەردڵی گران بێت. چوو هەندێك پەلەداری هێنا لەبەردانیشت بەقەڵەم بڕ خۆشیکردن، پاشان پارچەیەك چاوپانی هێنا زەردێنەی چوار، پێنج هێلکەی لەچاو پانەکە هەڵسووێ ئەنجا مەنجەڵۆکێك ئاوی گەرمی هێنا لەبەردەستی خۆی دانا، جوان برینی قاچی شووشت، هێدی هێدی بەشێنەیی دەستی بەجێ شکستەکەدا دەهێنا.

کابرا، لەحەژمەت ئێشوئازاری برینی قاچی ناڵەو هات وهاواری ساتەرێیەك دەرۆیی. پوورە سێوە بەزەیی پێ نەدەهاتەوە، گوێی بەناڵەوکرۆزانەوەی نەدەدا، خەریکی کاری خۆی بوو دەستی لێ هەڵنەگرت تا ئێسقانەکانی خستەوە شوێنی خۆی خوارایی لێبڕی، دواجار پارچە چاوپانەکەی جوان لەقاچی ئاڵاند. پاشان پارچە پەڕۆکێکی درێژی بەشلی لەسەربەستا. ئەوجا یەك یەك پەلەدارەکانی لەبەر ڕاکرد پێی گوت (نابێ یەك حەفتەی تەواو قاچت بجولێنی)دوای حەوت ڕۆژە، هەر ڕۆژەی پەلەدارێکی دەردینا، تا برینەکەی تەواو یەکدی گرتەوە، بۆ هەستانەوە ڕاگرتنی سەنگایی جەستەی شەقڵەیەکی دەدا بن پیلی خۆی، قیت دەبۆوە هێواش هێواش دارە دارەی دەکرد.

: دنیا تەواو ئەنگۆرە بوو، پۆلیسەکان تازە گەیشتبوونەوە دیوەخانی زینەڵ ئاغا، بەسەرهاتی خۆیان بۆ ئاغا دەگێڕایەوە.

ئاگاشیان لە باشچاوەش قەدۆو قولی یاوەری نیەو نازانن چۆن لێیان قەوماو چییان بەسەرهاتووە، لەبەر شپرزەیی خۆیان ئاگایان لەوان بڕابوو هەر هێندەیان پێکرابوو خۆیان دەرباز بکەن.

# (٤٨)

زینەڵ ئاغا گەزانی دەستی لەبنی هەنبانەی بەتاڵ دامابوو. لەقەلیش بوو لەکۆتریش بوودڵی بەوە خۆش بوو.!

دەیگوت: مادام پیاوی دەولەتیان کوشت ئەنجام بەزم خۆش دەبێ. بێگومان هەر ئەمڕۆ سبەی حکومەت لەشکری نیزامی دەنێریتە سەریان دواتر بیری کردەوە چۆن.؟! ئاگری شەڕ خۆش بکات.

(ئێ سبەینێ تاریکو ڕوونی بەیانی خۆم دەچم بۆ خزمەت جەنابی فەرماندار. تیغ تیغەی دەدەم هەرچی زووە لەشکری نیزامی بنێریتە سەریان لە ئەشکەوتی دێوان. دەڵێم پۆلیس چووزانێ شەڕی شاخ وکێو بکات لەبەر بەرتیل وبەرتیلکاری شەڕیان بۆ ناکرێ. کێ.؟! دەڵێ مەسەلەی گفتوگۆو دانیشتن درۆودەڵەسە نەبوو، ئەوەی پۆلیسە فرچکی بەبەرتیل خۆری وەگرتووە. هەموویان بەرتیل خۆرن ئەوجا هەڵتەك هەڵتەك خۆیان کوتاوە دیوەخان. قسەی پان پانم بۆ دەکەن.! (هەرهێندەمان بۆ کرا خۆمان قوتارکەین. نازانین باشچاوەش وقولی یاوەری چییان بەسەرهات). وا دەزانن کەمن کەودەریم هڕەی لەبڕەی دەرناکەم. بەشەرەفم سووڕ دەزانم وا لەئەشکەوتی دێوان بەدیار ئەو دێڵەبابە لێی پاڵ کەوتوون، خەریکی مۆزەمۆزو دەست بازین. ئەوجا پاش چەند ڕۆژی دیکە بەهینکەهینك وپەلە پڕووزێ (سەلام و عەلیك) دێنەوە. ئەوجا نۆبەتی درۆو دەلەسەی باشچاوەشە. چییە.؟!! (بەدیل گیرابووین شەو بەدزی خۆمان قوتار کرد).

بەڵێ وادەزانی زینەڵ ئاغا لەگوێی گادا خەوتووە، چیبکەم شەوە ڕۆژم لێ هەڵاتبا. سبەینێ هەرخۆم دەزانم چ دەکەم.

: باشچاوەش قەدۆ، چەند جاری دیکە میوانداری ماڵی زینەڵ ئاغای کردبوو، دەرگای ماڵی زینەڵ ئاغا بۆ (ئەو) هەردەم لەسەر پشت بوو، هەرکاتەکی بۆی برەخسایە دەگەڵ (نازڵی)ی ژنە گچکەی زینەڵ ئاغا دەکەوتنە غەمزەبازی بۆ یەکدی دەخەنینەوە. کەباشچاوەش لەژوورێکی تاکوتەنیا سندمی لەپێدابوو، ڕۆژێ دووجار.سبەینەوئێوارە دەستیان دەکردەوە بەتەقەتەق وشەقەشەقی سندم بەپێشەخۆیان دەدا، بۆ سەر ئاووکاری پێویست. پاشان لەژووریان دەکردەوە دەرگایان لەسەر کلۆم دەدا. بەشەوو بەڕۆژ هەدووکاتژمێر جارێك بەنۆبەت هەرجارەی یەکێك ئێشکی لێدەگرت.. ڕۆژێکیان خۆر تازە گەزەنگی دابوو باشچاوەش قەدۆ، لەدرزی دەرگاوە سەیری دەرەوەی کرد، دیتی(نازڵی) لەنۆبەتە ئێشکگری دابوو، ئۆخژنی بەدڵ داهات لەناخەوە گەشاوە،

: نازڵی، ئافرەتێکی سووروسپی قژ زەرد چاوشین وباڵابەرز و کەمێك گۆشتن بوو، هێشتا زاوزێی نەکردبوو قیت وقۆزو دڵ تەڕ بوو لەخۆی دەخەفتی، هەردەم دەست وشانەو کلچووك وکلدانی لەشەڕدابوون، لەودیو دەرگاوە دوو، سێ جاران..!
(نازڵی.. نازڵی) بەنەرمی بانگی کرد. نازڵی پشتی خۆی دا دەرگاو گوتی:

- دەنگت هەڵمەبڕە، هەر پێبزانن کارت تەواوە، ئارامت بێ دان بەخۆتا بگرە، هەتا دەرفەتێك بەدی دەکەم، بێ خەمبە باشە.!

- باشە، بەڵام ئەوەش بزانە من لەخەمی خۆم دانیم، لەخەمی تۆدام، بۆیە ئۆقرەناگرم. چونکی هاکازانیت هێزی لەشکری نیزامی دەگەنە ئێرە. ئەگەر دەست پێشخەری نەکەی.؟! کارلەکار دەترازێ، حەیف ومەخابن بۆجوانەکی وەکو

تۆ، دالآش وسیسارکەکەچەڵ لەسەر ئەم بەژن وبالآیە بنیشنەوە، بەدندووکان بکەونە سەر ئەم جەستە نەرم وشلەوچاوت هەڵکۆڵن.

- تۆ ئارامت بێ، تاکو رێگای دەربازبوون مسۆگەر دەکەم، بەلآم بەمەرجێك.؟!

ئەگەربەڵێنم پێبدەی چاوم بەچەهرەی ئەو پیرە کەمتیارە نەکەوێتەوە !! ئەگەر دڵنیابم ! بەهەرچۆنێك بێت دەربازت دەکەم.

- بێ خەم بە نازلی، شەرت بێ لەشەرتی پیاوان لەسەر شانی خۆم هەڵتدەگرم، ئەگەر ئەم شانەم ماندوو بوولەسەر ئەم شانەی خۆمت دادەنێم. دڵنیابە ئازیزم.

: خەریکی ئەم پستەپستە بوون. نۆبەتە ئێشکگری خەجۆ بوو، تفەنگی لەشانی بوو هات قسەی پێبڕین،

# (٤٩)

تازە کازیوەی دابوو زینەڵ ئاغا لێ سواربوو، تەقلەکوت ڕێگای شاری گرتەبەر، چێشتەنگاوێکی درەنگ گەییە جێ، یەکسەر ڕۆیشتە لای فەرماندار. لەسێری هەتا پیازی ئەوەی لەهەگبەی دابوو پێی ڕاگەیاند.!

- قوربان حەیاو ئابرووومان چوو. ئەو شەڕە، شەڕی پۆلیس مۆلیس نییە، پۆلیس چووزانێ شەڕی یاخیبووان بکات، پۆلیس فرچکیان بەبەرتیل و بەرتیلکاری وەرگرتووە .سەرتاپای دەوڵەت بەبەرتیل دەگۆڕنەوە، ئەگەر مەسەلەی بەرتیلکاری نەبێ.؟! هەرچی چەتەی بەسەر ئەم کێوانەوەن، هەر کەگوێ بیستی ناوی باشچاوەش قەدۆ دەبن قاچییان دەلەرزی چوڕە میزە دەیانگرێ، بەقسەی ئەم پۆلیسانەی کە پشتیان دابوو بەپەلە پرووزێ هاتبوونەوە دەیانگوت:

باشچاوەش قەدۆو قولی یاوەری. گوایە بۆ وتووێژکردن چووبوون بۆلای ئەو دێڵەبەبایە، غوربەت، بەڵکو بێ شەڕوشوڕ خۆیان ئەدەنە دەست.

قوربان، من گریانم بەم قسەقۆڕانە نایەت چونکی من دەیناسم ئەو سۆزانییە وابەئاسانی دەست نادات، من دەزانم، کە پوورەئەستی وپوورە زارای لەپێشە خۆی ڕەوانەی لای ئەو کچەتیوە کردبووبێگومان کاکە و برالەی خۆیان کردبوو، شتەکە تەگبیربوو، هەموو شتێکیان براندبۆوە. مانگ لە چواردەوەبێ حەوجە بەئەنگوست ناکات، قوربان پۆلیسەکان دەڵێن (ئێمە لەزارکی گەلی لەسەر قسەی باشچاوەش قەدۆ نەچووینە پێش، پشتی خۆمان لێکربۆوە دەستخەرۆی داین، بەتەمای شەڕنەبووین

هاکا زانیمان لەهەرچوارلاوە درابنە بە ڕێژنەی گوللە، بەسۆلی خۆمان ڕانەگەیشتین. چمە.هێشتیان دەست بۆتفەنگ بەرین. نەخێر! هەربابا بوو

لەهەوڵی ئەوەدابوو خۆی دەرباز بكات. ئێستاش چاومان بەباشچاوەش وقولی نەكەوتەوە، نازانین چیان بەسەرهات).

: قوربان، ئەوانە هەیبەت و كەرامەتی دەوڵەتیان برد، دەبێ كارێكی وابكەین لەدنیا دەنگبداتەوە، ببێتە پەند لەدیوەخانان بیگێڕنەوە عیبرەتی لێوەرگیرێ.

قوربان، دەڤەری ئەشكەوتی دێوان شوێنەكەی سەخت وعاسێیە، مەگەر هێزی لەشكری نیزامی، ئەگەرنا بەتەمای پۆلیس ومۆلیس! لەناوچوونیان زەحمەتە. فەرماندارببەم هوڕینانەی زینەڵ ئاغا فرەدڵخۆش بوو، چونكی دەمێك بووبەناوبانگ وشۆخ وشەنگی غوربەت كەوتبوو، چاوەڕوانی هەلێكی ئەوهابوو بەخۆی بچێتە بەرمەیدان. بەزینەڵ ئاغای گوت:

- باشبوو هاتی ئاگادارت كردمەوە، بەخێربێی.!

سەبارەت بەئافرتانی یاخی بوو، وادیارە شووڵیان لێ هەڵكیشاوە لەتامییان بردووتە دەرەوە وا دەزانن دنیا بێ میروحاكمە، بۆیە ناچارم لەم نزیكانە بەخۆم دێم هەنگێ بەچاوی خۆت دەبینی چۆن.؟ ! تەفروتوونایان دەكەم.

: زینەڵ ئاغا گریانی بەم قسانەی فەرماندار نەدەهات، لەدڵەوە دەیگوت (باشچاوەش قەدۆش هەر بەم (پیك)ە، زۆڕنای لێدەدا) قسەكانی بەدڵ نەبوو، نەشیدەتوانی لەمەپتر پێ لێنێ، هەستاوە سەر پێ گوتی:

- باشەقوربان من هەر ئێستا دەگەڕێمەوە ئاوایی، بەگوندییەكان ڕادەگەیەنم، دەڵێم: جەنابی فەرماندار خۆی تەمشریف دێنێت، وە بۆ میوانداریش چەند كوشتیەك ئامادەبكەن.

فەرماندار گرژییەوە گوتی:

- شتێكی وایان لەگەڵ مەكە نەبادا پێ دڵگیر بن.

- نەخێرقوربان بە پێچەوانە پێ خۆشحاڵ دەبن.

# (٥٠)

غوربەت، خدووی بەوە گرتبوو سبەینان زوو تاوێك پێش خۆرهەڵاتن لەخەوهەڵدەستا.دەچوو لەشوێنەکی بەرز ڕادەوەستا.سەیری دەشت ودەرو لووتکەی بەرزو ڕەوەزە شاخی هەزاربەهەزاری دەکرد.

گوێی بۆ ئاوازی بەسۆزوجۆش و خرۆشی بولبولان ڕادەگرت. هەستی لەقاسپەقاسپی نێرکەوی خورت وجووکەجووکی باڵندەو فڕکەفڕکی باڵی مەلان دەگرت. نیگای دەبڕییە ئەو ڕچەڕێیانەی کە شووروبزنە کێوی پێدا دەهاتنە خوارەوە شۆڕ دەبوونەوە بۆ دەم ڕووبار بێ ترس ودڵەڕاوکێ بەشێنەیی تێریان ئاو دەخواردەوە. بەم دیمەنانە فرە دڵخۆش دەبووکە دەیدیت.! دوو شوور دەبووە شەڕیان دەیزانی بەم سبەینە زووە لەپای چی تێکگیراون.! هۆکار.! ئەو چوشتیلە چاوکاڵەی لەنێوانیان بوو، ئەوان بەربێنگیان لێکدی دەگرت. مەپرسە. تاکو یەکیان ئەوەکەی دیکەی دەبەزاند، کە دەیبەزاند چوشتیلە چاوکاڵ بۆی ڕام دەبوو، پاشان یاغریاغر بەلەوەڕو هەڵبەزودابەز هەوراز دەبوونەوە بۆ دۆندی چیاو حەشارگەی خۆیان. لەوانەش سەرنج ڕاکێش تر ئەوەبوو کاتی دەیدیت ڕەوەی قازوقورینگان لەتاقی ئاسمانەوە ڕیچکەیان بەستووە.زۆر بەشێنەی باڵەکانیان بۆ هەورازو نشێو دەجووڵێنن. لەناخەوە ئیرەیی پێیان دەبرد. لەدڵی خۆی دەیگوت (سەت خۆزگەم بەخۆتان چەند سەربەست و ئازادن لەژیانی خۆتان دا،

لەوانەیە لەناهەنگی بووك گواستنەوەدا بن) وەلێ ئەم سپێدەیە وەکو سپێدەکانی گۆڕین تام وچێژی لەدیمەنە سرووشتییەکان وەرنەدەگرت. چونکی

دووراودوور، تێچاوێکی دابووە (نازڵی) لێی بە گومان کەتبوو.! (ئەوە بۆچی؟! نازڵی چەند وەختە پشتی خۆی داوەتە دەرگا.وەك ئەوەی بەدەرگاکەوە بزمار ڕێژکرابێ ناجولێتەوە. دەترسم(گەرا)دابنێتەوە تووشی گۆبەندمان بکات). لەم خەیاڵانەدابوو، حەیدەرکۆی کوڕەزای پوورەسێوە. شوورەدارێکی بەدەستەوەبوو بەهەڵبەزوو دابەز چووەلای پێی گوت:

(دادەغوربەت،داپیرەم گوتی: قاوەڵتی ئامادەیە بابێ قاوەڵتی بکات).. غوربەت، بۆی داچەماوە هەردوو لاڕوومەتی ماچ کرد. دەستی گرت بەرەو ئەشکەوت هاتنەوە.. پوورە سێوە زۆر هەستیاربوو. لەژیانی دا لەگەڵێك ئاشان باراشی خۆی لێکردبوو. زوو درکی بەگۆڕان دەکرد،کەلەدەست وپاروو خواردنی غوربەت ووردبۆوە. پێ حەسیا لەسەرخۆنییە نیگەرانە،لێی پرسی؟

- کچم غوربەت، دەتبینم باش دانارسێیتە خواردن بۆ.؟!

- هیچ نییە پوورێ، کەمێك دڵم دەگوشرێ، نازانم بۆ.؟!

- گوێی شەیتان کەڕ بێ ڕۆڵە، دەترسێم قۆڵنجت کردبێ. چوونکی وەرز گۆڕاوە لەوانەیە سەرما کاری تێکردبی. دەڵێی چی.

کەوچێك دۆن بقرچێنمەوە جوان چەورت بکەم. نەختێك شان وپیلت بشێلم نەبادا لێت پیربکات.؟

- نا پوورێ، هی ئەوە نییە، هێزم لەبەردا بڕاوە خەو چاوی گرتووم تاوێ دەچمە نا پێخەف چاوم گەرم دەکەم، پاشان بنێرە بەشوێن عەیشان وپەیمان.

کەهاتن بەئاگام بێنە. باشە پوورێ.!

- بێ خەمبە ڕۆڵە برۆ پشووبدە.

: پوورە سێوە ڕملی ئەوەی لێدابوو.! (لەوانەیە کەوتبێتە حاڵەتی بێ نوێژی بۆیە داهیزراوە).

: شەو درەنگ بوو مانگ ئاوابوو، هەور بەری لەئاسمان گرتبوو شەوێکی ئەنگوستە چاو بوو، ناوەناوە دەیپرژشاند، غوربەت ئەگەر چی ئاگاداری هاوڕێکانی کردبۆوە سەبارەت بە (نازڵی وباشچاوەش). ڕێنمایی کردبوون خۆیان لەگورە نەبەن، بەلام لێیان غافڵ نەبن. تاکو بەڕوونی بۆیان یەکلادەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لەهاوڕێکانی دڵنیابوو درێخی ناکەن.

بەلام ئەوەسێ شەوە خەونەچوویتە چاوی خەوی لەچاو خۆی حەرام کردووە. لەژووری ئەشکەوت چراکەی کزکردبوو، لەسەر پشت ناوشانی دابووە بالیف، تاناو قەدی بەجاجمەکی حەوت ڕەنگ خۆی داپۆشی بوو نیگای بڕیبووە بن مێچی ئەشکەوت. بەئەندێشەی خەیاڵ دا کەوتبوو.! (سەری هێران وبنی گەولآن ئەو گەمبۆرەیە، ئای.. زەینەڵۆك شەرت بێ لەشەرتی خوا دەبێ تەنەکەت بەکڵکی وەبخەم).

لەو فکرانەڕاچووبوو، گوێی لەدەنگی فرمەی ئەسپە شێ بوو، دەستی گەیاندە تفەنگ وبەهەشتاوی دەرپەڕی، سەحی کردێ.! تارماییەك لە دەورو خولی ئەسپەشێ دابوو، کە لێی نزیك دەبۆوە، ئەسپی تایین دەیفڕماند هەڵدەستاوە سەرپاشیان بەچەپۆکان بەرانگژی دەبۆوە. نەیدەهێشت لێی نزیك بێتەوە بۆی ڕام نەدەبوو

بەلام هەرچی نازێ وهاوڕێکانی بوون. سەر لەهێوارێوە لەبۆسەدا بوون، سەنگەریان گرتبوو ئاگاداری نازڵی و باشچاوەش بوون، بەلام خۆیان لێ بێدەنگ کردبوون. تاکو بەسەر بۆسەدا دەکەون. ئاگاداری هاوڕێ غوربەتیش بوون کەوەکو پڵنك بەهەشتاوی دەرپەڕییە دەرەوە، تفەنگی لەدوڕ دەستی دابوو، خۆی دابووە پەنا گابەردێك، چاوی دابووە ئەسپەشێ.پەیمان بۆ دڵنیایی وەکو هۆزار بۆی خوێند،لەملاوەش(سۆرەوبۆرە) شالآویان بردبوو تەنگیان پێ هەڵچنی

بوو.بواریان پێ نەدەدا لەئەسپەشێ نزیك بێتەوە. (سۆرەبۆرە) دووسەگی وریا ودڕبوون ئەوە کاپێلکیان بوو، بەکەڵەش زڵ وەکو(هرس) زەبەلاح بوون. دووگوجیلەی ساوابوون شوانکارە بەساوایی کلك وگوێیانی بڕیبوون. بەدیاری پێشکەشی غوربەتیان کردبوو، بەشیری ماین گەورەیان کردبوون، دووسەگی بەئەمەك ووەفابوون، بەڕۆژ قەت خۆیان لەگورمنەدەبرد بەلام کە ئێوارە دادەهات، وەکو جەنگاوەری دڵسۆز بەخاك ونەتەوەو نیشتمان، تاکو خۆر دەکەوتەوە، لەدەوری ئەشکەوت دەسوڕانەوە هێندە هەستیار بوون بەدوای خشەی مار وجریوەی چۆلەکەدا دەچوون شەوێکیان گورگ لەئاغەلان نزیك کەتبۆوە دوای شەڕێکی توونددوخوێناوی گرتبوویان خنکاندبوویان، پاشان هەڵدڕهەڵدڕیان کردبوو، بەلام گورگەکە بۆرەی نەهێشتبوو لەچەند شوێنان زاماری کردبوو، پوورەسێوەدۆن وخوێی تێکەڵ دەکرد وەکو هەتوان لەبرینەکەی هەڵدەسووی و تیماری دەکرد، هاوڕێ غوربەتسەروکەللەی گورگەکەی هیشك کردبۆوە، بەسەر دەرگای ئەشکەوت هەڵیواسی بوو.

: هاوڕێ غوربەت ،هەجارەکی لەگەڵ هاوڕێکانی کۆدەبوونەوە،

سەبارەت بەدوژمنەکانیان ئاماژەی بەکەللە سەری گورگەکە دەکرد دەیگوت (ئەوها بەم شێوەیە پاداشتی دۆژمنەکانتان بدەنەوە بەزەییتان پێیاندا نەیەتەوە، چونکی ئەگەر ئەوان لەدەستیان بێ سووکایەتییان پێدەکەن، ئەوەی بێ نرخ وبێ بایەخ بێ لایان ژنە، قەت ڕێزی ناگرن،پییانوایە کە هەرچی شەڕو ئاشوب و دەردو مەینەتی دنیایە خڕ لەبن سەری ئافرەتانە. قوڕەساخانە کەلەنێوان خویان دا باسی لەمێرخاسی وعەگیدی خۆیان دەکەن دەڵێن: (ئەگەر پیاو لەژنان نەبووایە خەنجەری دەبان نەیدەبڕی). ئەوها بەشان وباڵی خۆیاندا هەڵدەڵێن. پێیانوایەکە قەت ئیشی چرووکیان لێ ڕوونادات، هیزەی خۆیان هەیە. کەچی بێ شەرفانە

دۆنی خۆیان لەهێزەی خەڵكی تر دەكەن، داوەشێن كە قەمیشیان پڕبوو.! دەچنە گژ ماكەرو هێستران، قسە بێتە قسە دەڵێن، نێرینەیە قەیدی چییە. لەگەڵ ئەم قسانە تێكڕا لەقاقای پێكەنینیان دەدا، پاشان پەرتەیان لێدەكرد.

# (٥١)

سۆرەوبۆرە چەنەیان لەسەر هەڵنەدەگرتن سەرومشێنیان کردبوون، خۆیان داببووە پەنا، بەنیازی ئەوەی سۆرەبۆرە هێوربکەنەوە کەلێنەك بەدی بکەن بەماتەمات وقونەدزە بۆی دەرچن، بەلاّم سۆرەوبۆرە سەریان لەسەرهەڵنەدەگرتن.. باشچاوەش قەدۆ بەنازڵی گوت:

- شەو هێندەی وەبەرنەماوە ڕۆژمان بەسەردا هەڵبێ بێگومان وەك (فەرەقەتێ) بەدەست دەمانگرن بەسۆدرەمان دەبەن.

- کارلەکارترازاوە خراپ تێکەوتتین نازانم چارچییە؟

- بەلاّم نیگەران مەبە بای ئەوەندە فیشەکمان هەیە تا دەگەینەنەو شاخێهێ.

- ئەو شاخە ڕێی تێناچێ، ئەودیوی هەڵدێرە دەفەوتێین.

- خەمی ئەوەت نەبی نازڵی چارەی دەکەم.

- بەلاّم لەم بڕوایە نیم بەساغ وسەلامەتی بگەینەنەو شاخە، چکو مسۆگەر دەزانم لەهەرچوارلاوە گەمارۆدراوین دەرچوونمان زەحمەتە.

- زەحمەت بێ، زەحەمت نەبێ، چارنییە.

: سۆرەوبۆرە، چەنەیان لەسەرهەڵنەدەگرتن نەیان دەتوانی بجووڵێن، هەرکە دەجولاّنەوە شالاّویان بۆیان دەبرد.

باشچاوەش قەدۆ زۆر لێیان دەهری ببوو، لەقاران چرکەی لێوەهینا تفەنگی سوارکرد لێی ئاگردان!بۆرە نووسکاندی، هەر ئەونووسکانەوەبوو کە نووسکاندی، پەلەواژی کردبۆوە، سۆرەهەڕووسکاندی، چەند هەنگاوێك لێیان بەدوور کەوتەوە وسەنگراوە.

: دەستی نازڵی گرت بەكوڕەكوڕ هەڵقەنان، بەڵام سۆرە مەیدانی بۆیان چۆڵ نەكرد، شاڵاوی بۆیان بردەوە لەقاق نابوون.

:غوربەت، دەنگی نازێ وهاوڕێكانی دا (دەستوبردكەن نێڵن قوتاربن دایانگرن) باشچاوەش، ناوەناوە خۆی لەگەڵ عاردی دەكردە یەك تەقەی لێیان دەكردەوە.ئەم قوونە شەڕە زۆری خایاند تادەهات دنیای رۆناك دەبوو تا وای لێهات سەگ وگورگ لێك ئاشكرا بوون غوربەت، دزەی كردبوولای خۆرهەڵاتی لێگرتبوون، نەیدەویست باشچاوەش قەدۆ بكوژی، گەرەكی بوو دەستگیری بكات، وەكو بارمتە لای خۆی گلی بداتەوە. زۆر لێیان نزیك كەوتبۆوە، گوێی لێ بوو نازڵی گوتی:

- پێمگوتی هەڵدێرە قوتارنابین.!

- تازە كارلەكار ترازاوە یەك پاكەت فیشەكم ماوە ئەگەر بكەونە بەر سێرەی تفەنگ سێ، چواریان لێ دەكوژم، لەپەلوپۆ دەكەون.. چیتر تاسا ناكەن بەدوامانداببێن وەخەمی هەڵدێرت نەبێ رزگارمان دەبێ.

:غوربەت، تێفكری نەخێر. ئەو ماڵۆسە بەكوشتن نەبێ دەست نادات). هەردووكیان لەپەنای گابەردێك خۆیان مەڵاس دابوو، بۆی نەدەكەوتنە بەر سێرەی تفەنگ. خۆی قایم كرد بەمەبەستی سەر لێشێواندن بەردێكی غلۆركردەوە، باشچاوەش وایزانی پشتی گیراوە، هەستاوە سەرپێ ئاوڕی دواوەی داوە. غوربەت خۆی بۆ ئامادەكردبوو لەگەڵ هەستانەوە لێی ئاگردا، پێكای سەرەنگرێ بوو، تفەنگی دەستی كەوتە عەردی نازڵی زروكاندی وهەستاوەو زوو دانیشتەوە،غوربەت وەك هەڵۆ نیشتە سەریان داچەماوە، تفەنگەكەی هەڵگرتەوە، فێجا چووە سەر باشچاوەش هێشتا مابوو لەگیانەڵڵادابوو ، لوولەی تفەنگی نایە دەمی ئاگری دا، نازڵی، توووند هەردوو چاوی خۆی گرتبوو. نازێ وهاوڕێكانی گەیینە سەریان دەستخۆشیان لەغوربەت كرد، غوربەت زۆر توڕەبوو، لەژیانی دا

هێندە توورە نەبووە چاوی خوێنی تێزابوو، چاوی بەملاوئەولادا گێڕا دیتی.!
سۆرە بەدیار بۆرە مات ومەلوول وەرکەوتووە، هون هون فرمێسکان هەڵدەرێژێ
لێی. چووە پێش لەتەنیشتی هەڵکوڕما، دەستی بەسەریدا دادێناو دەیدوواند.!
(سورەخان، هاوبەشی خەمتین، دەزانم بیرلە بۆرەی هاوڕێت دەکەیتەوە.
بۆرە،لەپێناو ئێمەدا گیانی خۆی بەختکرد، ئەوەتا بەچاوی خۆت دەبینی، خوێنی
بۆرە بەفیڕۆ نەچوو، چیبکەین سۆرەخان زوڵم وستەمی پیاوسالاری ئێوەی بێ
زمانیشی گرتووتەوە، واز لەم ملهوڕیە ناهێنن تا دنیا لەژێر ڕکێفی ئەواندا بی
ڕۆژی خۆشمان لەو ڕۆژە خۆشتر نابێ سۆرەخان، دڵتەنگ مەبە پەیمان بێ
ڕادەسپێرم هاوڕێیەکی وەکو (بۆرە) بەئەمەك وجەسوور بێ بۆت بێنن) لەگەڵ
ئەم قسانە تنۆك تنۆك فرمێسکی بەسەردا دەباران.

: پەیمان لێی هاتە دەنگ:

- غوربەت، تکایە ئەگەر چیتر ئەم قسانە بکەی بائێمەش لەهاڕژنی گریان
نەدەین. بەسە.! پێمان بلێ: چی لەتەرمی ئەو مالۆسە بکەین.؟! تەگبیری ئەم
ماکەرە چییە؟

: بەناو لەپ فرمێسکی چاوو سەر ڕوومەتی سڕییەوە وهەستاوە سەرپێ. زۆر
بەغەزەب سەیری لاشەی باشچاوەشی کرد، لایەکی سەری هەڵگرتبوو گوتی:-

(بەچار دەستە پەلکێشی کەن هەڵیدەنە بنی گەلی).

پاشان نیگای گواستەوە بۆ سەر نازڵی هەڵکوڕمابوو هێشتا چاوی خۆی گرتبوو
گوتی (ئەم کارە گشتی لەژێر سەری ئەم دۆخین شلەدابوو، هەر دۆخین شلەکی
ئەوهایە حەیاو حورمەتی ئافرەتان دەبات، پیاو،چ حەددی هەیە، قەت تاسا ناکات
ئەگەر ئافرەت خۆی بۆ شل نەکات، ناوێرێ لەئافرەت نزیك بێتەوە. ئەگەر ئەم
سەرکزە لەوە پێش ئەو گەمبۆرەی بەخۆی فێرنەکردبێ.؟.! خۆ ئەو تەرمسە

قوزەکەمتیاری لەباخەڵدانەبوو ئەوها زوو دەستەمۆی بوو) بەم قسەیە نازێ وپەیمان پێکەنین و توونند دەمی خۆیان گرت، غوربەتتەواو هەڵچووبوو. قەت بەم شێوەیە بەسەریاندا نەیگوڕندبوو، وەك ئەمجارە کە بەسەریاندا گوڕاندی.!!

(ئەوە بەچی پێدەکەنن.!! کەی ئێستا کاتی پێکەنینە بەزمییتان بەم چاومۆنەدا نەیەتەوە، ئەوە ژنی بن چۆکی دەیوسەکی ئەوهایە. هەموو ژیانی بەفرت وفێڵ وفێڵە حیزە وداوێن پیسی بردووتەسەر، ئەم ماکەرەش تەواو سوخەتی ئەو گەلۆرەی هەڵگرتووە. لەختوخۆڕا نەیانگوتووە.!

(کەر لە کن کەر ببەستیەوە یان سوخەتی هەڵدەگری یان ڕەنگی). تاوێ بێدەنگ بوو، پاشان دەنگی دانیاڵڵا دەستوبردکەن چاوی ببەستنەوە بۆم ئێستا تەگبیری دەکەم) چاویان بەستەوە بردیان لەسەر بەردێکی زەلام پشت لەهەڵدێر ڕایانگرت، سێرەی تفەنگی لێگرت پەنجەی لێ بزاوت لەهاڕژنی دا. تەختی نیوچەوانی پێکا بەپشتدا وەرێگێڕا، تاکو بنی گەلی خلۆر بۆوە گیرنەبوو، تاوێ سەیری بنی گەلیان کرد، پاشان بەبێ دەنگی گەڕانەوە.

# (٥٢)

پوورە سێوە وەکوبەیتاری کارامە، ڕۆژەك نا ڕۆژەك پەلکەدارێکی لەبەرقاچی هەڵبەستراوی هەیتە لاق شکاوەکە دەردێنا. بەدارە دارە کەوتبوو. کەمێك دەلەنگی، برینی سەری (قولی)پڕ ببۆوە، شوێنەکەی سۆر دەچۆوە. پوورە سێوە تیتالی پێدەکرد دەیگوت (یاخوا پیرۆزت بێ، نیشانەکی جوانە، کتومت ((داغمە))ی شوانکارانە.. شوانکارەکان داغمە ((مۆر))ی تایبەت بەخۆیان هەیە. گوێچکی مەڕومالاَتی پێ نیشان دەکەن، ئەگەر مەڕیان لێ بدزرێ یەکسەر دەچنەکوشتارگەو گوزرەری قەسابەکانی شار، دەگەڕێن بەداغمەی تایبەتی خۆیان لەسەرگوێی مالاَتەکانیان بەم داغمەیە بەسەری دەکەنەوە.. تۆش بێ خەمبە، ئەگەر لێرە بەدواوە بزریش بی.!! بەم داغمەیە دەناسرێیتەوە).

: قولی لەحەیبەتان لێوی خۆی دەکرۆژتەوە سەری بادەدا لەدڵی خۆی دەیگوت (پیرەژنەکی چەنەبازە دەرسی لەشەیتان وەرگرتووە). دوای نوێژی شێوان دنیا ئەنگۆرەبووغوربەت، ناردی (قولی و هەیتە) هاوکارەکەیان هێنان، پێی گوتن (شوکری خودابکەن. مەمنوونی پوورەسێوەبن زۆر پێتانەوە ماندووبوو، ئێستاباشن. دەزانم هەر دووکتان خێزاندارن غەریبیان دەکەن ئەوانیش چاوەڕێن، لەبەر خاتری زارۆکەکانتان هەر ئێستا دەتانئێرمەوە، بڕۆنەوە ناو ماڵ ومنداڵ وعەیالی خۆتان. بەلاَم هەرچی لێرە لەئەشکەوتی دێوان. ئەوەی بیستتان وئەوەی بەچاوی خۆتان دیتتان. ڕاست وڕەوان بۆ گەورەکانتان وبۆ خەڵکی دیکە بیگێڕنەوە.

چونکودەزانم بەکوشتنی باشچاوەش قەدۆ.دەوڵەت لێمان بەرق ڕاچووە،وە ئەو گەمبۆرە زینەڵ ئاغا، پروپاگەندەی ئەوەمان بۆ دەکات گوایە هەرکێ بە(دیل) بکەوێتە بەردەستمان دەیکوژین ئێوە هەردووکتان ئەگەر زەڕڕەیەك ویژدان و هەبێ بەرپەرچی ئەم قسانەی دەدەنەوە، ئێمە باشچاوەش ونازلێمان لەسەرناپاکی کوشتن، ئەوها بەخێزان ومنداڵەکانی باشچاوەش بڵێن. بابزانن لەسەرچی کوژراوە.!! بەزینەڵ ئاغا بڵێن: بادەوڵەتمان لێ گاڵ بدات، قەیدی ناکات بەزمانی من پێی بڵێن (شەرت بێ دەبێ کارێکی ئەوهای پێبکەم، گوندی زەردەشت ئاوای لێبکەمە حەسرەت، دەبێ بەم خەفەتەوە بەزگ بدات) پاشان هەریەکەو هەندێك پارەی پێدان پێی گوتن: ئەوە بۆ خەرجی منداڵەکانتان. شار گرانییە پێویستتان پێدەبێ). دواتر بانگی نازێی کرد پێی گوت:

- نازێ، خۆت ودوو جەنگاوەری دیکە هەر ئێستا سواربن تادەگەنە تخووب وئاقاری گوندی زەردەشت ئاوا.لەوێندەرێ بەرێیان بکەن. دواتربەگوێیداچرپاند.! وریای خۆتان بن هەر پەل بزاوتنەك جوولەیەکتان هەست پێ کرد. ساردیان بکەنەوە، باشە.

- بەڵێ هاوڕێ دڵنیابە.

: قولی، دوو، سێ هەنگاوچووە پێش گوتی:

- رۆڵە غوربەت، ڕاستیت دەوێ من لەلای خۆمەوە سەبارەت بەتۆ، خۆم بەشەر مەزار دەزانم، چونکو زۆر بەسەهودا چووبووم، بەجۆرێکی تر بیرم لەتۆدەکردەوە، بۆیە داوای لێبووردن دەکەم. پەیمان بێ لێرە بەدواوە وەکو کچی خۆم سەیرت دەکەم و ئەوەی لەدەستم بێ درێخی ناکەم. بەپێی توانا دەستی هاوکاری ویارمەتیت بۆ درێژدەکەم.

- سوپاسی هەستی بەرزت دەكەم، مۆرڤـ شیری خاوی خواردووە لەگینە بەسەهوودا بچی، قەیدی چییە.

: پشتی هەنگێ ولاّخیان بۆ هێنان سواربوون بەرێكەوتن.

: دەنگوباسی كوشتنی باشچاوەش قەدۆ وەكو بروسك لەشار دەنگی دابۆوە، لەچایەخانەو لۆقنتە ومزگەوت ودیوەخان باس هەر ئەو باسە بوو، زۆر بەگەرمی لێی دەدوان.

- مخابن بۆ باشچاوەش قەدۆ، بەدەستی ژنان هاتە كوشتن، چۆن كوژرانێك.؟!

دەڵێن: دوای ئەوەی ئەم كچەتیمە بەفرت وفێڵ فریوی دابوو، بەناوی داوەت ژەهری دەرخوارد داوە كە بێ هۆش بووە، ئەنجا بەدیلی گرتوویانە هەردوو دەستیان لەپشتەوە شەتەك داوە لەگەڵ خۆیان بردوویانە بۆ ئەشكەوتی دێوان. سندمی ولاّخیان لەپێی كردووە بەسووژن چاویان هەڵكۆڵیوە. دوای چەند ڕۆژان كوشتوویانە، دواتر لەبنرا(لەشیان) بڕیوە، دوای ئەو عەجەمەرگییە (سنگ)یان تێبڕیوە، پاشان بەچوار دەستە هەڵیانداوەتە بنی گەلی.

: هەرچی كیرمیز بوو تفوو نەفرەتیان بۆ هاوڕێ غوربەت و كیژگەلی ئەشكەوتی دێوان حەواڵە دەكرد.

: بەلاّم هەرچی ئافرەت ومێینەبوو بەكوشتنی باشچاوەش قەدۆ شادو دڵخۆش بوون. لەپێش قاپی و سەرەكۆلاّن، لەپێش دەرگای دوكانی سەوزەفرۆش، نانەواخانە، گۆشت فرۆش، دوو، دوو، سێ، سێ كە یەكدی گر دەبوون پستە پستیان بوو، دەستخۆشیان لەغوربەت وهاوڕێكانی دەكرد.! دەیانگوت (خوادەیكرد ئەوەی پیاوی زاڵمە بەم دەردە دەچوو حەقە مستیان بێ، ئەگەر ئەوها لەقەوچەیان بدەنەوە قەپۆزیان تێك بشكێنن نابنە كەڵەگا بەسەرمان، ئەم دكرەمان پێناكەن، وادەزانن ژن نۆكەری پیاوە، خۆنۆكەرنین، وەكو ئەوان كار

دەکەین. ماڵداریان بۆ دەکەین، بەدیاریانەوە شەونخونی دەکەین، خزمەتیان دەکەین، نینۆکمان نەماوە هێندەی ڤرێژی پشتەملی کراسیان بشۆین، لەدزوونیان گرووبن.؟! لەدەستیان نایەت خزمەتی خۆیان بکەن، ئەوجا بەهۆی شتێکی بچووك کەبەدڵیان نەبوو، بەتەڕ دەستی سێ پلووکە بەردان هەڵدەگرنەوە!! (یەك.. دوو.. سێ) بەهەرسێ تەلاق سوێندەکی مزر تێدەکوتن، پاشان بەهەردوو دەستان (لۆلکە)ی دەخۆن ئەوجا شێخ وسەیدومەلاو زانای ئاینی نامێنێ خۆیان دەخاڵەت نەکەن. دەکەونە سەر دەستوپێیان، دواجار کۆلکە مەلایەك فتوایان بۆ ئەدات.! بۆ تەنها شەوێك لە(مەسینەی گڵ) مارەی دەکەن. بەمەرجێك.؟! ئەو شەوە تاکو بەیانی دەبێ بووکەخان چەند جارێك مەسینە دەعەمەل بێنێ، ئەگەرنا.؟! تەلاقی چاك نابێتەوە. بەم فرت وفێڵە بۆی پینە دەکەن کەشەوی بووك وزاوایەتی تەواو بوو، لەگەڵ گەردی بەیانی دەرگالە مەسینە دەگرن ووردوخاشی دەکەن دەیشکێنن، چونکی نتقی نیە تەلاقی بدات تاکو مارەیی لێ بەتاڵ بێتەوە ناچار دەیشکێنن. سەیرە.! عوزریان لەقەباحەتیان گەورەترە. ئەگەرنا، تفێك کەڕووکرا، چۆن هەڵدەگیرێتەوە.؟! وادیارە هێشتان نازانن تفی سەر هەوراز بەڕووی خۆیان دەکەوێتەوە. ئەگینا هەرگیز لەپای شتێکی کەم وەکو بەڕووی برژاو بەڕووی ئافرەتان دا نەدەتەقینەوە).

: لەم بارودۆخە ئاڵۆزو نالەبارەدا تەنها دێوەرەو ڤاچاخچی بازاڕیان گەرم و بەهەرمێن وسوود مەند بوون، وەلەپای ئەوەی غوربەت دەمیانی چەورکردبوو چەش ببوون، بۆیە هەرچییەکی لەئارادابووایە بەکیژگەلی ئەشکەوتی دێوانیان رادەگەیاند. پێیان ڕاگەیاندبوون.! (دوو ڕۆژبوو بەڕێوەبوون، بەمەبەستی ئەوەی بای پێیان بدەن، لەدەرەوەی ئاوایی زەردەشت ئاوا خیوەتیان هەڵدابوو، لەشکرێکە بەژمارە زۆرو پڕچەکن.. شەوی ڕابردوو دەستەی هەیاسە شەل لەکاتێکا شەو

ڕاكشابوو، هێشتانەكێ بانگی نوێژی بەیانی نەدابوو، بەخواستی زینەڵ ئاغا لەچوارلاوە بەدمستڕێژ دایانگرتبوون، هەتا ئەوان بەخۆكەوتبوون، دمستەی هەیاسەشەل تێیان تەقاندبوو خۆیان گەیاند بۆوە مەكۆی ئەشقیایان. زینەڵ ئاغا، وای لەگوێی جەنەڕاڵ (یەڵماز) فەرمانداری لەشكری نیزامی پەستابوو، ئەو دمستڕێژەی شەوی ڕابردوو، كەرخی كیژگەلی ئەشكەوتی دێوانە، بوونەتە كەڵەگا دمستناپارێزن. جەنەڕاڵ یەڵمازچەندین بەرهەڵستكاروشۆڕشی دیكەی تەفروتونا كردووە لەناوی بردوون، بەم سەردولكەو نەزیرۆكانەی زینەڵ ئاغا گریانی نەدمهات، بەلاّم لەدڵەوە گەڤ لەغوربەت دەكرد.! (بابۆت بمینێ لەناو دوونانی گەرم شەرت بێ دمبێ هەرلەئەشكەوتی دێوان پەڕۆت پێ سۆر بكەم).

: لەلایەكی دیكەوە كیژگەلی ئەشكەوتی دێوان خەریكی خڕكردنەوەی دارو دەوەن وپووش وپەلاش بوون، لەزاركی گەلی لەمبەرو ئەوبەر ئەم دارو پووش وپەلاشەیان هەتا دمگاتە ناوەڕاستی گەلی لەسەریەكدی دانابوو، ناوەناو چنگێك( بارووت) یان بەسەردا دەكرد، هەردوو شەقاوسێ شەقاو فیشەكەكیان دەخستەبنی، دواجار نەفت ڕشێنیان كرد، وەلەبەرزاییەكانی ئەمبەروئەوبەری گەلی بەتاشەبەرد مەتەرێزی كەڵەكچنیان كەڵەك كرد، چاوەڕوان بوون بزانن چارەنووس بەچی دمگات.؟!

# (٥٣)

پوورە سێوە وحەیدەرگۆی کوڕەزای لەناو ئەشکەوت لەتەنیشت غوربەت پاڵیاندابۆوە، حەیدەرگۆ خۆی بەباوەشی داپیرەی وەنوساندبوو خەوی لێکەوتبوو. پوورەسێوە بێداربوو ئاگای لێبوو غوربەت لەخەودا ڕاچڵەکی، لەجێوە نیوڕاست بۆوە. هەموو گیانی نقوومی ئارەقەبوو. پوورەسێوە لێی پرسی؟

- هارۆڵە چبوو.؟! خەونت دیت.؟!

- بەڵێ دایە خەونێکی سەیروناخۆشم دیت، لەخەونمدا بوو دووکەڵێکی سوور وەکو گەردەلوول بەعاسمان داهەڵدەچوو. لەم خەونەدا پشیم سواربووبوو هەناسەم نەدەهات.

- ئەگەر خەونی خێرە.؟ بەخێر بگەڕێ.

ئەگەر خراپە.؟! گوێی شەیتان کەڕبێ بەخێربگەڕێ، هەراسان مەبە ڕۆڵە، دووکەڵی سوور مانای زاڵبوون وسەرکەوتنە، پاڵدەوە باگیانت ئاسودە بێ. بۆ سبەینێ دەمەدەمی نوێژی نیوەڕۆبوو، خۆرەتاوەکە زۆر گەرم بوو، گەرمایەکەی بەتێن بوو، سەری کەچەلانی دەسوتاند، هێلکەی دەبرژاند، گەرمایەکی کوشندەبوو، برکی دەکرد، داروبەردی داخ کردبوو، هەڵمی لەزەوی بڵنددەکرد بەئاسماندا هەڵدەچوو، لەترسی گەرمی خۆرەتاوەکە ئەوەی باڵندەیە بەئاسمانەوە نەدەبینرا، نەبادا پەڕوباڵیان هەڵبکڕووزێ، تەنها لەخۆرئاوای گەلی تۆز بەری لەئاسمان گرتبوو، تادەهات لەزارکی گەلی نزیك دەبۆوە، تیپی سوارە لەپێشەوە بوون،

پیادەڕۆ بەگورگە لۆقە بەدوایاندا دەهاتن، خۆیان لێ بێدەنگ کردن هەردەهاتنە پێش جەنەڕاڵ یەڵماز، بەسواری ئەسپەکی خورمایی لەپێشەوە بوو. ئەسپ هێندە خورت بوو سینگی دەرپەڕاندبوو گوێی مووچ کردبۆوە.. هەردەهاتە پێش دوایی وبەرایی لەشکر گەییبنە ناوەڕاستی گەلی، تەواو کەوتبوونە ناو بۆسە، لەهیکڕا دیتیان بڵێسەی ئاگر لەپێشەوەو لەمبەروئەوبەری گەلی لەدارو دڕك بەرزبۆوە، ئاگر چ ئاگر!! وەکو(مار)ی بریندار دەیفیشکاند. کەوتنە ناو بڵێسەی ئاگر گەمارۆدران، گوللە وەکو بریشکەی سەر ئاگری داربەڕوو دەتەقییەوە. لە هەردوولاوەش درانە بەر دەستڕێژی گوللە وەکو تەزرە بەسەریاندا دەباری کردبوویانە خەجەڕۆ لەسەریان. ئیدی بڵێسەی ئاگرو هەلآوەی گەرمی و بۆکروزی سۆتانی زیندەوەری خشۆك وحیلەحیل وفرمەفرمی ئەسپان و هاشەی گوللە تێکەڵ ببوو. مەپرسە چ ڕۆژە ڕەشێك بوو. تێکەوتبوون بەتەواوی چاشمیش ببوون کەڵکی دەستوەکەری و دەست هەڵێنان نەبوو. ناچار بەپرەپر کشانەوە. بەڵام لەزارکی گەلی بەدوورکەوتنەوە. خڕبوونەوە باریەکدی دواتر خێوەتیان هەڵدا بنەوبارگەیان بەعاردی دادا.

# (٥٤)

غوربەت، دڵنیابوو لەوەی کە جەنەراڵ یەڵماز پیاوێکی شەڕانگێزە بەهەومنتە وازناهێنێ، وابەئاسانیش ناکەوێتە داو، کە بنەوبارخانەی بە عاردی داداوە بێگومان بەنیازی زەبروەشاندن خەریکی نەخشەو پیلانە. بۆیە لەبیری ئەوەدابوو ئەگەر دەستی خۆیان بەپێش نەخەن.؟! ئابڕوویان دەبەن.

:بەڵێ، تاریك کەوتبووە عەردی، سێ چوار ئەسپ سوار لەئەشکەوتی دێوان ڕابەنشێودا شۆڕبوونەوە، بەقاچاخەڕێدا بەرەو گوندی زەردەشت ئاوا تێیانتەقاند.. شەو ڕاشکابوو لەهەوراز ئاوایی گیرسانەوە دابەزین، هەوساری ئەسپەکانیان لەبنەدار گرێدا. خەجۆ، لای ئەسپەکان ماوە، هەردووکیان بەپانادزە خۆیان گەیاندە بن دیواری ماڵی زینەڵ ئاغا. نازێ داچەماوە پشتی بۆ پەیمان داناوە چووە سەر پشتی، نازێ کەمێك پشتی ڕاست کردەوە بڵندی کرد، پەیمان بەهێواشی خۆی هەڵدایە سەردیواری حەوشەو بەئەسپایی خۆی پێدا شۆڕکردەوە دابەزی. هەرلجێوە تاوێ خۆی ماتکرد، هیچ لەگۆڕێ نەبوو، دواتر لەسەر پەنجەی پێ ڕۆیی خۆی گەیاندە دەرگای حەوشە شمشێرەی دەرگا ڕەپێش کرابوو، بەپەنجەی دۆرە درێژە پشکەی شمشێرەی ترازاند، بەئاسانی شمشێرەی ڕاکێشا دەرگای کردەوە، وێجا (نازێ)یش چووە حەوشە. تاوێ هەستیان لەخۆیان بڕی هەست وخوست نەبوو، پاشان لەپەنجەرەی سەرەوە سەریان بەژووری زینەڵ ئاغا دا هەڵکێشا، ئاغا، بەتاقی تەنیا بەتای کراس ودەرپێی سپی لەسەرلاتەنیشت ڕاکشابوو. دەتگوت گامێشە لەگەرمان دەهەژێتەوە مشەمشی بوو. دەرگایان لەڕێسمەبرد، چوونە ژووری هێشتا پرخەی دەهات.

نازێ، خەنجەری لەسەرگەردەنی دانا، پەیمان سەرەسمکەکی خێواندە قەبرغەی. کەلەکەی وەرگێڕا، چاوی هەڵێنای چی بینی.؟!! دووچەکداری دەمامکدار پێی وابوو خەونە، یان چاوی ڕەشکەوپێشکە دەکات. جاجمەکەی لەپێنگانێ گەوتبوو، خەریکبوو بەسەرخۆیدا هەڵکێشێتەوە پەیمان لچکی جاجمەکەی گرت تێیهەڵدا پێی گوت:

- هەستەوە ماڵۆس نقەت لێومنێ ها.! ئەگینا بەم خەنجەرە قرقرتۆکت هەڵدەبڕم.

- ئێوەکێن.؟! چیتان لێم دەوێ.؟.!

- بەگۆتەی خۆت، ئێمە دەلیسەکانی ئەشکەوتی دێوانین لەجیاتی عیزرائیل هاتووین رۆحت بکێشین. دواتر بەدۆخینی خۆی لەپشتڕا هەردوو دەستیان شەتەکدا بەجەمەدانی چاویان توند بەستاوە دواتر نازێ چوو لە تەویلە بارگینەکی کورتان کرد هێنای سواری بارگینیان کرد، بەگوریس هەردوو قاچیان لەبن زگی بارگین بەستەوە، نازێ ڕێشمەی بارگینی بەدەستەوە گرت بەدوای خۆیدا ڕایکێشا، پەیمان لەدواوە پەنجەی لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگ دانابوو کەلەئاوایی چوونە دەرێ

گەیشتنەوە خەجۆ، هەوساری بارگینیان لەتەنکێشی ئەسپی نازی گر ێدا، لێ سواربوون قەتارکێشیان کردوبەقاچاخەرێدا گەڕانەوە ئەشکەوتی دێوان.

تاریکو ڕوونی بەیانی گەیینەوەجێ. لەسەر پشتی بارگین دایانبەزاند چاویان کردەوە بردیان لەبنەدارێك بەستیانەوە.

:بەیانی دوای خۆرکەوتنەوە غوربەت گۆپاڵەکی کنێری بەدەستەوە بوو چوو تەماشای بکات، ئاغا سەری بەسەر سینگی دا شۆڕببۆوە، خەوەکووتکەی گرتبوو، چاوی هەڵنەدەهات ملی ڕانەدەگرت،

غوربەت، گۆمكی گۆپاڵی نایە ژێر چەنەگەی سەری ڤیت كردەوە چاوی هەڵێنا كەچاوی بەغوربەت كەوت چاوی داگرتەوە. غوربەت پێی گوت (چاوت دامەگرە پیاو، مەترسێ بەكوشتن ناتكوژم، بەلاّم بەعەجەمەرگی دەتكوژم، چونكی تۆ.! سەری هێران وبنی گەوارانی) ئەوە هەموو لەبەر جەورو ستەم وزۆرداری جەنابتە ئێمەی بەكێوان خستووە. پاش تاوێكی تر دەستت دەكەمەوە، بەلاّم سندمت دەكەم! وەكو ولاّخ سندم دەخەمە قولەڤاپت.

# (٥٥)

دەنگوباس گەرم بوو .! ئەوە یەك حەفتەیە زینەڵ ئاغا لەئەشکەوتی دێوان لەبن ئیشیان کردووە بەردی پێدەکێشنەوە. لەگەڵ گزنگی خۆرەتاو تاکو زەردەپەڕی ئێوارە بەردی پێدەکێشنەوە. لەملاوە (ئەنجومەنی ئاغاکان) لەشار تەنگیان بەبەرپرسانی دەوڵەت هەڵچنی بوو، داوای ئازادکردنی (ئاغا)یان لەحکومەت دەکرد، بەرپرسانی دەوڵەت داوایان لە( جەنەڕاڵ یەڵماز ) فەرمانداری ناوچەکە دەکرد. (دەبێ بەهەرشێوەیەکی دەسازێ زینەڵ ئاغا لەدەستی کیژگەلی ئەشکەوتی دێوان ڕزگاربکات ئەگەرنا..). جەنەڕاڵ یەڵماز هانای وەبەر کێخوای گورجیزادان برد بەڵکو چارەیان بکات.

: کێخوای گورجیزادان، مرۆیەکی بەهەیبەت وشان وشەوکەت بوو، لەگەڵ غوربەت نێوانیان زۆر خۆش بوو زۆر ڕێزی لەکیژگەلی ئەشکەوتی دێوان دەگرت بەتایبەتی غوربەت، ناوەناوە (شەك)ەکی بەدیاری بۆیان دەنارد، سەریان دەبڕی دەیانکوشتەوە. کێخوا گفتی بەجەنەڕاڵ دابوو پێی گوتبوو. (هەوڵدەدەم درێخی ناکەم بزانین چارەنووس بەچی دەگات).؟!

: کێخوا سەرلەسبیانێ زوو سواربوو بەهەورازدا بەرەو ئەشکەوتی دێوان هەڵکشا ڕۆیی. هێشتا مابوو بگاتە دەروازەی ئەشکەوت. غوربەت، بەپیریەوە چوو، زۆر بەگەرمی و بەرێزەوە پێشوازی لێکردبەخۆی جڵەوی ئەسپەکەی گرت هەتاکو دابەزی، وێجا دەستی ڕامووسی ئەویش نیوچەوانی ماچ کرد، دواتر بەپێشەخۆی دا چوونە ناوئەشکەوت غوربەت فەرمووی لێکرد.! (باوکە فەرمووە لێر دانیشە).

کێخوا لەسەر(لباد) دانیشت دیسان بەخێرهاتنی لێکرد.

- باوکە بەخێربێ ی، سەرسەروسەرچاوم،

- سەرت سەلامەت بێ چاوت ڕۆشن بێ کچم. دوای چاخواردنەوە و باس و خواسی دونیا، کێخوا گوتی:

- کچم غوربەت، ئەمجارمیان بۆکاری پێویست هاتووم بۆ لای کیژی خۆم داواکارییەکم هەیە، لەم بڕوایەدا نیم ڕووشکێنم بکەی، بەدەستی واری بم نێریتەوە.

- باوکە من هەرگیز لەدەسەلأت وتوانامدا نیە قسەلەقسەی بەڕێزتان بکەم بفەرموو بزانم چت دەوێ.؟!

- کچم غوربەت، دەوڵەت لەسەر فەرمانداری ناوچە جەنەڕاڵ یەڵمازی کردووە. (دەبی بەهەر شێویەکی هەبێ هەرچۆنی دەگونجێ دەبێ زینەڵ ئاغا ئازاد بکات).

: جا جەنەڕاڵ یەڵماز، هانای وەبەر من هێناوە، منی ڕاسپاردووە هاتووم داوای ئازاد کردنی (ئاغا)ت لێدەکەم، ئێوەش لەبەرانبەردا هەرداخوازیەکی هەتانە پێمبڵێ بزانم هەتا بیری لێبکەینەوە.؟! غوربەت، تاوێ داما پاشان پێی گوت:

- باوکە، ئێستا دەمەدەمی نیوەڕۆیە، پورە سێوە خوانچەی ئامادەکردووە، بانانەکەمان بخۆین دواتر قسەی لێدەکەین. غوربەت، لەگەڵ سەر دەستەکانی کیژگەلی ئەشکەوتی دێوان سەبارەت بەداواکەی(کێخوا) گفتوگۆیان کرد، دواجار لە پێناوی ئەوەی خوێن نەڕژێ، زینەڵ ئاغا ڕادەستی کێخوا بکەنەوە ئازادی بکەن، بەلأم بەمەرجێك.؟! ئەو لەشکرەی لەدەروازەی گەلی مۆڵیانداوە، بیگەڕێننەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتوون. ئیدی کێخوا سەبارەت بەم مەرجە هەستا ڕۆیی.. بزانی تامی زاری جەنەڕاڵ چییە.؟! دوای دوو ڕۆژان هاتەوە

بەزمانی جەنەڕاڵ گفتی پێدان مەرجەکەیان جێ بەجێ دەکات، کێخوا زینەڵ ئاغای لەگەڵ خۆی بردەوە.

بەلاٌم هەروەکو دەڵێن (ئەوەی لەتوخمی مشك بێ هەمبانەدڕە). چونکی مرخی خۆی لەغوربەت خۆشکردبوو، جەنەڕاڵ بەهەمان ڕەوشت لەبەر فێڵدابوونەگەر چی، پاش عەسرانێکی درەنگ بنەوبارگەیان پێچاوە گوایە پاشەکشە دەکەن،

کەچی کەتاریك گەوتە عاردی هەیاسە شەل ویاوەرانی دەمامکیان دابوو ئامادەبوون. وێجا لەشکریان کردە دووبەش، دوو تیم، تیمێکیان بەقاچاخەرێدا سووران دەم ڕووباریان لێگرتن، تیمەکەی دیکە ئەمبەروئەوبەری زارکی گەلییان لێگرتن خۆیان دامەزراند. خۆرەتاو تازە گزنگی دابوو، غوربەت هەروەکو سبەینانی رۆژانی رابردوو پێش بەرچایی کردن دەچووە سەر لووتکەی شاخێك ڕادەوەستا تەماشای جوانی سرووشت وژینگەی دەکرد، گوێی لەقاسپەقاسپی نێرەکەوی خورت وسەدای بولبولی خۆشخوان وئاوازی بەجۆشی وخرۆشی مەل وباڵندان دەگرت، بەتایبەتی دڵی بەوەخۆش دەبوو کە دەیدیت.! شوورو بزنەکێوی لەچیا شۆڕدەبوونەوە بۆسەر ڕووبار لەدەراو تێر ئاو دەخۆنەوە. دواتر بەلەوەڕو شەرەقۆچ وهەڵبەزودابەز بەرەو دۆندی چیا هەوراز دەبوونەوە. بەلاٌم ئەمڕۆ نەقاسپەقاسپی کەو، نەسەدای بولبول، نەئاوازی مەل وباڵندان، نەهەڵبەزودابەزی شووروبزنەکێوی. دنیایەکی بێ هەست وخوست. تەنها (٣) سوار لەڕێچکۆڵەی نێوان ڕووباروئەشکەوتی دێوان بەڕێوەبوون ئالأیەکی سپییان هەڵکردبوو دەهاتن. دیقەتی دانێ.! یەکێك لەم سوارانە (غەرگە)یەکی کەوڵەکێوی پۆشی بوو، سواری ئەسپێکی ڕەشی قەترانی بێ نیشان بوو، ئەوە.! هەیاسەشەل بوو چەتەی کێوان. سوارەکەی دیکە پۆشاکی ڕەسمی لەبەردابوو. سواری سێیەم،هەردوو دەستی

بەسترابۆوە دابوویانە پێشەخۆیان دەهاتن، ئەوەیان کێخوای گورجی زادان بوو، وەکو بارمتە بەپێشەخۆیان دابوو، غوربەت، تێگەیی جەنەڕاڵ لەبەرفێڵدابووە لەگفتی خۆی پاشگەزبوویتەوە، بێگومان کێخوا سەرکۆنەوە سەرزەنشتی جەنەڕاڵی کردووە، بەقسە تێکگیراون ئەویش لەرکان بۆ سووکایەتی پێکردن پەلبەستی کردبوو، سواری ئەسپیان کردبوو دابوویانە پێشە خۆیان.

: کیژگەل دەرپەڕین، لەمبەرونەوبەری ڕێگا سەنگەریان لێگرتن بەتەنها غوربەت لەناوەڕاستی ڕێگا چەقی بوو چاوەڕوان بوو هەیاسەشەل دەنگی هەڵێنا گوتی:

- من هەیاسەشەلم گورگی کێوان، ڕاسپاردەی جەنەڕاڵ یەڵمازم، ئەوەش بزانە هەردەست بزێویەکی بکەن.؟! لەجێوە کێخوا سارد دەکەمەوە دەیکوژم گوێبگرە.! هاتووم پێتان ڕابگەیەنم بەبێ تەقوتۆق وخۆبادان، چەکەکانتان دانێن خۆبدەنە دەست، ئەگەرنا.؟! لەهەمووولایەکەوە دەورەدراون ڕزگارتان نابێ، هەر ئێستا وەلأمم بدەنەوە، بەڵێ، یان نا!!

: غوربەت، پڕلەحەژمەت وپەرۆشی بۆ کێخوا، نیوچەوانی گرژبوو لۆچی تێکەوت. لەقاران لێوی خۆی دەکرۆژتەوە لەوەلأمدا پێی گوت:

- بەگەورەکەت بڵێ، غوربەت دەڵێ(قاسید گوی خوارد). چونکە ئەم کارەی ئێوە سەبارەت بەکێخوا کارێکی نامەردانەیەپێی بڵێ: غوربەت دەڵێ: ئەگەر نەمرم ئەوەی لەسەرناچێ دەبێ باجەکەی بداتەوە، چونکە کێخوا ئەو پیاوەنیە جەنەڕاڵ سووکایەتی پێبکات، پێی بڵێ: هەرگیز خۆمان نادەینە دەست پیاوی دووڕوو وترسنۆکی وەکو یەڵماز، ئەگەر تۆزقاڵێك غیرەتی هەبوایە سووکایەتی بەکێخوای گورجی زادان نەدەکرد، وەقەت هانای وەبەر پیاوی وەك تۆی نەفس

نزم و بەدڕەوشت نەدەبرد، هەتا زووە برۆ بەرچاوم چۆڵکە. هەیاسە شەل لەقاقای پێکەنینی دا گوتی:

- هێشتا زەبروزەنگی منت نەدیوە ئەگەر نەمرم هەر ئەمڕۆو سبەی دەتکەمەکەیبانووی خۆم لە ئەشکەوتی دێوان.

: پاشان سەری ئەسپەکانیان وەرچەرخاند بەڕێکەوتن گەڕانەوە.

: غوربەت، شێت وهاربوو ئاگر لەچاوی دەباری.

لە دڵی خۆیدا گوتی شەڕ دەرگای لێ گرتووین، واچاکە هەتاکارلەکارنەترازاوە ئەو گەمبۆرە سەگ تۆپ بکەم.

: هەیاسەشەل کەوتبووە لاتەریکی هەردووکیان، سێرەی لێگرت، پەنجەی لەپەلەپیتکەی تفەنگ بزافت لەهاڕژنی دا، پێکای لەپشتەسەری دابوولەسەرزین وەگەڕا پێی لەڕکێفی زین گیربوو، کەوتە بن زگی ئەسپ، ئەسپی تاین تۆقی تێی تەقاند بەنشێودا شۆڕبۆوە بردی. سوارەکەی دیکە بەدوای هەیاسەشەل دا تەقلەکووت بۆی دەرچوو، بەلام کێخوا ئەگەرچی هەردوو دەستی شەتەك درابوو کەچی بەلێهاتوویی خۆی و شارەزایی لەزمانی ئەسپ، سەری ئەسپی وەچەرخاند بۆ لای غوربەت گەڕاوە چوونەوە ئەشکەوت. کێخوا دەستخۆشی لەغوربەتکرد دواترگوتی:

- کچم غوربەت، من ترسم هەیە ئەو نامەردە وەکو گورگی هار بکەوێتە ناو هۆبەی ڕەشمالان. دەزانم ئەو بێناموسە دەست ناپارێزێ بێجگە لەکوشت وبڕوتالان. دەستدرێژی دەکاتە سەرناموسی ئافرەتەکان. بۆیە دەبێ بەزووترین کات بگەمەوە هۆبەی ڕەشمالان. هەتازووە بنەوبارگەمان بپێچینەوە بڕۆین لەچیا خۆمان قایم کەین. ئەگینا حەزم نەدەکرد لەم تەنگانەیەدا جێتان بهێڵم،

- باوكە، ئێمە شەرمەزاری تۆین، بەلأم شەرت بێ لەشەرتی مێرانی بەرمەیدان، ئەگەر تەنها یەك ڕۆژلەژیانم دامابێ، ئەو ڕۆژە بۆ ئەم نامەردە تەرخان دەكەم. لەپای ئەو سووكایەتییەی بەتۆی كرد، دەبێ ئەم دڕكەی لەبن پێی دەربێنم. ئێستاش برۆ ئۆغرت خێربێ برۆ دەست پێشخەری بكە نەبادا ئەم مەنگۆزە لەهەنبەر خوێنی هەیاسەشەل ببێتە گورگی دەم بەخوێن. برۆ خەمی ئێمەت نەبی هەرگیز دەست نادەین ئیدی بزانین چارەنووس بەچی دەگات.؟!

- كچم غوربەت، كورد لەتەنگانەدا تەلانی لانە، واتا ئەگەر دووچاری تەنگژەبوون.؟! خۆ دەربازكردن جۆرێكە لەئازایەتی بۆ ئەم حاڵەتە لەخۆرهەلأتی ئەم ڕەوەزە شاخەی پشتی ئەشكەوتی دێوان بزنە ڕێیەك هەیە بۆ دەربازبوون ئەگەرچی زۆر سەخت ودژوارە هەركەسێك پێی هەڵزەلێ كاری تەواوە دەبێتە خۆراكی دەعباو دالأش، بەلأم خۆشترە لەوەی بكەویتە چنگی پیاوی نامەرد.

دواتر نێوچەوانی غوربەتی ماچ كرد غوربەتیش دەستی ڕامووسی ئیدی بەپیادە ڕۆ،چاوی داشاخی هەزاربە هەزار و بزنە ڕێ و ڕۆیی.

# (٥٦)

شەوێك لە شەوان شەو ڕاكشابوو، غوربەت لەتەنیشت پوورە سێوە خەوتبوو لەئەشكەوت. لەنەستی دا گێنگلی بەخۆی دەدا، لەوخەوەیدا مرخێش مرخێشی بوو، دواتر ڕاچڵەكی لەجێوە نیوەڕاست بۆوەهەموو گیانی شەلاڵی ئارەقە بوو، پوورەسێوە بەئاگابوو، هەستاوە چوو جامێك ئاوی هێنا (هاكچم ئاو بخۆوە). قومێكی لێخواردەوەو هەندێكی بەدەموچاوی داكرد. پاشان گوتی:

- پوورێ خەونێكی ناخۆشم دیت، لەخەونم دابوو كەوتبوومە ناو گێژاوی لافاوێكی شێلو، لەم خەونەمدا بانگی نازێ وپەیمانم دەكرد، بەلاّم بەدەنگمەوە نەهاتن. لەگەڵ دەنگە دەنگ ومرخێش مرخێشی خۆم بەئاگاهاتم.

- هیچ نیە كچم تۆ ماندووی بنوو باگیانت ئاسوودەبێ.

غوربەت بەدڵ دانەوەی پوورەسێوە دڵخۆش نەبوو، بۆیە حەفتەیەك پێش ڕووبەڕوو بونەوە، پوورەسێوەو حەیدەركۆی كوڕەزای ودوو جەنگاوەری نەساخیان بەقاچاخە ڕێدا بەڕێیانكردبوون، بۆ هۆبە ڕەشماڵی كۆچەرییان سێ ڕۆژیش بوو شەڕو پێكدادان گەرم بوو، گیژگەلی ئەشكەوتی دێوان دوو شەهیدیان دابوو، درەنگی شەو لەدەروازەی ئەشكەوتی دێوان شەهیدەكانیان بەخاك سپاردبوو، خەجۆ بریندرابوو بەلاّم برینەكەی سووك بووسێ، چوار جەنگاوەری دیكەیان بێ سەروشوێن بزر بوون، غوربەت، بەشەهید بوونی نازێ وپەیمان زۆر خەمباربوو، دوو ڕۆژ بوو تفەركی زادی نەكردبوو، لەلایەكی دیكەوە لەشكری جەنەڕاڵ یەڵماز، هەنگاوبەهەنگاو لەدەروازەی ئەشكەوتی دێوان نزیك دەبوونەوەو بەرەبەرە مەیدانی شەڕ بەرتەسك دەبۆوە، ئەسپەكان میخ زنجیریان هەڵكێشابوو هەوساریان پساندبوو. تێیانتەقاندبوو تارا بوون.

: سەرلە هێوارێ هەورەكی تاریك بەری لە ئاسمان گرتبوو. كەشەوداهات، شەوێكی ئەنگوستەچاو بوو، شەوی دزان بوو. غوربەت،دەهاتوو دەچوو لەحەژمەتان ژانی هاتبووێ نەدەحەحجما، دواجار ئۆقرەی نەگرت چوو لەگەڵ هاوڕێكانی كۆبۆوە، پێی ڕاگەیاندن گوتی:

- پێشینان گوتوویانە (شەڕ بەشیر، مامەڵەت بەدراو). ڕاستە. واتا ئێمە فیشەكمان نەماوە چیتر ناتوانین بەرگری لەخۆمان بكەین، تەنها سێ ڕێگامان لەپێشداماوە.

یەكەم: شەڕكردن هەتا دوافیشەكی ناو خانەی تفەنگ پاشان خۆكوشتن.

دووەم: خۆبەدەستەوەدان. واتا سەر شۆڕكردن وئابرووچون، سووكایەتی كردن بەئافرەتان، بێگومان دەكەوینە بەر تفوو نەفرەت لێكردن.

سێیەم: خۆ ڕزگاركردن. مام كێخوا ئامۆژگاری كردم، گوتی (خۆ ڕزگاركردن لەكاتی تەنگانەدا مانای ئازایەتی یە، نەك ترسنۆكی)من،!! ڕێگای سێیەم هەڵدەبژێرم بەم بزنە ڕێیەی مام كێخوا بۆمانی دەست نیشان كرد خۆمان دەرباز دەكەین. واتا هەرگیز خۆمان بەدەستەوە نادەین بۆیە واچاكە هەر ئێستا هەتاكو كار لەكار نەترازاوە بەخۆبكەوین و بكەوینە ڕێ. خۆمان دەرباز بكەین، پاشان ڕوو بدەینە كوێستانەكان، دوو، دوو هانا وەبەر هەوارگەو هۆبەو ڕەشماڵی كۆچەرییان ببەین دڵنیام داڵدەمان دەدەن. بەڵام هەروەكو دەڵێن ( دەم دەخوات چاو شەرمێ دەكات). دەبێ ئێمەش هاوكاریان بكەین لە مەڕ دۆشین ومەشكە هەژاندن وئاوهێنان ونانكردن وتەشی ڕێستن یارمەتیان بدەین، بزانین چارەنووسمان بەچی دەگات.؟!

: ئیدی دوو، دوو، سێ، سێ بەچاوی پڕ لەفرمێسك ڕێچكۆڵەی بزنە ڕێیان گرتە بەر ملیان بەتاریكیەوەنا، بەرەو چارەنوسی نادیار پەرتەیان لێكرد ڕۆیشتن.

بەلاّم هەرچی غوربەت بوو، پێشتر چڵەنەمامێکی دار بەرووی ئامادەکردبوو، هەر بەم شەوە چوولەلای سەرینگانی گۆڕی نازێ وپەیمان، قۆرتێکی هەڵقەناند چڵەنەمامەکەی تێداچاند، وێجا لەحزور گڵکۆی هەردووکیان چۆکی دا وداچەماوە نیوچەوانی گەیاندە عاردی هێند گریا و فرمێسکی بۆیان هەڵڕشت چاوی ببووە گۆمی خوێن،خوێنی تێزابوو. پاشان هەستاوە سەرپێیان تاوێ بەپێوە دەستەو نەزەر بەدیاریانەوە ڕاوەستا هەناسەی ساردی هەڵدەکێشا، پشتی هەنگێ بەنێو لەپی دەستی فرمێسکی سەر ڕوومەت و دەموچاوی سڕییەوە، دواتر تفەنگی کردە شانی وبەبزنە ڕێدا شۆڕ بۆوە ڕۆیی.

: تاریکو ڕوونی بەیانی لەشکری جەنەڕاڵ یەلّماز هێرشێکی بەربلاّویان هێنا بۆ سەر ئەشکەوتی دێوان، زۆر بەخەستی تەقەیان دەکرد، هەتا گەیینە دەروازەی ئەشکەوت هیچ وەلاّمدانەوەو بەرگری لەئارادا نەبوو، بەدوا دەستڕێژ ژووری ئەشکەوتیان ڕشاند. ئەوجا سەریان بەژووری ئەشکەوت داگرت، جگە لەهەندێك بزگوڕوقاپ وهیربار، هەوارێکی چۆڵ و هیچی تر.

جەنەڕاڵ لەخەفەتان ئەژنۆی شل بوو،لەسەرچنچکان هەڵقوونجا تووند نیوچەوانی خۆی گرتبوو چیلکەی لەعاردی وەدەدا لەدڵی خۆیدا دەیگوت:

(لەدەستم چوو هێلانەشم لێیان تێکداو بەخۆشم ڕەنج خەسار، بریا قەت ناوبانگی ئەو غوربەتەم نەبیستبایە، کەبیستم خۆزگە یەکجار دیتبام بەڵکو شەوان بەخەیاڵی (ئەو) دەخەوتم و دەهاتە خەونم).

پاشان هەستاوە سەرپێ تاوێ چاوی بەدۆڵ وبنارو شاخی هەزاربەهەزاری دەڤەری ئەشکەوتی دێواندا گێڕا،دواتر بەدەست بەتاری فەرمانی گەڕانەوەی دا بەلەشکر و لەتەشکی خۆیاندا هێرتە هێرت گەڕانەوە.

# بەشی کۆتایی

شەش مانگ بەسەر پەرتەوازە بوونی کیژگەلی ئەشکەوتی دێواندا تێپەری بوو. ڕۆژێکیان دەمەدەمی کاتژمێرە (١٠)ی سەرلەبەیانی (جارچی) بەنەڕەنەڕو هاتووهاوار، بەکوچەو کۆلانی شاردا دەگەڕا دنیای لەزەواق نابوو دەینەڕاند!!

(دەستێکی ڕەشی چەپەڵی چڵکن بەجل وبەرگی سواڵکەری لەدەروازەی کۆڵان خۆی لەجەنەڕاڵ یەڵماز نزیك کردووتەوە، لەکاتێکدا جەنەڕاڵ خەریك بووە دەستی یارمەتی بۆ درێژبکات. کەچی(ئەو) ناپاکە لەهیکرا دایتیە بەردەستڕێژی گوللەو سێ گوللەی لەسەر دڵی داوە دەستبەجێ ساردی کردووتەوە گیانی سپاردووە، ئێستاش بەفەرمانی پارێزگاری شار هەرچی سواڵکەری ناوشارودەوروبەر هەن، بەژن وپیاوانییانەوە دەبێ دەستگیربکرێن. بۆیە داوا لەهاونیشتمانییانی شەرەفمەندی شارەکەمان دەکەین لەهەرشوێنێك سواڵکەرێك، دەرۆزەکەرێکتان دیت پەیوەندی بکەن بەبنکەی پۆلیسی ناوشارو پاداشت وەربگرن) بەڵێ ئەرباب ڕۆژگاردێت و دەڕوا لێقەومان و سەربردە و بەسەرهاتووکارەسات کۆن دەبن، بەلام هەرگیز لەیادناکرێن.

لەقونجە چایەخانەو لەدیوەخان و لەهۆبە ڕەشماڵی کۆچەریان و لەشەوانی زستان و لەدەوری بەردەسێرە لەسەر زمان و زاری ڕیش سپیان و هەقایەتخوان دەیگێڕنەوە دەڵێن:-

هەبوو نەبوو کچێکی جحێڵ بوو، ناوی غوربەت بوو، لەگەڵ کۆمەڵێك دەستە خوشك و شۆخەژنان لەدژی ڕەفتاری پیاوسالاری هەڵگەڕابوونەوە لەئەشکەوتی دێوان گیرسابوونەوە. بەچاوقایمی و بەزەبروزەنگی دەست و بازووی خۆیان

دەســەڵاتیان بەسەرناوچــەکەدا گرتبــوو، لەچــەندین شــەڕو ڕووبوڕووبونــەوەو پێکداداندا سەرکەوتنیان بەدەست هێنابوو، بـەڵام بـەتێوەگلانی لەشکری دەوڵەت بــۆ بەرەنگاربوونــەوەو لــەناوبردنی هەڵگــەڕاوان لەئەشــکەوتی دێــوان دوای کۆنترۆڵکردنی ڕێگاو بانەکان و شەڕو پێکدادان، وە لـە ئـەنجامی کـەمی فیـشەك و تەقەمــەنی و شــەهید کردنــی کۆمــەلێك جــەنگاوەری دلێروبــەتوانا، لــەڕیزی جەنگاوەرانی کیژگەلی ئەشکەوتی دێوان. هـەروەها بێـسەرو شـوون و بزربـوونی هەندێکی دیکەیان. لەشەوێکی نۆتەك ئەنگوستەچاودا دوای ڕاوتـەگبیر پەرتـەیان لێکرد لە چێشتەنگاوی سبەینەی ئاینده لەشکری هێرشبەر هاتنـە سـەر هـەواری خاڵی، دواتر لەتەشکی خۆیاندا هێرتە هێـرت گەڕانـەوە، بـەڵام دوای شـەش مـانگ غوربــەتخان، کــچە ســەرکردەی کیژگــەلی ئەشــکەوتی دێــوان. لــە جــل وبــەرگی سـوالکەرێکی پیـاودا خـۆی حەشـار دابـوو، سـبەینەك لەسـبەینان کـاتێ جەنـەڕاڵ یەڵماز، فەرماندەی لەشکری هێرشبەر بۆ سەر ئەشکەوتی دێوان. بەسواری ئەسـپ بـۆ بنکـەی مەشـق وڕاهێنـانی سـەربازی دەچـوو، غوربـەت، لـەهیکرا دەیداتـە بـەر ڕێژنــەی گوللـەو لەگـەڵ یەکـەم گوللـە دەڵـێ : ئەمــەیان لـەپای ئـەو سـووکایەتی پێکردنەی کە بەکێخوای گورجی زادانـت کـرد. ئەوەشـیان بـۆ نـازێ ئەوەشـیان بـۆ پەیمان، لەسەر زیـن وپـشتی ئەسـپ وەریـدەگێڕێ بەردەبێتـەوە سـەر زەوی گیـانی دەســپێرێ. ئیــدی بەپێچاوپێــچی کۆڵانەکانــدا. هــەر بــەڕێگاوە جــل و بەرگــە ســوالکەریەکەی فــڕێ دەدات، هــیچ خــۆی لــە گــورە نابــات، بەقاچــاخەڕێدا شـار بەجێدەهێڵێت و دەڕوا..!!!!!!!!!!!!!!!